# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی



جزمی: ٢٤ ، ٢٥ ، ٢٦ ، ٢٧

بەرگی یازدەهەم

# تەفسیری زمناکۆیی

بەقەڵەمی

مەلا سعیدی زمناکۆیی

جزمی ﴿٢٤،٢٥،٢٦،٢٧﴾

بەرگی یازدەهەم

ناوی کتێب : تەفسیری زمناکۆیی .
ناوی نووسەر :مەلا سعیدی زمناکۆیی .
جزمی بیست و چوارەم و بیست و پێنچەم و بیست و شەشەم و بیست و حەوتەم .
بەرگی یازدەهەم.
چاپی یەکەم .
چاپی کۆمپیوتەر و ڕاکێشانی : ﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی بابان ﴾
ژمارەی سپاردنی (٤٠٩) ی ساڵی ( ٢٠٠٠ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپێردراوە .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردەکەری هەموو بونەوەران درودی خوا لەسەر پێغەمەر و هاورێ و خێزان و پەیڕەوانی بێ.

فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ
إِذْ جَآءَهُۥٓ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى
جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾
لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾
لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم
بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ
عَبْدَهُۥ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ وَمَن يُضْلِلِ
ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ
أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾

﴿فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى اللهِ وَكَذَّبَ بِالصِّدْقِ إِذْ جَاءَهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ﴾ دوایی چ کەسێکە ستەم کارتر لە کەسێ درۆ و بوختان بدا بەسەر خوادا و، بڵێ: خوا هاوبەش و خێزان و مناڵی هەیە و، ئەو قورئانە ڕاستە بە درۆبخاتەوە کاتێ چوە بۆلایان و، بەبێ بیرکردنەوە بڵێ: ئایا لەناو دۆزەخدا جێگەیە نیە بۆ ئەو بێباوەڕانە درۆ ئەخەنە پاڵ خوا و ڕاستی قورئان بەدرۆ ئەخەنەوە؟

﴿ وَالَّذِي جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴾ وە کەسێکی ئەوتۆ بەڕاستی قورئانەوە هاتوە بۆلای ئادەمیزاد کە موحەممەدە و، وە باوەڕی بێگومانی بەقورئان هێناوە و کەسانی تریش ئەو کەسانە هەرئەو کەسانەن لە خوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لەبێفەرمانی.

﴿ لَهُم مَّا يَشَاءونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ جَزَاء الْمُحْسِنِينَ ﴾ بۆ ئەو لەخواترسانە هەیە شتێ ئارەزۆی بکەن لەلای پەروەردگاری خۆیان لەبەهەشتا، ئەو رێزگرتنەپاداشتی ئەو کەسانەیە بەزمان و بەکردار چاکە ئەکەن.

﴿ لِيُكَفِّرَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي عَمِلُوا ﴾ بۆیان هەیە ئەوەی ئارەزۆی بکەن؛ لەبەر ئەوە خوا لەناو ئەبا و دائەپۆشێ خراپترین شتێکی ئەوتۆ کردویانە لە جیهاندا و، دوایی پەشیمانبوونەتەوە و گەڕاونەتەوە بۆلای خوا و بوون بە پیاوچاك.

﴿ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وە خوا پاداشتیان ئەداتەوە بە پاداشتێکی گەورە بۆ ئەوان لە رۆژی دواییدا بە چاکترین پاداشتی شتێکی ئەوتۆ کردویانە لە جیهاندا.

﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُ ﴾ ئایا خوا بەس نی‌یە بۆ بەندەی خۆی کە موحەممەدە بیپارێزێ و یاریدەی بدا سەری بخا، بە جۆرەی بەڵێنی پێداوە. بێگومان هەر خوا بەسە بۆ ئەو بەندەی خۆیە کە موحەممەدە بیپارێزێ و یاریدەی بدا کاتێ پێغەمەری خوا ناوی بتەکانی بەبێ نرخ ئەبرد و بەبێ سود تەماشای ئەکردن، قورەیشی‌یەکان وتیان: ئەگەر تۆ واز لەو کارانەی خۆت نەهێنی، ئەو بتانە دەستت لێ ئەوەشێنن و، شێتت ئەکەن، خوای مەزن لە وەڵامیاندا فەرمووی:

﴿ وَيُخَوِّفُونَكَ بِالَّذِينَ مِن دُونِهِ ﴾ وە بت پەرستان تۆ بەو شتانەی ئەوتۆ ئەترسێنن لە جگەی خوای گەورەن کە ئەوان ئەیانپەرستن وا ئەزانن ئەتوانن زیان توشی پێغەمەر بکەن.

﴿ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ وَمَن يَهْدِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن مُّضِلٍّ ﴾ وە هەرکەسێ خوا وەری گێرێ لە رێگەی راست، دوایی بۆ ئەو کەسە نابێ هیچ کەسێ شارەزای رێگە راستی بکا و، هەرکەسێ خوا یارمەتی بدا و رێگەی پیشاندابێ، دوایی هیچ کەسێ توانای ئەوەی نی‌یە لە رێگەی راست لای بدا.

﴿ أَلَيْسَ اللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِي انتِقَامٍ ﴾ ئایا خوا دەسەڵاتی زۆر گەورەی نیە بە سەختی سزای بێباوەران بدا و، خاوەنی تۆڵە سەندن نی‌یە لە بت پەرستان. بێگومان خوا خاوەنی توانایە، تۆڵەیان لێ ئەسێنێ.

وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ قُلْ أَفَرَأَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَاشِفَاتُ ضُرِّهِ

أَوۡ أَرَادَنِي بِرَحۡمَةٍ هَلۡ هُنَّ مُمۡسِكَٰتُ رَحۡمَتِهِۦۚ قُلۡ حَسۡبِيَ
ٱللَّهُۖ عَلَيۡهِ يَتَوَكَّلُ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ
عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَٰمِلٞۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٣٩﴾
مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيۡهِ عَذَابٞ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾
إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ
فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم
بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي
لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ
وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ
لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَۚ
قُلۡ أَوَلَوۡ كَانُواْ لَا يَمۡلِكُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٤٣﴾
قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ثُمَّ
إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ
قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن
دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿٤٥﴾

﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴾ وە ئەگەر تۆ پرسیار بکەی لە بت پەرستان چ کەسێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە، بەڕاستی لە وەڵامدا ئەڵێن: خوا دروستی کردوون.

﴿ قُلْ أَفَرَأَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ إِنْ أَرَادَنِيَ اللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَاشِفَاتُ ضُرِّهِ ﴾ تۆ بڵێ: ئایا ئەوەی ئێوە زانیتان خوا دروست کەری هەمو بونەوەرانە، ئەگەر خوا بیەوێ من تۆشی ئازارێکی سەخت بکا، ئایا ئەو بتانەی ئێوە ئەیان پەرستن لە جگەی خوا ئەتوانن ئەو ئازارە توشی من بوە لای ببەن؟

﴿ أَوْ أَرَادَنِي بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَاتُ رَحْمَتِهِ ﴾ ئایا ئەگەر خوا ویستی چاکەیە ببەخشێ بەمن ئایا ئەو بتانە ئەتوانن رێگەبگرن لەو چاکەیە و نەیەڵن خوا بیبەخشێ بەمن؟ یا ئەو بتانە ئەتوانن کاتێ ئادەمیزادێ ویستێ ئازارێ بدا لەوان و، یا بیانشکێنێ یا پێیان پێدا بنێ ئەوتوانن خۆیان رزگار بکەن . بێگومان ئەوانەی باسکران لە توانای ئەو بتانەدا نین، ئیتر ئێوە چۆنیان ئەپەرستن؟

﴿ قُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ الْمُتَوَكِّلُونَ ﴾ تۆ بڵێ: خوا بەسە بۆ من و، هەربەتەنها من ئەو ئەپەرستم، ئەمپارێزێ لەهەمو خراپەیە، هەر لەسەر خوا پشت ئەبەستن ئەو کەسانەی بە باوەڕەوە پشتی پێ ئەبەستن و، کاری خۆیان بەجگەی خوا ناسپێرن و منیش یەکێکم لەو کەسانە، بە ئومێدی کەسی ترنیم جگەی خوا.

﴿ قُلْ يَا قَوْمِ اعْمَلُوا عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّي عَامِلٌ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾ تۆ بڵێ: ئەی تاقمی من و ئەی بت پەرستانی مەکە: ئێوە بەردەوامبن بە گوێرەی توانای خۆتان لەسەر هەمو هێز و جۆرەها پیلانی خۆتان و، بەڕاستی من ئەوەی خوا فەرمانم پێبدا ئەیکەم، دوایی ئێوە ئەزانن:

﴿ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾ چ کەسێ دێت بۆلای سزایە ڕسوایی بکا و، چ کەسێ دێتە خوار بۆ سەری سزایەکی بەردەوام و، ناگۆڕرێ و ڕزگاری نابێ. بێگومان ئێوەی بت پەرست لەناو دۆزەخدان، من و باوەڕداران لەناو بەهەشتان. ئەو کاتە بەدبەختی خۆتانتان بۆ دەرئەکەوێ.

﴿ إِنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ لِلنَّاسِ بِالْحَقِّ فَمَنِ اهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴾ بەڕاستی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ بۆ سودی هەمو ئادەمیزاد بە جۆرێکی ڕاستی و، بۆ ئەوەی ئێو شارەزای پەرستن و هەمو شتێ پێویستیتان پێی هەبێ بیکەن و، سود لەهەموو شتێ وەربگرن.

دوایی هەرکەسێ ڕانموی وەرگرتبێ، سودەکەی هەر بۆ خۆیەتی و، هەرکەسێ لە ڕێگەی ڕاست لایدابێ، دوای بەڕاستی ئەو لە ڕێگە لادانە زیان و ئازارەکەی لەسەر خۆیەتی، نەك لەسەر جگەی خۆی و، تۆ پاسەوان نیت بەسەر ئەوانەوە، چاودێریکەری ئەوان نیت و، هەرکەسێ بەرپرسیارە لەسەر کردەوەی خۆی، تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرە.

﴿ اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە گیانی گیانداران وەرئەگرێتەوە بۆلای خۆی و، ئەیان مرێنێ دوای تەواوبوونی تەمەنی دیاریکراو بۆیان، بەجۆرێ ئەو گیانە ناچێتەوە لە لەشیان لە جیهاندا جارێ تر.

پوختەی مانای ئەو ڕستەیە بەم جۆرەیە: بێئایینەکان ئەڵێن: ئادەمیزاد هەر ئەو لەشەیە، دوای لە ناوچونی ئەو لەشە شتێ تر لە دوایەوە نیيە وزیندو نابێتەوە، باوەڕداران ئەڵێن: ئادەمیزاد بریتیە لە گیان ولەش، گیان ئەو لەشە ئەبا بەڕێوە بەهۆی دەستوری خواڵ، مردن بریتیيە لە بچڕانی پەیوەندی نێوان گیان و لەش، دوای فەرمانی لەش ئەو گیانە ئەچێتە دەرەوە بۆ خزمەت دروستکەرەکەی کە خوایە.

بۆ ئاگاداری: هەموو ئادەمیزادێ خوای گەورە دوو جۆرە گیانی بۆ ساختە هێناوە. یەکەمیان ئەو گیانەیە کە گیانداران بە هۆی گیانەوە ئەژین لە جیهاندا، کاتێ ئەو گیانە جوێ بویەوە لە لەشی ئەو گیاندارە، جارێ تر ئەو گیانە ناگەڕێتەوە بۆلای ئەو لەشە لە جیهاندا، کاتێ ئەو گیانە جوێ بویەوە لە لەشی ئەو گیاندارە، جارێ تر ئەو گیانە ناگەڕێتەوە بۆلای ئەو لەشە لە جیهاندا. دوهەمیان گیانێکە لە کاتی خەوتندا لە لەشی ئادەمیزاد جوێ دەبێتەوە و، وەك مردوی لێدێ و، دوای بێداربوونەوە، ئەچێتەوە بۆلای ئەو لەشە. بۆ ڕونکردنەوەی ئەو باسە باشتر خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا ﴾ وە خوا وەرەئەگرێ گیانی کەسێکی ئەوتۆ لە کاتی خەوتنیدا کە هێشتا نەمردوە بەڕاستی و، وەك مردووی لێدێ وبێئاگایە لە هەمو شتێ، دوای بێداری ئەو جۆرە گیانە ئەچێتەوە بۆلای ئەو لەشە.

﴿ فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ﴾ دوایی ئەو کەسەی ئەوتۆ خوا فەرمانی مردنی ڕاستەقینەی داوە بەسەریا، خوا گیانەکەی بەیەکجاری خوا ئەیهێڵێتەوە و ناچێتەوە بۆلای لەشەکەی لە جیهاندا و، ئەو گیانەکەی تری لە کاتی خەودا وەری گرتبو خوا ئەینێرێتەوە بۆلای لەشەکەی هەتا کاتێ خوای مەزن دیاری‌کردوە بۆ مردنی ئەو کەسە و تەمەنی کۆتایی بێدێ.

﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ بەڕاستی هەیە لەناو وەرگرتنی گیانی ئادەمیزاد بەو دوو جۆرەی پێشوو باسکران چەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر توانای خوادا بۆ تاقمێ بیر لە توانای خوا بکەنەوە.

﴿ أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ شُفَعَاء قُلْ أَوَلَوْ كَانُوا لَا يَمْلِكُونَ شَيْئًا وَلَا يَعْقِلُونَ ﴾ ئایا ئەو قورەیشیانە بە چ جۆرێ دایان ناوە بۆخۆیان لە جگەی خوا چەندین بت بۆیان بپاڕێنەوە لای خوا. تۆ بڵێ: بەوان ئایا ئەو بتانە خاوەنی هیچ نەبن و خاوەنی ئەقڵیش نەبن و، سودیان نە بۆخۆیان و نە بۆ جگەی خۆیان نەبێ و چاك و خراپ جوێ نەکەنەوە ئەوان هەر ئەیانپەرستن؟

﴿ قُل لِّلَّهِ الشَّفَاعَةُ جَمِيعًا لَّهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ تۆ بڵێ: هەر بۆ خوایە پاڕانەوە بە هەموو جۆرێ. هیچ کەسێ خاوەنی پاڕانەوە نیيە مەگەر کاتێ خوا فەرمانی پێ بدا، بۆ خوایە خاوەنیيەتی ئاسمانەکان و زەوی و، ئەو خاوەنی هەموو بونەوەرانە، لە پاشا ئێوە هەر بۆلای خوا ئەگێڕێتەوە لە پاشەڕۆژدا بۆ وەرگرتنی پاداشت و تۆڵە.

## تەفسیری زمناکۆیی

﴿ وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ ﴾ وە هەرکاتێ باسی خوا بەتەنها بکرایە بەبێ باسی بتەکان دڵی ئەو کەسانەی ئەوتۆ باوەڕیان بەڕۆژی دووا نیە تەنگ ئەبو ئاڵۆز ئەبو لەبەر ئەوەی ناوی بتەکانیان نەبراوە و، ڕوویان وەرئەگەڕان.

﴿ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ وە هەرکاتی باسی ئەو کەسانەی ئەوتۆ لە جگەی خوا بکرایە بە وێنەی (لات و کوتوپڕ ئەو بت پەرستانە دڵیان پڕ ئەبو لە خۆشی و، ڕویان گەش ئەوبووەوە.

قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ عَٰلِمَ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ
فِى مَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا۟
مَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلْعَذَابِ
يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾
وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ
يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٤٨﴾ فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَٰهُ
نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ۚ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ أَغْنَىٰ
عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟ ۚ
وَٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مِنْ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُوا۟
وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ
لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾

﴿ قُلِ اللَّهُمَّ فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ أَنتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ تۆ بلێ: ئەی خوای مــن ئـەی دروستکەری ئاسمانـەکان و زەوی، ئـەی کەسێ بە شتێ ئەزانی و پەنهانە و لـەبەر چاودا نیە، بە شتێ ئەزانی ئاشکرایە و لـەبەر چاوە، هەر تۆی فەرمان ئەدەی لـە نێوان بەندەکانی خۆتا لـە ڕۆژی دواییـدا، لـەو شـتەی ئـەوان ئـاژاوە و ناکۆکیان هەیە لـەناویا. لـەبارەی فەرمانەکانی خوا و زیندووبونەوە، ئەو کاتە هەموو شتێکیان بۆ ڕون ئەکەیتەوە کامیان ڕاستن و کام لایان خراپن.

﴿ وَلَوْ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا مَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُ مَعَهُ لَافْتَدَوْا بِهِ مِن سُوءِ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ وە بەڕاستی ئەگەر هەمو شتێ لـە زەویدا سامان و دراویی ئەو کەسە بێـت وێنـەی ئەوی لـەگەڵیا بێ و ببی بە دوو ئەوەندە تر بۆ کەسانێکی ئـەوتۆ ستەمیان لـە خۆیـان کـردوە، بڕوایان بەبوونی ڕۆژیدوایی نەبوە، بەڕاستی ئەو کەسانە ئەو هەموە شـتانە هەیانـە ئەیکـەن بـە فیدای خۆیان لـەبەر ئەوەی ڕزگاریان ببێ لـە سزای سەخت لـە ڕۆژی دواییدا. بەڵام لـەو ڕۆژەدا هەر باوەڕ بەخوایە بکرێ بەهۆی ڕزگاربونیان.

﴿ وَبَدَا لَهُم مِّنَ اللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا يَحْتَسِبُونَ ﴾ وە بۆ ئەو ستەمکارانە لـە لایـەن خـواوە لـەو ڕۆژەدا و شتێ ئەوان گومانیان نەئەبرد بۆ بوونی و، بە دڵیانا نەئەهات ئەو جـۆرە سـزا سـەختە ئەبینن بۆیان دەرئەکەوێ.

﴿ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾ وە بۆ ئـەو کەسـانە ڕوون ئەبێتەوە لـەو ڕۆژەدا خراپە شتێ کردوویانە لـە جیـهاندا و، ئـەم لاولای ئـەوان ئـەگرێ سـزای سەختی شتێ ئەوان گاڵتەیان بەبونی ئەو شـتە ئـەکرد لـە جیـهاندا و، بانگیـان ئـەکرا بـاوەڕی پێبهێنن. بەڵام ئەوان ڕوویان لێوەرئەگێڕا.

﴿ فَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَاهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ ﴾ دوایی کاتێ توشی ئادەمیزاد ببوایە ئازارێ، لـە ئێمە ئەپاڕانەوە ئەو ئازارە لـەسەریان لابەین. لـە پاشا کاتێ ئەو ئازارەمان لابرد، بەومان بەخشی چاکەی زۆر لـە لایەن ئێمـەوە و، چاکـەی پێشـوویان لـە بـیر ئەچێتەوە و، ئەڵێ: بەڕاستی ئەو چاکەیە بە زیرەکی لـەسەر زانیاری خۆم پێم بەخشراوە و، مـن شایستەی ئەو چاکەیەم و ڕێزداری ناو گەلـەکەی خۆمم.

﴿ بَلْ هِيَ فِتْنَةٌ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ بەڵکو ئەو چاکەیە تاقیکردنەوە بۆ ئەوان، هەتا بۆ دانیشتووان دەربکەوێ ئایا ئـەوان سوپاسـی خـوا ئەکـەن و، واز لـە خراپـە ئـەهێنن و، بـەڵام زۆرترینی ئەو بێباوەڕانە نازانن ئەو چاکەیە تاقیکردنەوە بـۆ ئـەوان و، ئـەبێ بـەهۆی ڕسـوایی هەردوو جیهانیان.

﴿ قَدْ قَالَهَا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَا أَغْنَى عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ بەڕاسـتی ئـەو گفتوگۆیـەی ئەوان ئەیڵێن: کەسانێکی ئەوتۆ لـەپێش بتپەرستانی مەکە بون ئەوەی ئەمان ئەیان ووت، ئەوانیش ووتیان، دوایی ئەو شتەی ئەوان کردبویان سودی بەوان نەبەخشی.

﴿ فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا ﴾ دوایی توشی ئەو کەسانەی پێشووبو پاداشتی ئەو خراپانە کردبویان لە جیهاندا، سامان و پلەو پایە و ڕێزیان ئەو سزایانەی لەسەر لانەبردن.

﴿ وَالَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ هَؤُلَاءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ ستەمیان لەخۆیان کردوە لەو بت پەرستانەی مەکە و، بڕوایان بەڕۆژی دوایی نەبوە، لەمەو دوا توشی ئەوان ئەبێ پاداشی ئەو خراپانەی لە جیهاندا کردویانە و، ئەوان ناتوانن خۆیان لەو سزایە ڕزگار بکەن و، ڕێگەی لێ بگرن.

﴿ أَوَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ ئایا بێباوەڕان نەیان زانیوە کە بەڕاستی خوای مەزن و ڕۆزی و چاکەی خۆی زۆر ئەکا بۆ کەسێ ئارەزوی بکا و، ڕۆزی بەکەمی ئەبەخشێ بەکەسێ ئارەزوی بکا. بەڕاستی لەوانەی باسکران چەندین بەڵگەی ئاشکرا هەیە لەسەر توانا و میهرەبانی خوا بۆ تاقمێ باوەڕیان هێناوە بە خوا و بەتوانای خوا و، دڵیان بۆ باوەڕ کراوەتەوە.

قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَٰحَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِى جَنۢبِ ٱللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ ٱلسَّٰخِرِينَ ﴿٥٦﴾ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾

دانیشتوانی مەکە ئەیان ووت: موحەمەد ئەڵێ: هەرکەسێ جگەی خوا بپەرستێ، خـوا لێـی خۆشنابێ، ئێمە چۆن کۆچ بکەین و موسڵمان ببین و، بتیشـمان پەرسـتوە و پیاومـان کوشـتوە. خوای مەزن فەرموی:

﴿ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّـهِ ﴾ تـۆ بڵـێ: ئـەی ئـەو بەندانەی ئەوتۆی من، تاوانی زۆرتان داوە بەسەر خۆتانا و لەسنوور دەرچوون، ئێوە لەبەزەیی و میهرەبانی خوا بێئومێد مەبن.

﴿ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ بەڕاستی خـوا خـۆش ئـەبێ لەهـەمو گوناهێ ئێوە کردوتانە بەرلەوەی موسڵمان بوون. ئیتر ئەو گوناهانە گەورەبن، یا بچووك، بـت پەرست بوبێ یاشتێ تر، لە پاشا ئێوە باوەڕتان هێناو، زانیتـان توشـی هەڵـەبون و، دوای ڕوتـان کرد بۆلای خوای مەزن و پەناتان برد بۆلای بۆ ئەوەی لێتان ببورێ. بەڕاستی خوا گوناهـەکانی ئێوە ئەشۆرێتەوە، میهرەبان و خاوەنی بەزەییە بۆ ئەو کەسانەی موسڵمان ئەبن و داوای لێبوردن ئەکەن. وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِـن قَبْـلِ أَن يَـأْتِيَكُمُ الْعَـذَابُ ثُـمَّ لَـا تُنصَـرُونَ ﴾ وەە ئێـوە بگەڕێنەوە بۆلای پەرستنی خـوای پـەروەردگاری خۆتـان و، بـەگورجی موسـڵمان بـن لـەبـەر ڕەزامەندی خوای پەروەردگار، لـە پێش ئەوەی سزای خـوا بێـت بـۆلای ئێـوە، لـە پاشـا ئێـوە یارمەتیتان نەدرێ و پەشیمان بونەوەتان لێوەرنەگیرێ.

ئەو ئایەتانەی پێشو، بە ئومێد تریـنـی ئایـەتاکانی قەرئانـە بـۆ دەربڕینـی میـهرەبانی خـوا بـۆ بەندەکانی. بۆیە پێویستە لـە بەزەیی خوا بێ ئومێد نەبین، نا ئومێدی لـە بەزەیی و میهرەبانی خـوا یەکێکە لـە گوناهە گەورەکان و، خوا دەرگای میهرەبانی خۆی کردۆتەوە بۆ تاوانباران.

﴿ وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾ وە ئێوە دوای شیرین ترین شتێ بکەون نێراوە بۆلای ئێوە لــە لایـەن پـەروەردگاری خۆتانـە و، خۆتان لـە گوناه بگێڕنەوە، لـە ئەوەی کە بێت بـۆلای ئێـوە سـزای خـوا، بـەکوتوپڕی و، ئێـوە هەستی پێنەکەن و بێئاگابن لـە هاتنی. هەموو شتێ خوا بینێرێ چاکترە لـە هەموو شـتێ. بـەڵام چاکتر لـە هەموو شتێ بۆ گوناهباران بانگ کردنیانە بۆلای پەشیمان بوونەوە.

لـە پاشا خوای مەزن ڕونی ئەکاتەوە، کە ئەنجام و پاشەڕۆژی گوناهباران ئەم سێ شتەیە:

١- ﴿ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَى عَلَى مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ وَإِن كُنـتُ لَمِـنَ السَّـاخِرِينَ ﴾ لـەبەر ئەوەی هیچ کەسێ نەڵێ ئەی پەشیمان بوونەوە و خەفەت بـۆ مـن: لـەسـەر ئـەو شـتەی کەمتەرخەمی و سستیم تێداکرد، بەجێم نەهێنا لـەپەرستن و فەرمانی خوا و، جگەی خوام ئەکرد بە هاوبەش بۆی لـە پەرستندا و، من بەڕاستی یەکێ بووم لـەو کەسانە گاڵتـەمان بـە بـاوەڕداران ئەکرد.

٢- ﴿ أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ اللَّهَ هَدَانِي لَكُنتُ مِنَ الْمُتَّقِينَ ﴾ یا بڵێ: ئەگەر خوا یارمەتی منی بدایە، بەڕاستی من لەو کەسانە ئەبوم لەخوا بترسامایە و، خۆمم لەبێ فەرمانی خوا ئەپاراست و، بت پەرستیم نەئەکرد.

٣- ﴿ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى الْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِي كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ الْمُحْسِنِينَ ﴾ یا ئەو کەسە کاتێ سزای خوای بینی بڵێ: بەڕاستی ئەگەر گەڕانەوە ببوایە بۆمن جارێ تر بۆلای جیهان، دوایی من یەکێ ئەبوم لەو کەسانە چاکەم ئەکرد و، دوای فەرمودەی خوا و پێغەمەر ئەکەوتم.

﴿ بَلَى قَدْ جَاءتْكَ آيَاتِي فَكَذَّبْتَ بِهَا وَاسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴾ ئەو گفتوگۆیەی تۆ ڕاست نیە، بەڕاستی لە جیهاندا هاتبو بۆلای تۆ پێغەمەری من بە چەندین بەڵگەی ئاشکرای ئایەتەکانی قورئانی ئێمە و، بەکاری پەك خەرەوە، دوایی تۆ ئەو ئایەتە و بەڵگانەت بەدرۆخستۆتەوە و، داوای گەورەیی و خۆ بەگەورەدانانت ئەکرد و، تۆ یەکێ بوی لەو کەسانە باوەڕتان بەو ئایەتانە و، بەڕاگەیاندنی پێغەمەر نەبو:

ئەگەر تۆ لە جیهاندا پەلەت بکردایە بۆلای باوەڕهێنان و پەشیمان بوی تاوە، پێویستست بەو ئاواتانە نەئەبو، ئاسودە ئەبوی‌و ترست لە سزای خوا ئەبوو، ڕسوایت بەسەردا نەئەهات لەم ڕۆژەدا بەڵام ئێستا دەرگای پەشیمان بوونەوە داخراوە، ئەو ئاواتانەی تۆ نایەتەدی.

وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ
تَرَى الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ أَلَيْسَ فِي
جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّي اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوْا
بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ السُّوءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾ اللَّهُ
خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾ لَّهُ مَقَالِيدُ
السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ أُولَئِكَ
هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٦٣﴾ قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا
الْجَاهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ
أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ اللَّهَ

فَٱعۡبُدۡ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦ وَٱلۡأَرۡضُ جَمِيعٗا قَبۡضَتُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطۡوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٧﴾

﴿ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ وە تۆ کەسانێکی ئەوتۆ درۆ و بوختانیـان داوە بەسەر خـوادا و، ئـەڵێن: منـاڵ و هاوبەشی هەیە، لـە ڕۆژیدوایی‌دا ئـەیان بینی ڕومـەتیان ڕەش کـراوە. ئایـا دۆزەخ جێگـەی گەڕانەوەی ئەو کەسانە نیە خۆیان بەگەورە دائەنێن لە ڕۆژی دواییـدا لـە ئاستی فـەرموودەی خوادا؟ بێگومان دۆزەخ جێگەی ئەو کەسانەیە.

﴿ وَيُنَجِّي اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوا بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ السُّوءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ وە خـوا کەسـانێکی ئەوتۆ لەخوا ترساون و خۆیانیان پاراستوە لە بێفەرمانی خوا، ڕزگاریان ئەکا لە سـزای خـۆی، بەهۆی سەرکەوتنیانەوە بەکردنی کارەچاکەکانیانە وە، خراپە و سـزا تووشـی ئـەوان نابـێ لـە ڕۆژی دواییدا و، ئەوان خەفەت ناخۆن بۆ هیچ شتێ.

﴿ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴾ خوا دروست کەری هەموو شـتێکە لـە ئاسمانەکان و زەوی و، لە چاك و لە خراپ ئەوەی لـە هـەردوو جیـهاندا پـەیدا ئـەبێ و، خـوا ئاگای لە هەموو شتێ هەیە و چاودێرییان ئەکا.

﴿ لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ ﴾ کلیـل و خاوەنی‌یەتی ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆ خوایە و، هەر خوایە هەڵسوڕێنەری کاروباریانە بەکەم و بە زۆر و، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە ئایەتەکانی قورئان و کارە پەك خەرەکانیان نەهێناوە، ئەو کەسانە هەر ئەوان زیانیان لـە خۆیان داوە و توشی سزا و خەفەت ئـەبن لـە هـەردوو جیـهاندا، جێگەیان دۆزەخە.

﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَأْمُرُونِّي أَعْبُدُ أَيُّهَا الْجَاهِلُونَ ﴾ تۆ بڵێ بەو کەسانە ئەڵێن: تۆ لـەسەر ئـایینی باو باپیری خۆتبە: ئایا ئێوە فەرمان ئەدەن بە من، دوای ئەو هـەموو ڕاسـتیانە مـن جگـەی خـوا بپەرستم، ئەی ئەو کەسانەی نازانن بە چاك و خراپی خۆتان و بێباوەڕن؟

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: هۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـە ئـەوەبوە: بـت پەرسـتان بـە پێغەمەریان ووت: ئێمە ئەوەندە دارایی بەتۆ ئەدەین، ببی یە ساماندارترینی پیاوانی مەکە و، هـەر ژنێ ئارەزۆی بکەی ئەتدەینێ بەو مەرجە واز لەم داوایەی خۆت بهێنی.

بۆ ئاگاداری: ئێوە زۆر کەس لە زانایان ئەبینن ئامۆژگاری دانیشتوان ئەکەن و ئەڵێن: ئێوە دزی مەکەن، پارە و پول بێ‌نرخە کەچی خۆی لە هەمووان دزترە، هەروەك زۆربەی کاربەدەستان و ڕۆژنامەنوسان و بەڕێوەبەرانی پارتە سیاسیەکان درۆشمی جۆراوجۆر ئەنووسن و داوا ئەکەن بۆ پارەوپول خۆتان مەفرۆشن بە بێگانە و نیشتمان ئاوەدان بکەنەوە، کەچی خۆیان سامانی زۆری دانیشتووان داگیر ئەکەن و کۆشك و ئۆتۆمبێلی نایابی پێ‌دروست ئەکەن و بروبیانوی پوچی زۆر بۆخۆیان دروست ئەکەن و، دانیشتوان بە نەزان دائەنێن و، وەك ئاژاڵ بەکاریان ئەهێنن، سەرانەی زۆر سەختیان بەناوی زەریبەوە لێ ئەسێنن و خۆیان ئەیخۆن و کەمێکی ئەدەن بە خاوەنەکانیان.

﴿ وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ ﴾ وە بەڕاستی لە لایەن خواوە سروش نێراوە بۆلای تۆ و بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش تۆبون لە پێغەمەران: بەڕاستی ئەگەر تۆ هاوبەش بۆ خوا دابنێی لە پەرستندا بەڕاستی پوچ ئەبێتەوە پاداشتی کردەوەی چاکی تۆ و بەڕاستی ئێوە لەو کەسانە ئەبن زیانیان لە خۆیانداوە بەهۆی بێ‌فەرمانی خوای گەورەوە.

هاوبەش دانان هەرچەندە بۆ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ گونجاو نیە. بەڵام ناوەرۆکی ئەو ئایەتە هەڕەشەیە لەو کەسانە لە ئایین وەرئەگەڕێت، لەو ئایەتەوە دەرئەکەوێ هەرکەسێ لە ئایین وەرگەڕێ کردەوە چاکەکانی پوچ ئەبێتەوە و، نوێژ و کارەکانی تری بە بی پاداشت ئەڕوا.

﴿ بَلِ اللَّهَ فَاعْبُدْ وَكُن مِّنَ الشَّاكِرِينَ ﴾ بەڵکو تۆ دوایی هەر خوا بپەرستە و، تۆ لەو کەسانە بە سوپاسی خوا ئەکەن لەسەر ئەو چاکانە خوا بەخشیویە بەوان. بێگومان پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەو کەسانەیە سوپاسی خوا ئەکا. بەڵام ئەو ئایەتە هاندانە بۆ کەسانی تر کە سوپاسگوزاری خوابن.

﴿ وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ ﴾ وە بێ‌باوەڕان ڕێزی خوایان نەگرتوە بە جۆرە ڕێزێ شایستەی ڕێزگرتنی ئەو بێ چونکە باوەڕیان بە بتەکان و بە دراو و دینار هێناوە. لەگەڵ ئەوەیشدا خاوەنی توانای بێ ئەندازەیە.

﴿ وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ وە زەوی بە گشتی لەژێر دەستەڵات و توانای خوادایە و، کەسی تر خاوەنیان نی‌یە لە ڕۆژی دوایدا، بەبێ ماندووبوون ئەیانبا بەڕێوە و، ئاسمانەکان لەو ڕۆژەدا ئەپێچرێنەوە بەهۆی توانای خۆیەوە، ئەو ڕستانە هێمایە بۆ گەورەیی و توانای خوا و، بەڕاستی ئاسمانەکان و زەوی ئەو شتەی لەناویاندایە مل کەچی فەرمانی خوان، پاکی و دووری لە کاری نارەوا هەر بۆ خوایە و، خوا باڵاتر و بەرزترە لە شتێ بێ‌باوەڕان ئەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا لە پەرستندا، خاوەنی ئەو دەستەڵاتە گەورانەیە.

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ

إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ
٦٨ وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ
بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ
٦٩ وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَا يَفۡعَلُونَ ٧٠
وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا
فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ
يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ
هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ
٧١ قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى
ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ٧٢

زانایان ئەڵێن: سور بریتی‌یە لە ئامێری وێنەی (کەڕەنایە) فوی پێدا ئەکرێ بۆ ئامادەکردنی سوپا و سەرباز و ئەوەی شابانی بێ باسی چۆنێتی ئەو (سورە) هەواڵەی زانیاری خوایە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: سور بریتیە لە دەنگێکی زۆر گەورە و سەخت. هەروەها زانایان ئەڵێن: سێ جار فو ئەکرێ بەو سورە دا: جارێ یەکەم بۆ ترساندنی دانیشتوانی ئاسمانەکان و زەویە، وەك خوا لە ئایەتی (٨٧)ی سورەتی نەملدا ئەفەرموێ:

﴿ وَيَوْمَ يُنفَخُ فِي الصُّور فَفَزِعَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ ﴾ جاری دووەم فو ئەکرێ بە سوردا ، هەموو دانیشتوانەکانی ئاسمان و زەوی ئەمرن، هەروەك لە ئایەتی (٦٨)ی ئەم سورەتە ئەیفەرموێ. جارێ سێ‌هەم فو ئەکرێ بەسوردا هەموو مردووەکان زیندوو ئەکرێنەوە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو دوو جارەی دوایی ، خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّور فَصَعِقَ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ إِلَّا مَن شَاءَ اللَّهُ ﴾ وە فو ئەکرێ بە سوردا، دوایی هەرکەسێ لە ناو ئاسمانەکان و لە ناو زەوی‌دان ئەمرن، مەگەر کەسێ خوا ئارەزۆی هەبێ نەمرێ لە فریشتەکان.

﴿ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُم قِيَامٌ يَنظُرُونَ ﴾ لە پاشا جارێ تر فو ئەکرێ بەسووردا، دوایی کتوپڕ ئەوانەی لە ئاسمانەکان و زەوی‌دان هەڵئەسنەوە لە گۆڕەکانیان و زیندو ئەکرێنەوە و تەماشای ئەم لاولای خۆیان ئەکەن چاوەڕوانی فەرمانی خوا ئەکەن.

﴿ وَأَشْرَقَتِ الْأَرْضُ بِنُورِ رَبِّهَا ﴾ وە زەوی شتێ و کۆبونەتەوە لە ڕۆژی پرسیاردا بەهۆی ڕوناکی دادپەروەری پەروەردگاری ئەو زەوی‌یەڕوناك ئەبێتەوە بەبێ شتێکی دیاری وەك خۆر لە جیهاندا و، خوای مەزن چاك و خراپی ئادەمیزاد جوێ دەکاتەوە و، ستەم لە هیچ کەسێ ناکرێ، وەك خوا ئەفەرموێ.

﴿ وَوُضِعَ الْكِتَابُ وَجِيءَ بِالنَّبِيِّينَ وَالشُّهَدَاءِ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ وە نامەی تۆمارکراوی هەمو کردەوەی ئادەمیزاد دائەنرێ و، پێغەمەران ئەو کەسانەی جێگەنشینی پێغەمەران بوون لە زانایان و شەهیدان ئەهێنرێن و، فەرمان ئەدرێ لە نێوان هەموویاندا بەجۆرێکی دادپەروەر و، ئەوان ستەمیان لێ‌ناکرێ، هەموو کارێ جێ‌بەجێ ئەکرێ لەو کاتە پێغەمەران شایەتی ئەدەن لەسەر زانایان و ئەڵێن: ئێمە بەڵێنمان وەرگرتوە لەوان کە ناوەرۆکی نامەی خوا ڕابگەیەنن بە ئادەمیزاد و فێری یاسای خوایان بکەن، زانایانیش شایەتی ئەدەن کە ئێمە یاسای خوامان بەوان ڕاگەیاندوە، خوای مەزن هەمو شتێ ئەزانێ، بەڵام هێنانی ئەوان بۆ ئەوەیە هیچ کەسێ بیانوی نەمێنێ، وەك خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴾ وە بەتەواوی ئەدرێ بەهەمو کەسێ پاداشتی لە جیهاندا کردویانە لە چاك و لە خراپ و، خوا زاناترە بەشتێ ئادەمیزاد ئەیکەن، پێویستی بە شاهید نی‌یە.

﴿ وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە پاڵیان پێوە ئەنرێ بۆلای دۆزەخ زۆر بەسەختی کۆمەڵ لەدوای کۆمەڵ و بەڕسوایی و بەبێ نرخی، هەتا کاتێ ئەچنە لای دۆزەخ و، هەموو دەرگاکانی دۆزەخیان بۆ ئەکرێتەوە کە لە پێش ئەواندا پێوەدرابوون و، پاداشتیان هەر دۆزەخە.

﴿ وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا ﴾ و پاسەوانەکانی دۆزەخ بە بێ‌باوەڕان ئەڵێن: ئایا پێغەمەران لە ڕەگەزی ئێوە نەهاتوون بۆلاتان، ئایەتەکانی نامەی پەروەردگاری خۆتان بخوێننەوە بەسەرتانا و، بتان ترسێنن لە سزای گەیشتنتان بەم ڕۆژە سەختەی توشتان بوە؟

﴿ قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴾ بێ‌باوەڕان ئەڵێن: بەڵێ هاتون بۆلای ئێمە پێغەمەران و ئێمەیان ترساندوە لە گەیشتن بەسزای سەختی ئەم ڕۆژە و، بەڵام فەرمودەی سزادانی ئێمە لە لایەن خواوە پێویست کراوە لەسەر بێ‌باوەڕان، بەهۆی ئەو کردەوە خراپانەوە، پێچەوانە لە فەرمودەی خوا دانابێ.

﴿ قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ بە بێباوەڕان ئەبێژرێ: ئێوە بچنە ناو دەرگاکانی دۆزەخ، بەردەوامبن لەناویاندا، دوایی دۆزەخ جێگەیەکی خراپە بۆ ئەو کەسانە خۆیان بەگەورە دائەنا بەرانبەر بە فەرمودەکانی خوا و پێغەمەرانی خـوا و، بڕوایـان بـە سزای دۆزەخ نەبو.

وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ زُمَرًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَٱدْخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُوا۟ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ وَتَرَى ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنْ حَوْلِ ٱلْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْحَقِّ وَقِيلَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾

﴿ وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا ﴾ و کەسانێکی ئەوتۆ لـە پـەروەردگاری خۆیـان ترساون و خۆیانیان لـەبێ فەرمانی خوا پاراستوە بەسواری کەژاوەۆ بەپەلە و بەرێزەوە ئـەنێررێن بۆلای بەهەشت بەکۆمەڵ کۆمەڵ هەر یەکەیان بە پلە و پایەیەکی بەرزی جیاواز و تایبەتی‌یەوە.

﴿ حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا ﴾ هەتا کاتێ ئەچنە بەهەشت، خوای مەزن ئەبەخشێ بەو کەسانە رێز و بەختیاری بەجۆری ئەوەی خوا ئەیبەخشێ نایەنە ژمارە جگە لـەوەیش ئەچنە ناوبەهەشت.

﴿ وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ ﴾ وە دەرگاکانی بەهەشت بۆ ئەو کەسانە لـە خواترسانون ئەکرێتەوە و، دەرگاوان و پاسەوانەکانی بەهەشت بەو کەسانە ئەڵێن: ئاشتی و خۆشی و نەترسانی بەردەوام لـەسەر ئێوە بێ، ئێوە پاك بوونەتەوە لـە هەموو گوناهێ و، ئێوە دوورن لـەهەموو شتێ ئێوە لـەکەدار بکا، دوایی ئێوە بچنە ناو بەهەشتەوە بەبەردەوامی، هەتا هەتایە.

﴿ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ ﴾ وە ئەو لـە خواترسانە ئەڵێن: کاتێ ئەچنە ناو بەهەشت: هەمو سوپاس و ستایشێ بۆ خوایەکی ئەوتۆ بێ ئەو بەڵێنەی دابوی بە ئێمە

جێبەجێ کرد کە فەرموی: زیندووبوونە و پرسیار و پاداشت و تۆڵە هەن و، کردی بە بەشی ئێمە ئەو جێگەیە ئێمە هاتوینە ناوی و، زەوی بەهەشتی بەخشی بە ئێمە.

﴿ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاء فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ﴾ ئێمە لەناو ئەم بەهەشتە فراوان و بەرینەدا دائەنیشین لەهەر جێگەیە ئێمە ئارەزۆمان هەبێ بەخۆشی، دوایی ئەو بەهەشتە پاداشتی ئەو کەسانەیە لە جیهاندا بەفەرمانی خوا هەڵسان و، ئەوەی خوا فەرمانی پێداوە کردوویانە و باوەڕیان هێناوە.

﴿ وَتَرَى الْمَلَائِكَةَ حَافِّينَ مِنْ حَوْلِ الْعَرْشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ ﴾ وە تۆ فریشتەکان ئەبینی ئەگەڕێن بەملاو لای عەرش و بونەوەرەکانی خوادا و ئەوەی خوا بیفەرموێ ئەیکەن، بەهۆی سوپاسی پەروەردەکەری خۆیانەوە پاك و بێگەردی و دوری لە شتێ ناشایستە دەرئەبڕن بۆ خوای پەروەردگاری خۆیان.

﴿ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْحَقِّ وَقِيلَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ وە لە دوای پرسیار فەرمان ئەدرێ لە نێوان ئادەمیزاددا بەجۆرێکی دادپەروەری و ڕاستی، هەندێکیان بۆلای بەهەشت و هەندی تریان بۆلای دۆزەخ، وە لە خۆشیدا لە لایەن دانیشتوانی بەهەشتەوە ئەبێژرێ هەمو سوپاس و ستایشێ بۆ پەروەردگاری هەمو بونەوەرانە لەسەر ئەو هەموە چاکانە خوا بەخشبوێ بە هەموو بونەوەران، هەمو کارێ جێبەجێ ئەکرێ...

**کۆتایی پێهات بە یاریدە خوا لە (٦/٧/٢٠٠٠) بەرانبەر**
**(٥)ی ڕەبیعی دووهەم کۆچی (١٤٢١)**

## ﴿ سورەتی (غافیر) یا سورەتی (ئەلموئمین) ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. جگە لە ئایەتەکانی (٥٦-٥٧) لە مەدینــە هاتونەتـە خـوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٨٥) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ
الذَّنبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ شَدِيدِ الْعِقَابِ ذِي الطَّوْلِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ
إِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿٣﴾ مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا
فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي الْبِلَادِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ
نُوحٍ وَالْأَحْزَابُ مِن بَعْدِهِمْ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍ بِرَسُولِهِمْ
لِيَأْخُذُوهُ وَجَادَلُوا بِالْبَاطِلِ لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ
فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى
الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ أَصْحَابُ النَّارِ ﴿٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ حم ﴾ لە سورەتی ئەلبەقەرە و سورەتەکانی تـردا مانـای ئـەو پیتانـە بـە گوێـرەی بـیر و بۆچوونی زاناکان باسکراوە.

﴿ تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴾ ئەم قورئانە نێراوەتە خوارەوە لـە لایـەن خوایێکـەوە زۆر بەدەستەڵاتە، ئەزانێ بە کەسانە باوەڕ ئەهێنن و بەو کاسانە باوەڕنایەرن، ئەو قورئانە ترازوی ڕاستی و دادپەروەری‌یە.

﴿ غَافِرِ الذَّنبِ وَقَابِلِ التَّوْبِ شَدِيدِ الْعِقَابِ ذِي الطَّوْلِ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ إِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴾ خوایەکـە لـە گوناهی تاوایاران خۆش ئەبێ، پەشیمان بوونەوە وەرئەگرێ لـەو کەسـانە پەشـیمان ئەبنـەوە،

سزای زۆر سەختە بۆ تاوانباران، خاوەنی و گەورەیی و چاکەیە بەسەر هەمو بونەوەراندا، هیچ خوایە نیە شایانی پەرستنبێ جگەی ئەو، هەر بۆلای ئەو خوایەیە گەڕانەوەی ئادەمیزاد، پاداشتی هەموو کەس ئەداتەوە بە گوێرەی کرداری خۆیان.

﴿ مَا يُجَادِلُ فِي آيَاتِ اللَّهِ إِلَّا الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَا يَغْرُرْكَ تَقَلُّبُهُمْ فِي الْبِلَادِ ﴾ گفتوگۆی نابەجێ ناکەن لەبارەی ئایەتەکانی نامەی خوا، ئایا ڕاستن یان درۆن مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە، دوایی ئارەزۆی پوچی خۆیان کەوتوون و، بڕوبیانووی نارەوا ئەهێننەوە، ئەڵێن: قورئان نوسراوی پێشوانە و، زیندووبوونەوە نیە، دوایی هات و چۆی ئەوان بەناو شارەکاندا بۆ بازرگانی فریوی تۆ نەدا کە قازانجی زۆر ئەکەن.

﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَالْأَحْزَابُ مِن بَعْدِهِمْ ﴾ تاقمی نوح و ئەو تاقمانەی کە کۆئەبوونەوە لە دژی ڕاستی و خاوەنی ڕاستی پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوە لە پێش بت پەرستانی مەکەوە، ئەو جەنگەی تۆ لەگەڵ بت پەرستان جەنگی تایبەتی نیە. بەڵکو جەنگی نێوان ڕاستی و درۆیە، جەنگی نێوان باوەڕ و بێباوەڕییە، ئەو جۆرە کارانە کارێکی تازە نیە و کۆنترە.

﴿ وَهَمَّتْ كُلُّ أُمَّةٍ بِرَسُولِهِمْ لِيَأْخُذُوهُ وَجَادَلُوا بِالْبَاطِلِ لِيُدْحِضُوا بِهِ الْحَقَّ فَأَخَذْتُهُمْ فَكَيْفَ كَانَ عِقَابِ ﴾ وە هەموو نەتەوەیە لە نەتەوەکانی پێشوو نیازی ئەوەیان ئەکرد پێغەمەرەکانی خۆیان بکوژن و ئازاریان بدەن و، گفتوگۆی نابەجێیان لەگەڵ ئەکردن; لەبەر ئەوەی بەو گفتوگۆ نارەوایە ڕاستی باوەڕهێنان پوچ بکەنەوە، دوایی ئێمە ئەوانمان لەناوبرد و ئازاری سەختمان دان، دوای لەناوبردنیان ئێوە بڕۆن سەیری جێگەکانیان بکەن چۆن بوە سزای سەختی من بۆ ئەوان.

﴿ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ أَصْحَابُ النَّارِ ﴾ وە هەر بەو جۆرەی باسکرا پێویست بوبو فەرمودەی پەروەردگاری تۆ لەسەر کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنا بو کە بەڕاستی ئەوان دانیشتوی ئاگری دۆزەخن. ئەگەر ئەم تاقمەی نۆیشە باوڕنەهێنن، دوا ڕۆژی ئەمانیش وەك دوا ڕۆژی ئەوان وایە و، لەناو دۆزەخدا ئەبنە هاوڕێی یەكتری.

ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا وَأَدۡخِلۡهُمۡ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدتَّهُمۡ وَمَن صَلَحَ

مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ
ٱلْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَمَن تَقِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ
يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُۥ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٩﴾ إِنَّ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ
أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى ٱلْإِيمَٰنِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾

﴿ الَّذِينَ يَحْمِلُونَ الْعَرْشَ وَمَنْ حَوْلَهُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيُؤْمِنُونَ بِهِ ﴾ ئەو فریشتانەی ئەوتۆ تەختی پەروەردگاری تۆ هەڵئەگرن و ئەو فریشتانەیش لــەم لاولای عەرشــەوەن هــەموویان بــە سوپاس و ستایشەوە نوێژ ئەکەن بۆ پەروەردگاری خۆیان و باوەڕی پێئەهێنن.

بۆ زانین: مەبەست لە هەڵگرتنی عەرش چاودێری و هەڵسوڕاندنی ئەو فەرمانانەیە خــوا بــە فریشتەکانی سپاردوە لەپەرستن و داواکردنی لێبوردن لە خــوا بــۆ گوناهبــاران. کــە ئــەبێژرێ عەرشی خوا، یانێ توانای خوا بەسەر هەموو بونەوەراندا، هەڵگرتنی فریشتەکان بۆ تەختی خــوا ئەوە ناگەیەنێ خوا لـەشی هەبێ و، خوا لـەسەر تەخت دانیشتبێ، ئەگەر وابێ ئەبێ خــوا لـەشــی هەبێ و پێویستی بە جێگەیە هەبێ لـەسەری دانیشێ، ئەوەیش لە خــواێ دووره و ناگونجێ خــوا لـەشی هەبێ.

پرسیار: ئەگەر خوا لـەسەر تەخت دانەنیشێ، لـەبەر چ شتێکە ئەبێژرێ (تەختی پەروەردگاری تۆ)؟

وەڵام: وولامدانەوەی ئەو پرسیارە زۆر ئاسانە، ئەوتە ئەبێژرێ: شەقامی فلان کەسێ کــەچی ئەو کەسە هیچ شتێ لـەو بارەوە نازانێ، هەموو مزگەوتەکانی جیهان و کەعبەی ڕێــزدار بــەوان ئەبێژرێ خانەی خوا و، مانای وا نییە خوا لـەناویان دائەنیشێ، بەو جۆرە دروستە بۆخوای مەزن ئەو تەختەی لـە ئاسمانا دروست کردبێ و فەرمانبدا بە فریشتەکان بسوڕێنەوە بەدەوریا، هــەروەك ئیبراهیم کەعبەی دروست کرد و، خوای مــەزن پێویستی کــرد لـەســەر ئــادەمیزاد بــەودەوریا بسوڕێنەوە ئەگەر توانایان هەبە. هەموو شتێ هەر خوا ئەیزانێ.

﴿ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا وَسِعْتَ كُلَّ شَيْءٍ رَّحْمَةً وَعِلْمًا ﴾ وە فریشــتەکان داوای لێخۆشبوون ئەکەن لـە خوا بۆ کەسانێکی ئــەوتۆ باوەڕیــان هێنــاوەو گوناهبــارن، ئــەڵێن: ئــەی پەروەردگاری ئێمە: بەزەیی و میهرەبانی و زانیاری تۆ هەموو شتێکی گرتوە لـە ڕووی زەویدا و لـە پاشەڕۆژدا و، ئەوانەی تێدا کۆبوەتەوە بە فراوانی.

﴿ فَاغْفِرْ لِلَّذِينَ تَابُوا وَاتَّبَعُوا سَبِيلَكَ وَقِهِمْ عَذَابَ الْجَحِيمِ ﴾ دوايی تۆ خۆشببە لە کەسانێکی ئەوتۆ پەشيمان بونەتەوە و، دوای ڕێگەی ئايينی تۆ کەوتوون، تۆ لـە سـزای دۆزەخ بيانپـارێزە. خوای مەزن پاداشتی جۆراوجۆری هەيە بۆ باوەڕداران: چونيان بۆ بەهەشت، هاوڕێتی پێغەمەران و شەهيدان و پياوچاکان و پاڕانەوەی فريشتەکان بۆيان، زۆر شتی تريش.

﴿ رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُم وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ ئەی پەروەردگاری ئێمە تۆ ئەو کەسانە و ئەو کەسەی کردەوەی چـاکی کردوە لە باوك و ژن و منداڵەکانی ئەوان تۆ بيانخەرە ناو بەهەشـتی بـەرين و جێگـەی دانيشـتنی بەردەوام، ئەو بەهەشتانە بەڵێنت داوە بەوان بياندەرێ بەڕاستی تۆ زۆر بەدەستەڵاتی تۆ تۆڵە لـە دوژمنانی پێغەمەر بکەيتەوە، هەمو شتێ لە جێگەی شياوی خۆيا دائەنێ. ڕستەی ﴿وَمَن صَلَحَ﴾ ئاماژە بۆلای پچڕانی پەيوەندی لە نێوان باوەڕدار و بێباوەڕان دا ئەکا، باوەکو بـاوك و کـوڕی يەکتربن.

﴿ وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ وَمَن تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ وَذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾ تـۆ ئـەو کەسانە بپارێزە لـە سـزای خراپـەکانيان و، هەرکەسـێ تـۆ لـەو ڕۆژە دا بيپـارێزی لـە سـزای خراپەکانی، دوايی بەڕاستی تۆ لەو کەسە خۆشبووی بەهۆی ميهرەبانی خۆتەوە، ئەو لێخۆشبون و پاراستنە لە سزای خراپەکان سەرکەوتن و ڕزگاربوونی گەورەيە کە ئەچنە ناو بەهەشت.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئـەوتۆ باوەڕيان نەهێناوە لە ڕۆژی دوايیدا، بانگيان ئەکرێ و لـەناو ئـاگردان و، نـەفرەت لـە خۆيـان ئەکەن و سەرزەنشتی خۆيان ئەکەن کە باوەڕيان نەهێناوە، لەو کاتەدا بەوان ئەبێژرێ بەڕاسـتی نەفرەت و توڕە بونی خوا لە ئێوە لە جيهاندا، زۆر گەورەترە لە نەفرەت و سەرزەنشتی خۆتـان بۆخۆتان لەم ڕۆژەدا.

﴿ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الْإِيمَانِ فَتَكْفُرُونَ ﴾ خوا زۆر توڕە بو لە ئێوە کاتێ لە جيهاندا بـانگی ئێـوە ئەکرا بۆلای ئەوەی ئێوە باوەڕبهێنن. دوايی ئێوە باوەڕتـان نـەهێناو، هـەندێکيان ئـەوانی تريـان لائەدا لە ڕێگەی ڕاست.

قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا
فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُ إِذَا دُعِيَ
اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِن يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا فَالْحُكْمُ لِلَّهِ
الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ الَّذِي يُرِيكُمْ آيَاتِهِ وَيُنَزِّلُ
لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ رِزْقًا وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾

فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴿١٤﴾
رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن
يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَىٰ
عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿١٦﴾
الْيَوْمَ تُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ
اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿١٧﴾

﴿ قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَى خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴾ بێباوەڕان ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە: دووجار ئێمەت مراندوە: جارێ بەر لەوەی لە دایك بوین و جارێ تر دوای کۆتایی پێهاتنی تەمەنمان لە جیهاندا و،دوو جار ئێمەت زیندوو کردووەتەوە یەکەمجار لە دایك بووین، دووهەم جاری دوای مردنمان لە پاشەڕۆژدا، دوایی ئێمە ددان ئەنێین بە گوناهی خۆمانا و پەشیمان ئەبینەوە لەو گوناهانەی لە جیهاندا کردومانە لە ژیانی یەکەمدا، ئایا دوایی ڕێگەیە هەیە بۆ لای دەرچوونمان لە ئاگر و جارێ تر بگەڕێینەوە بۆ جیهان، هەتا ئێمە باوەڕبهێنین و کردەوەی چاك بکەین و فەرمانەکانی تۆ بەجێبهێنین. وولامیان ئەدرێتەوە و دەرچوونتان لەناو ئاگردا نیە.

﴿ ذَلِكُم بِأَنَّهُ إِذَا دُعِيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ وَإِن يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ ﴾ ئەو جێگەیە شوێنی ئێوەیە لەبەر ئەوەی بەڕاستی بانگی ئێوە بکرایە بۆلای پەرستنی خوا بە تەنها ئێوە باوەڕتان نەئەهێنا و، ئەگەر هاوبەش دابنرایە بۆ خوا باوەڕتان ئەهێنا، دوایی هەموو فەرمانێ بۆ خوایە و، فەرمانی داوە ئێوە بچنە ناو دۆزەخ، خوا کەسێکە لەو بالآبەدەستر نیە، لەو گەورەتر نیە لە دەستەلآتا.

﴿ هُوَ الَّذِي يُرِيكُمْ آيَاتِهِ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ رِزْقًا وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە نیشانە و بەڵگەی زۆری نیشانی ئێوە دا لەسەر توانای خۆی و ئەنێرێتە خوارەوە لە هەوری ئاسمان ئاوێ ئەبێتە هۆی پەیداکردنی ڕۆزی و خواردەمەنی بۆ ئێوە و، ئامۆژگاری وەرناگرێ مەگەر کەسێ بگەڕێتەوە بۆلای خوا و بیپەرستێ.

﴿ فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴾ دوایی ئێوە خوا بپەرستن بە تەنها، بە نیازی پاکەوە پەرستن هەر بۆ ئەو بکەن و، باوەکو بێباوەڕان پێیان ناخۆشبێ پەرستن هەر بۆ خوایە تەنها.

﴿ رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَى مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ ﴾ خوای مەزن پلەو پایەی دۆستانی خۆی بەرز ئەکاتەوە لەبەهەشتا، خاوەنی هەمو بونەوەرانـە و، هەر ئەو خاوەن دەستەلاتە، خوا بەهۆی فەرمان و دەستوری خۆیەوە سروش ئەنێرێ بۆلای کەسێ ئارەزۆی هەبێ لە بەندەکانی خۆی و ئەیکا بە پێغەمەر; لەبەر ئەوەی بەندەکانی خوا بترسێنێ لە سەختی رۆژی دوایی و، رۆژی گەیشتنی ئادەمیزاد بە پاداشتی خۆی.

﴿ يَوْمَ هُم بَارِزُونَ لَا يَخْفَى عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ ﴾ ئەو رۆژە رۆژێکە هەمو ئادەمیزاد لە گۆڕەکانیان دێنە دەرێ و هیچ شتێ دایان ناپۆشێ، هیچ شتێ لە کرداری ئەوان پەنهان نیە لەسەر خوا. لەو رۆژەدا ئەبێژرێ بە بونەوەران:

﴿ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴾ وە بۆ چ کەسێکە خاوەنیەتی و پاشایەتی لەم رۆژەدا ؟ تۆ لە وولامی هەموو یانا بلێ: هەر بۆ خوایە خاوەنیەتی هەمو بونەوەران لەو رۆژەدا و، خوایەکە تەنها هاوبەشی نیە، زۆر بەدەستەلاتە لەو رۆژەدا باوەڕداران وولام ئەدەنەوە بەگوێرەی بیر و باوەڕی خۆیان، بێباوەڕان خەفەتبار و ڕێگەی سەرپێچیان نیە و جیهانیان لە دەست دەرچوە و بۆیان ناگەڕێتەوە.

﴿ الْيَوْمَ تُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ لَا ظُلْمَ الْيَوْمَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴾ ئەو رۆژە رۆژێکە هەموو کەسێ پاداشتی ئەدرێتەوە بە شتێ کردویەتی لە جیهاندالە چاك و لە خراپ، ئەو رۆژە ستەمی تێدا ناکرێ. نە لە پاداشتی چاکە و نە لە سزای تاوانباران. بەڕاستی پرسیارکردنی خوا لە رۆژی دواییدا کاتێکی درێژی بۆنیە، خوا توانای هەیە لە کەمترین کاتا پرسیاری هەمو بونەوەران جێبەجێ بکا.

وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ
لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ
يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ ﴿١٩﴾
وَاللَّهُ يَقْضِي بِالْحَقِّ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ لَا يَقْضُونَ
بِشَيْءٍ إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ۞ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي
الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ
كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ

بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٍ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ
كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُوا۟ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ
قَوِىٌّ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٢٢﴾

﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ ﴾ وە تۆ بێباوەڕان بترسێنە لە سزای ڕۆژێ هاتنی نزیکە کە ڕۆژی دواییە، کاتێ دڵیان ئەکەوێتە جوڵە و قورسایی ئەخاتە سەر سییەکان لەسەرەوەی قورگیان و، توشی کەم هەناسەیی ئەبن، ئاواتە خوازی ڕزگاربن بەهۆی مردنەوە، خەتەفبار و بێدەنگ و، دڵیان پڕبوە لە خەفەت و گفتوگۆیان بۆ ناکرێ، بۆ ستەمکاران و بێ باوەڕان هیچ دۆستێکیان نیە دڵیان بداتەوە و، هیچ کەسێ نیە بۆیان بپارێتەوە وە وەڵامی بدرێتەوە.

﴿ يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ ﴾ خوا ئەزانێ بە هەمو شتێ و بەشتێ بەدزیوە تەماشای بۆ بکرێ و، بەشتێ دڵیان پەنهانی دابێ.

﴿ وَاللَّهُ يَقْضِي بِالْحَقِّ وَالَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ لَا يَقْضُونَ بِشَيْءٍ إِنَّ اللَّهَ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴾ وە خوا فەرمان ئەدا بە دادپەروەری و بەڕاستی، کەسانێکی ئەوتۆ لە جگەی خوا ئەپەرستن هیچ فەرمانێ نادەن سودی تێدابێ، چونکە بێگیانن و هیچ شتێ نازانن. بەڕاستی هەر خوایەهەموو شتێ ببیسێ لە گفتوگۆی ئادەمیزاد، هەموو شتێ ببیسێ لە کرداری ئادەمیزادە.

﴿ أَوَ لَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ كَانُوا مِن قَبْلِهِمْ ﴾ ئایا بێباوەڕانی مەکە نەڕۆیشتوون بەناو زەوی شام و یەمەندا، دوایی تەماشا بکەن چۆن بوە کۆتایی و پاشەڕۆژی کەسانێکیئەوتۆ لە پێش ئەوانەوە بوون لە بێباوەڕان.

﴿ كَانُوا هُمْ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ بِذُنُوبِهِمْ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ اللَّهِ مِن وَاقٍ ﴾ ئەوانەی پێش ئەمان بە وێنەی تاقمەکانی نوح و هود و ساڵح و جگەی ئەوان، هێزی ئەوان و ئاوەدانکردنەوەیان بۆ زەوی و نیشتمانی خۆیان بەهێزتر و ئاوەدان کردنەوەیان زۆرتر بوە، دوایی سزای ئەوانەی پێشووی دا بەهۆی گوناهەکانیانەوە، هیچ کەسێ نەبو لە جگە خوا بیانپارێزێ لە سزای خوا.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَكَفَرُوا ﴾ ئەو سزادانەی ئەوان بەهۆی ئەوەۆ بو بەڕاستی پێغەمەرەکانی ئەوان بە چەندین بەڵگەی ئاشکرا چون بۆلایان، دوایی ئەوان باوەڕیان نەهێنا.

﴿ فَأَخَذَهُمُ اللَّهُ إِنَّهُ قَوِيٌّ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴾ دوایی خوا سزای ئەو کەسانەیدا باوەڕیان نەهێنا. بەڕاستی خوا زۆر بەهێزە، سزای سەخت و گرانە بۆ بێباوەڕان.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَا
وَسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَقَـٰرُونَ
فَقَالُوا۟ سَـٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْحَقِّ مِنْ
عِندِنَا قَالُوا۟ ٱقْتُلُوٓا۟ أَبْنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ وَٱسْتَحْيُوا۟
نِسَآءَهُمْ ۚ وَمَا كَيْدُ ٱلْكَـٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَـٰلٍ ﴿٢٥﴾
وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِىٓ أَقْتُلْ مُوسَىٰ وَلْيَدْعُ رَبَّهُۥٓ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ
أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِى ٱلْأَرْضِ ٱلْفَسَادَ ﴿٢٦﴾
وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ
لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ ءَالِ
فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَـٰنَهُۥٓ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّىَ
ٱللَّهُ وَقَدْ جَآءَكُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ مِن رَّبِّكُمْ ۖ وَإِن يَكُ كَـٰذِبًا
فَعَلَيْهِ كَذِبُهُۥ ۖ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ ٱلَّذِى
يَعِدُكُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴿٢٨﴾ يَـٰقَوْمِ
لَكُمُ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ ظَـٰهِرِينَ فِى ٱلْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ
بَأْسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَا ۚ قَالَ فِرْعَوْنُ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ
أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مُوسَى بِآيَاتِنَا وَسُلْطَانٍ مُبِينٍ إِلَى فِرْعَوْنَ وَهَامَانَ وَقَارُونَ فَقَالُوا سَاحِرٌ كَذَّابٌ ﴾
وە ئێمە بەڕاستی موسامان ڕەوانە کرد بە چەندین بەڵگە و کاری پەک خەری ئاشکرا و،

بەهێزێکی ئاشکراو و کە داردەستی بو، بۆلای فیرعەون و هامان و قارون، دوایی ئەوان ووتیان: موسا جادوگەرە، زۆر درۆزنە.

﴿ فَلَمَّا جَاءهُم بِالْحَقِّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا اقْتُلُوا أَبْنَاء الَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ وَاسْتَحْيُوا نِسَاءهُمْ وَمَا كَيْدُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ ﴾ دوایی کاتێ موسا چوو بۆلایان بە پەیامێکی ڕاستەوە لە لایەن ئێمەوە، بۆیان نەکرا ڕووبەڕووی ڕاوەستن ووتیان: ئێوە کوڕانی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە لەگەڵ موسادا بیان کوژن و، ژنەکانیان بە زیندویی بهێڵنەوە بۆ کارەکەی خۆیان، ئەو کارە نا ڕەوایە بەر لە دایکبوونی موسا و دوای لە دایکبوونیشی بەردەوامبو، پیلان و فێڵی بێباوەڕان لە گومڕایی و زیانی خۆیانا کۆتایی پێ‌هاتوە سودێکی بەوان نەبەخشی.

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ ذَرُونِي أَقْتُلْ مُوسَى وَلْيَدْعُ رَبَّهُ إِنِّي أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أَوْ أَن يُظْهِرَ فِي الْأَرْضِ الْفَسَادَ ﴾ فیرعەون ویستی موسا بکوژێ، هەندی لە پیاوەکانی ووتیان: تۆ موسا مەکوژە، نەوەك خوای موسا تۆڵە بسێنێ، وە فیرعەون لە وولامیانا ووتی: ئێوە واز لە من بهێنن با موسا بکوژم و، موسا لە پەروەردگاری داوای یارمەتی بکا ئەگەر جگەی من خوایێ تر هەیە، بەڕاستی من ئەترسم کە ئەم ئایینەی ئێوە بگۆڕێ، یا ببێتە هۆی ئاڵۆزی و شۆڕشی دانیشتووان و، بەو بۆنەوە خراپە بەرپا بکا لە ناو زەوی میسردا.

﴿ وَقَالَ مُوسَى إِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٍ لَّا يُؤْمِنُ بِيَوْمِ الْحِسَابِ ﴾ وە موسا ووتی: بەڕاستی من پەنا ئەگرم بەهۆی پەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوەوە لەهەر کەسێ خۆی بە گەورە دابنێ لە ئاستی فەرمانی خوادا و، بڕوا بە ڕۆژی پرسیار و سزا نەیەرێ.

﴿ وَقَالَ رَجُلٌ مُّؤْمِنٌ مِّنْ آلِ فِرْعَوْنَ يَكْتُمُ إِيمَانَهُ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءكُم بِالْبَيِّنَاتِ مِن رَّبِّكُمْ ﴾ وە پیاوێکی باوەڕدار لە پیاوە بەڕێزەکانی فیرعەون باوەڕهێنانی خۆی پەنهاندا بوو ووتی: ئایا ئێوە پیاوێ ئەکوژن بڵێ: کە پەروەردگاری من: هەر خوایە بەتەنها و، بەڕاستی هاتوە بۆلای ئێوە بەچەندین بەڵگە و کاری پەك خەر لە لایەن پەروەردگاری ئێوەوە لەسەر ڕاستی داوای خۆی.

﴿ وَإِن يَكُ كَاذِبًا فَعَلَيْهِ كَذِبُهُ وَإِن يَكُ صَادِقًا يُصِبْكُم بَعْضُ الَّذِي يَعِدُكُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ كَذَّابٌ ﴾ وە ئەگەر ئەو پیاوە درۆ بکا، دوایی زیانی درۆکە هەر لەسەر خۆیەتی و، زیان توشی ئێوە ناکا و، ئەگەر ڕاست بکا و، ئێوە بەدرۆی بخەنەوە، بەلای کەمەوەهەندێ لەو شتەی ئەوتۆ هەڕەشەی پێ ئەکا لە ئێوە توشی ئێوە ئەبێ لە جیهاندا و ڕسواتان بکا. بەڕاستی خوا ڕانومایی کەسێ ناکا لەسنوور لایدابێ، لە داواکاریدا درۆ بکا.

﴿ يَا قَوْمِ لَكُمُ الْمُلْكُ الْيَوْمَ ظَاهِرِينَ فِي الْأَرْضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِن بَأْسِ اللَّهِ إِنْ جَاءنَا ﴾ ئەو پیاوە باوەڕدارە ووتی: ئەی تاقمی خزمانی من: ئێوە ئەمڕۆ خاوەنی دەسەڵاتن لەزەوی میسردا، ئێوە بە هێزترینی ڕژێمن لەم کاتەدا، زاڵ و بێ‌ترسن، دوایی چ کەسێکە یارمەتی ئێوە بدا و، ڕزگارتان بکا ئەگەر ئەو سزایە بێت بۆلای ئێمە.

زانای بەناوبانگی مەراغی لـە تەفسیرەکەی خۆیا ئەڵێ: ئەو پیاوە باوەڕدارە ئامۆزای فیرعەون و جێگەداریشی بوو، بەڕێوەبەری پۆلیس بو، هەر ئەو پیاوەیشبو بە موسای ووت: خۆت ڕزگار بکە ئەویش چوبۆ مەدیەن و لای شوعەیب.

﴿ قَالَ فِرْعَوْنُ مَا أُرِيكُمْ إِلَّا مَا أَرَى وَمَا أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ الرَّشَادِ ﴾ فیرعەون ووتی: من هیـچ شتێ نیشانی ئێوە نادەم مەگەر هەر ئەو شتەی ئاماژەم بۆ کرد و بە ئێوەم ووت کەکوشتنی موسا بوو، ڕانومایی ئێوە: ناکەم بۆلای هیچ شتێ مەگەر ڕێگەی ڕاست و بەسود بۆ ئێوە.

وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ
أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ٣٠ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ
وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ٣١
وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ٣٢ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ
مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ٣٣
وَلَقَدۡ جَآءَكُمۡ يُوسُفُ مِن قَبۡلُ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلۡتُمۡ فِي شَكّٖ
مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلۡتُمۡ لَن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ
مِنۢ بَعۡدِهِۦ رَسُولٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ
مُّرۡتَابٌ ٣٤ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ
أَتَىٰهُمۡۖ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ
يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ ٣٥

﴿ وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ الْأَحْزَابِ ﴾ وە کەسێکی ئەوتۆ بـاوەڕی هێنابو لـە خزمەکانی فیرعەون ووتی: ئەی تاقمی من: بەڕاستی لـەسەر ئێـوە هەیـە کـە بێـت بـۆ سەرتان ڕۆژێ وێنەی ڕۆژی ئەو تاقمانەی یەکیان گرتبو لـەدژی پێغەمەرەکانی خۆیان و، توشی سزا بون و، ئێوەیش وەك ئەوان سزاتان بدرێ.

﴿ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِن بَعْدِهِمْ وَمَا اللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴾ ئەو تاقمانە ڕەوشتیان بە وێنەی ڕەوشتی تاقمەکانی فیرعەون و عاد و سەمود و کەسانێکی ئەوتۆ لە دوای ئەوانەوە بوون، ئازاری پێغەمەرکانی خۆیانیان ئەدا و لە جیهاندا توشی سزابون، ئێوەیش ئەگەر واز لە ئازاری موسا ئەبەن توشی سزا ئەبن و، خوا نایەوێ سزای بەندەکانی خۆی بدا و، زۆر میهرەبان و خاوەنی بەزەییە بۆیان.

ئەو پیاوە باوڕدارە بەرگری لە موسا ئەکرد بە شێوەیەکی شیرین و ئامۆژگاریەکی کاریگەر بو یەکەم جار موسای لە گوناهـ دور ئەخستەوە، دووهەم جار دوژمنی موسای ئەترسان لە ئازار بەهۆی بەدرۆخستنەوەی موسا. سێهەم جار چاکە خوای بیر ئەخستەوە، دوای ئەوانە و، دوای ئەوە ئەگەر واز لە بێ باوەڕی نەیەرن لە جیهاندا سزای‌یان ئەدرێ، لە سزای ڕۆژی دواییش ئەیان ترسێنێ و ئەڵێ:

﴿ وَيَا قَوْمِ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ التَّنَادِ ﴾ ئەی تاقمی من: بەڕاستی من ترسم لەسەر ئێوە هەیە لە سزای ڕۆژی دوایی کە توشی ئێوە ئەبێ کاتێ ئێوە دەنگێکی سەختی ڕاست ئەبیسن و، لە گۆڕەکانتان دێنەدەرێ و بانگی ئادەمیزاد ئەکرێ.

﴿ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ اللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ هَادٍ ﴾ ڕۆژی دوایی ئەو ڕۆژەیە واز لە ئێوە ئەهێرێ و، ئێوە هەوڵی ڕاکردن ئەدەن لەبەر سزای گەرمی ئاگری دۆزەخ، لەو ڕۆژەدا بۆ ئێوە نیە هیچ کەسێ بتانپارێزێ لە سزای خوا و، هەرکەسێ ڕێگەی ڕاست نەگرێ بە ئارەزۆی خۆی، خوا لە ڕێگەی ڕاست لای ئەدا، دوایی هیچ کەسێ نیە شارەزای ڕێگەی ڕاستی بکا، هەرکەسێ زەهر بخواتەوە بێگومان خوا ئەیکوژێ.

﴿ وَلَقَدْ جَاءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا زِلْتُمْ فِي شَكٍّ مِّمَّا جَاءَكُم بِهِ ﴾ وە بەڕاستی لەمەوبەر یوسفی کوڕی یەعقوب هاتبو بۆلای باوباپیری ئێوە بە چەندین بەڵگەی ڕوون لەسەر داواکاریکەی خۆی، دوایی ئێوە لانەچوون لە گومان لە پێغەمەرایەتی یوسفدا، هەروەك ئێوە ئێستا گومانتان هەیە لە پێغەمەرایەتی موسادا.

یوسوف بە زمانی عیبری یانێ (زۆر بێ) دایکی ناوی ناوە بەو ناوە لەبەر ئەوەی کوڕی زۆرتری بەدوادا بێ.

﴿ حَتَّى إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ اللَّهُ مِن بَعْدِهِ رَسُولًا ﴾ هەروەها ئێوەبەردەوامبوون لەسەر ئەو گومانە هەتا کاتێ یوسوف مرد، ئێوە بەخۆشحاڵیەوە ووتتان خوا لە دوای یوسف پێغەمەری تر نانێری و ڕزگارمان بو لەسەر داواکاری پێغەمەران، هەتا کاتێ زیندووبونەوە.

﴿ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴾ هەر بەو جۆرە خوا ئەوانی لادا لە ڕێگەی ڕاست هەر کەسێ لە سنوور لابدا، گومانی هەبێ لە ئایینی خۆیا . بەسەربەستی خۆیان بێ باوەڕیان هەڵبژاردووە.

﴿ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ ﴾ ئەو کەسانە لە سنوور لا ئەدەن کەسانێکی ئەوتۆن گفتوگۆی نابەجێ ئەکەن لەبارەی ئەو کارە یەك خەرانەوە خوا لەسەر دەستی پێغەمەران پەیدای کردوە، بە بێ ئەوەی ئەو کەسانە بەڵگەیەکیان هەبێ خوا پێی بەخشیبن. بەڵکو دوای ئاینی باپیری خۆیان کەوتوون.

﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ اللَّهِ وَعِندَ الَّذِينَ آمَنُوا كَذَلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَى كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴾ ئەو گفتوگۆ بێ جیگانە دوژمنایەتی گەورەیە لای خوا، دوریان ئەخاتەوە لە میهرەبانی و بەزەیی خۆی و سزای بۆ ئامادەکردوون و، دوژمنایەتی گەورەیە لای باوەڕداران و، ڕقی زۆرتر پەیدا ئەکا بۆیان لەو کەسانە، هەر بەو جۆرەی خوا مۆری داوە بەسەر دڵی ئەو کەسانەی گفتوگۆی نابەجێ ئەکەن خوا مۆر ئەدا لەسەر دڵی هەمو کەسێ خۆی بەگەورە بزانێ و باوەڕ بە خوا و پێغەمەرانی خوا نەهێنێ، یاخی بێ لە فەرمانی خوا و پێغەمەران.

وَقَالَ فِرْعَوْنُ
يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ
وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ
وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ
ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾
يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ
دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ
وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ
فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾

﴿ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا هَامَانُ ابْنِ لِي صَرْحًا لَّعَلِّي أَبْلُغُ الْأَسْبَابَ أَسْبَابَ السَّمَاوَاتِ ﴾ وە فیرعەون بە هامانی ووت: ئەی هامان: تۆ کۆشکێکی زۆر بەرز بۆ من دروست بکە بە جۆرێ بێ زۆر

کەس بیبینێ بۆ ئەوەی من بەرز بمەوە بۆلای ئاسمان و بگەمە ئەو دەرگایانە و، ئەو ڕێگایانە ئەڕۆن بۆلای ئاسمان.

﴿ فَأَطَّلِعَ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ كَاذِبًا ﴾ دوایی من بڕوانم بۆلای خوای موسا و بزانم ئەو خوایە چۆنە موسا باسی ئەکا و، بەڕاستی من گومانم وایە موسا درۆ ئەکا خوا هەیە، هەر ئەوە شایستەی پەرستنە، فیرعەون ئەیزانی خوا نابینێ و ئەو دەستەلاتەی نیە. بەلام ئەیزانی زۆربەی زۆری دانیشتووانی میسر کەم ئەقڵن و بڕوای پێ ئەکەن.

﴿ وَكَذَلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوءُ عَمَلِهِ وَصُدَّ عَنِ السَّبِيلِ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِي تَبَابٍ ﴾ وە هەر بەو جۆرەی ڕازێنراوەتەوە بۆ بێباوەڕان کردەوە خراپەکانیان. بۆ فیرعەونیش ڕازێنراوەتەوە بۆی کردەوەی خراپی خۆی و، داوای خوایەتی ئەکا و، وەرگێڕراو لە ڕێگە بەهۆی نەزانین و کەم ئەقڵی دانیشتووانی میسرەوە کە ئەیان پەرست و، پیلانی فیرعەون لە دژی موسا هیچ سودێکی بۆخۆی نیە جگە لەوەی توشی زیانی بکا و، ڕسوای جیهان ئەبێ و لەناو ئەچێ.

﴿ وَقَالَ الَّذِي آمَنَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ الرَّشَادِ ﴾ وە ئەو کەسەی ئەوتۆ باوەڕی هێنابو ووتی: ئەی تاقم و خزمانی من: ئێوە دوای گفتوگۆ ڕاستی من بکەون ڕێگەی ڕانوموێتان شارەزا ئەکەم و ئەتانبا بۆلای بەهەشت و ڕزگارتان ئەبێ.

﴿ يَا قَوْمِ إِنَّمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَإِنَّ الْآخِرَةَ هِيَ دَارُ الْقَرَارِ ﴾ ئەی تاقمی من: بەڕاستی ژیانی ئەم جیهانە بەشێوەیەکی کاتێ ئادەمیزاد پێی ڕائەبوێرن و، بەڕاستی هەر ڕۆژی دوایی جێگەیەکی نەبڕاوە و بەردەوامە.

﴿ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَى إِلَّا مِثْلَهَا وَمَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُولَئِكَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ هەرکەسێ کردەوەی خراپی کردبێ، دوایی ئەو کەسە پاداشتی نادرێتەوە مەگەر هەر بەوێنەی پاداشتی خراپەکە خۆی و، هەرکەسێ کردەوەی چاکی کردبێ لە پیاو یا لە ژن و، ئەو کەسە باوەڕی هێنابێ، دوایی ئەو کەسانە ئەچنە ناو بەهەشت لەناو بەهەشتا بەبێ ئەندازە خواردەمەنییان دەرخوارد ئەدرێ.

وَيَٰقَوْمِ مَا لِيٓ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدْعُونَنِيٓ إِلَى
ٱلنَّارِ ﴿٤١﴾ تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِۦ مَا لَيْسَ
لِي بِهِۦ عِلْمٌ وَأَنَا۠ أَدْعُوكُمْ إِلَى ٱلْعَزِيزِ ٱلْغَفَّٰرِ ﴿٤٢﴾ لَا جَرَمَ
أَنَّمَا تَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُۥ دَعْوَةٌ فِي ٱلدُّنْيَا وَلَا فِي ٱلْأٓخِرَةِ
وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ

فَسَتَذْكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِىٓ إِلَى
ٱللَّهِ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٤٤﴾ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ
مَا مَكَرُوا۟ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرْعَوْنَ سُوٓءُ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٥﴾ ٱلنَّارُ
يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓا۟
ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾

﴿ وَيَا قَوْمِ مَا لِي أَدْعُوكُمْ إِلَى النَّجَاةِ وَتَدْعُونَنِي إِلَى النَّار ﴾ وە ئەی تاقم و خزمانی من: ئێوەی بت پەرست هەواڵ بدەن بە من لەبارەی چۆنیەتی من لەگەڵ ئێوە: من بانگی ئێوە ئەکەم بۆ چاکەیەکی ئەوتۆ ئێوە ڕزگار ئەکا لەناو چون و لە سزای خوا کە باوەڕهێنانە و، ئێوە بانگی من ئەکەن بۆلای ئاگری دۆزەخ.

﴿ تَدْعُونَنِي لِأَكْفُرَ بِاللَّهِ وَأُشْرِكَ بِهِ مَا لَيْسَ لِي بِهِ عِلْمٌ وَأَنَا أَدْعُوكُمْ إِلَى الْعَزِيزِ الْغَفَّار ﴾ ئێوە بانگی من ئەکەن بۆ ئەوەی باوەڕ بە خوا نەهێنم و، من بکەم بە هاوبەش بۆ خوا لە پەرستندا شتێ من هیچ جۆرە زانیاریەکم بە خوایەتی ئەو شتە نەبێ و، چۆن شایستەیە نەی‌ناسم و من بڕوای پێ بهێنم؟ وە من بانگی ئێوە ئەکەم بۆلای ئەوەی بڕوا بە خوایە بهێنن زۆر بە دەستەڵات و بەتوانایە، لێبوردنی زۆرە بۆ ئەو باوەڕدارانە داوای لێخۆشبوون بکەن.

﴿ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدْعُونَنِي إِلَيْهِ لَيْسَ لَهُ دَعْوَةٌ فِي الدُّنْيَا وَلَا فِي الْآخِرَةِ ﴾ بێگومان بەڕاستی ئێوە بانگی من ئەکەن بۆلای پەرستنی شتێ بەوێنەی فیرعەون و جگەی فیرعەون، بۆ ئەو شتە نیە بتوانێ وڵامی هیچ کەسێ بداتەوە نە لە جیهاندا و لە دوارۆژدا؛ ئەو بتانە داوای ئەوە ناکەن پەرستنیان بۆ بکرێ یا شایستەی پەرستن نین و لە پاشەڕۆژیشدا بێزاری خۆیان دەرئەبڕن لەو کەسانە ئەوانیان پەرستوە.

﴿ وَأَنَّ مَرَدَّنَا إِلَى اللَّهِ وَأَنَّ الْمُسْرِفِينَ هُمْ أَصْحَابُ النَّار ﴾ وە بەڕاستی گەڕانەوەی ئێمە لە ڕۆژی دواییدا هەر بۆ لای خوایە و، نەك بۆلای فیرعەون و جگە فیرعەون و بەڕاستی ئەو کەسانەی لە سنور دەرئەچن و خوا ناپەرستن دانیشتووی ناو ئاگری دۆزەخن.

﴿ فَسَتَذْكُرُونَ مَا أَقُولُ لَكُمْ وَأُفَوِّضُ أَمْرِي إِلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴾ دوایی کاتێکی ئەوتۆ دێت ئێوە باسی ڕاستی شتێ ئەکەن کە من ئێستا بە ئێوە ئەڵێم و، من هەموو کارێکی خۆم هەواڵەی لای خوا ئەکەم. بەڕاستی خوا بەندەکانی خۆی ئەبینێ و چاك و خراپیان ئەزانێ. فیرعەون ویستی ئازاری ئەو کەسە باوەڕدارە بدا، لەو بارەوە خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ ﴾ دوایی خوا کەسە باوەڕدارەی پاراست لە ئەنجامی فێڵی تاقمەکەی فیرعەون، لە پیلانی خراپی ئەوان و، سزایان لە لای خواوە بۆهاتە خوار و لەناوچون و، ئاوی‌دەریا ئەم لاو لای لێ‌گرتن و هەموویان خنکان.

﴿ النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ ﴾ ئەفەرموێ ئەوسزا خراپە بریتیە لە ئاگرێ تاقمەکانی فیرعەون بەیانی و ئێوارە نومایش ئەکرێن بەسەر ئەو ئاگرەدا، ئەو نومایشە سزایە بۆ گیانیان هەتا ڕۆژی دوایی و، دوایی کاتێ ڕۆژی دوایی پەیدا بو، لە لایەن فریشتەکانەو ئەبێژرێ: ئێوەی تاقمی فیرعەون بچنە ناو سەختترینی سزای ئاگر.

وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي
النَّارِ فَيَقُولُ الضُّعَفَٰٓؤُا لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوٓا إِنَّا كُنَّا
لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ النَّارِ
﴿٤٧﴾ قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوٓا إِنَّا كُلٌّ فِيهَآ إِنَّ اللَّهَ
قَدْ حَكَمَ بَيْنَ الْعِبَادِ ﴿٤٨﴾ وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ
جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ الْعَذَابِ ﴿٤٩﴾
قَالُوٓا أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِالْبَيِّنَٰتِ قَالُوا
بَلَىٰ قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَٰٓؤُا الْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ
﴿٥٠﴾ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ ءَامَنُوا فِي الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا
وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّٰلِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ
وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ الدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى
الْهُدَىٰ وَأَوْرَثْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ الْكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدًى

وَذِكْرَىٰ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴿٥٤﴾ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ ﴿٥٥﴾

﴿ وَإِذْ يَتَحَاجُّونَ فِي النَّارِ فَيَقُولُ الضُّعَفَاءُ لِلَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُنَّا لَكُمْ تَبَعًا فَهَلْ أَنتُم مُّغْنُونَ عَنَّا نَصِيبًا مِّنَ النَّارِ ﴾ تۆ بیری کاتێ بکەرەوە دانیشتوانی ناو ئاگری دۆزەخ گفتوگۆ لەگەڵ یەکتری ئەکەن، دوایی ئەفەرموێ ئەو کەسانەی بێدەسەڵات و بچووك بوون بەو کەسانە ئەڵێن: داوای گەورەییان ئەکرد لە جیهاندا: ئێمە بەڕاستی دواکەوتوی ئێوە بووین لە جیهاندا، دوایی ئایا ئێوە هەڵناگرن بەشێ لەو ئاگرە بەهۆی ئێوەوە توشی ئێمە بوە؟

﴿ قَالَ الَّذِينَ اسْتَكْبَرُوا إِنَّا كُلٌّ فِيهَا إِنَّ اللَّهَ قَدْ حَكَمَ بَيْنَ الْعِبَادِ ﴾ ئەو کەسانەی خۆیان لە جیهاندا بە گەورە دائەنا لە وەڵامی بچووکەکاندا ئەڵێن: بەڕاستی ئێمە هەموومان لەناو ئاگری دۆزەخداین، هیچ لایەکمان سزای ئەوی ترمان هەڵناگرین، بەڕاستی خوا فەرمانی خۆی لە نێوان بەندەکانی خۆیا داوە و، فەرمانی خوا ناگۆڕێ، بێباوەڕانی خستوەتە ناو ئاگر، باوەڕدارانی خستوەتە ناو بەهەشت.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ فِي النَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ادْعُوا رَبَّكُمْ يُخَفِّفْ عَنَّا يَوْمًا مِّنَ الْعَذَابِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ لەناو ئاگردان بە پاسەوانانی دۆزەخ ئەڵێن: ئێوە داوا بکەن لە پەروەردگاری خۆتان ڕۆژێ سزای ئاگر سوك بکا لەسەر ئێمە.

﴿ قَالُوا أَوَلَمْ تَكُ تَأْتِيكُمْ رُسُلُكُم بِالْبَيِّنَاتِ قَالُوا بَلَىٰ ﴾ پاسەوانانی دۆزەخ ئەڵێن: ئایا پێغەمەرەکانتان نەهاتبوون بۆلای ئێوە بە چەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر ڕاستی داواکانیان. بێ باوەڕان ئەڵێن: بەڵێ. هاتوون بۆلای ئێمە و، ڕاستی ئەم ڕۆژەیان بە ئێمە ڕاگەیاندووە. ئێمە بەدرۆمان خستنەوە.

﴿ قَالُوا فَادْعُوا وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ ﴾ پاسەوانانی دۆزەخ ئەڵێن: دوایی ئێوە خۆتان بۆ خۆتان بپاڕێنەوە بۆ سوك کردنی ئەندازەی ڕۆژی سزا، ئێمە دەستوورمان پێنەدراوە بۆ ئێوە بپاڕێینەوە، هەرچۆنێ بێ پاڕانەوەی بێباوەڕان لە پوچی و بێسودی دان و لەناو گومراییدایە، ئێوە باوەڕتان نەهێناوە و، پاڕانەوەتان لێوەرناگیرێ. خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ ﴾ بەڕاستی ئێمە یاریدەی پێغەمەرەکانی خۆمان و، کەسانێکی ئەوتۆ ئەدەین باوەڕدارن لە ژیانی جیهان و لە ڕۆژی دواییدا، ئەو ڕۆژەی فریشتەکان و زانایان و ئەندامەکانیان شایەتی ئەدەن لەسەر تاوانباران کە فەرمانی خوایان پێ ڕاگەیەنراوە و، شایەتیش ئەدەن باوەڕداران وەڵامی پێغەمەرەکانیان داوەتەوە، بێباوەڕان بەدرۆیان خستنەوە.

﴿ يَوْمَ لَا يَنفَعُ الظَّالِمِينَ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّار ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە بیانوهێنانەوەی ستەمکاران هیچ سودێ بەوان ناگەیەنێ و بۆ ئەوان هەیە دوور بن لە میهرەبانی و بەزەیی خواو، بۆیشیانە جێگەی خراپ کە بریتیە لە دۆزەخ، ئیتر ئەو ڕۆژەیە پەشیمان بوونەوەیان بێسوودە.

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْهُدَى وَأَوْرَثْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ ﴾ دوای ئەوەی خوای مەزن باسی یاریدانی پێغەمەران و باوەڕدرانی کرد ئاماژەیش ئەکا بۆلای موسا و باوڕدارانی بەنوئیسرائیلی و ئەفەرموێ: ئێمە هەموو کاتێ شارەزایی یاسای ئایینمان بەخشی بە موسا و، ئێمە لەدوای موسا نامەیەکمان کرد بە میرات بۆ بەنوئیسۆائیلاٚن ئەو نامەیەیش تەوراتە.

﴿ هُدًى وَذِكْرَى لِأُولِي الْأَلْبَابِ ﴾ لەبەر ئەوەی شارەزایی ئامۆژگارکەر بێ بۆ بەنوئیسرائیلی و فێری یاسا و دەستوری خوایان بکا.

﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَار ﴾ دوایی تۆ ئارام بگرە لەسەر ئازاری بت پەرستانی قورەیش. بەڵێنی خوا ڕاستە داوییەتی بەتۆ، بێگومان خوا تۆ سەرئەخا بەسەر دوژمنانی خۆتا و، تۆ داوای لێخۆشبوون بکە لە خوا بۆ گوناهەکانت و، تۆ بەردەوامبە لەسەر پاکێتی و سوپاس بۆ پەروەردگاری خۆت ئێوارانو بەیانیان و هەموو کاتێ دوری بخەرەوە لە کاری ناشایستە.

بۆ زانین: بەراوردی لە نێوان جوەکانی سەردەمی موسا و لە نێوان جوەکان ئێستادا و، بەراوردێ لە نێوان تەوراتێ نێرراوە بۆلای موسا و لە نێوان تەوراتێ ئێستا تەملودی جوەکانی ئەم سەردەمە، بێگومان تەورات و جوەکانی موسا لایان وابوە تەورات نامەی خوایە و، جیاوازی لە نێوان ئادەمیزادا نیە بە جگەیلە خواترسان. بەڵام تەورات تەملودی جوەکانی ئێستا ئەڵێن: جوەکان هەڵبژاردە و گەلی خوان و، جگەی ئەوان خوا بۆ ئەمانی دروست کردوە و زۆر شتی تری نارەوا. هەروەها مانای ووشەی ئیسرائیل لای موسڵمانان بە زمانی عیبری یانێ بەندەی خوا، لای جوەکانی ئێستا یانێ زۆران لەگەڵ خوادا ئەگرێ. بەڵگەیش (سفر التكوين)[٢] ئەسحاحی (٣٢) ئایەتی (٢٨) ئەڵێ: (إسرائيل٩ بەمانا (يُصارِعُ الله) زۆران ئەگرێ لەگەڵ خوادا، تەماشای تەفسیری (الكاشف) بکە بەرگی (٦) لاپەڕە (٤٦٠).

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ

خَلْقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾
وَمَا يَسْتَوِى ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟
ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلْمُسِىٓءُ ۚ قَلِيلًا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾
إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَءَاتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ
لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ
إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ
دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ لِتَسْكُنُوا۟
فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبْصِرًا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ
وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ
ٱللَّهُ رَبُّكُمْ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ
﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤْفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ
﴿٦٣﴾

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَانٍ أَتَاهُمْ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ گفتوگۆی نابەجێ ئەکەن لەبارەی ئایەتەکانی نامەی خوداوە، بەبێ ئەوەی بەڵگە هاتبێ بۆلایان بتوانن ئایەتەکانی قورئان پوچ بکەنەوە.

﴿ لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ بەڕاستی دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی گرانترە لە دروستکردنی ئادەمیزاد و، بەڵام زۆرترینی ئادەمیزاد نازانن، باشتێ زۆر گەورەبێ ئاسانە لای خودا، هەمو شتێکی لە بونەوەران لەنەبونەوە هێناویتیە بوونەوە، بەبێ ئەوەی وێنەیان بوبێ. توانای خوا نایەتە ژمارە هەتا زانستی بەرەو پێشتر بڕوا، ناوەڕۆکی قورئان زۆرتر پەرەئەسێنێ لە مێشکی مرۆڤدا لەلایەن ڕێز و نرخەوە. بۆ نموونە: زانایانی پێشوو ووتویانە: ئادەمیزاد سەرسوڕهێنەرترینی بونەوەرانە لەسەرە و لە خوارەوە. وتویانە زەوی مەرکەزی بونەوەرانە. بەڵام پاشان ئەقڵی ئەلکترۆنی ئامێری تری زانستی هاتە کایەوە دەریان خست بەڕاستی نە ئادەمیزاد سەرسوڕهێنەرترینی بونەوەرانە وە نە زەوی چەقی

بونەوەرانە. چونکە لە بونەوەراندا مەلاین مەلاین پیشـتوێنەی ئاسمـانی هەیـە (المجـرات) کـە بـە کوردی پێی ئەوترێت (کاکێشان) لەهەریەکە لەو پشتوێنانەدا مەلاین مەلاین ئەستێرەیان تێدایە. لەهەریەکە لەو ئەستێرانە مەلاین مەلاین بونەوەریان تێدایە، خودا نەبێ کەس ژمارەیـان نازانـێ. ڕاژەی زەوی بەرامبەر بونەوەرانە وەك ڕاژەی مێرولیەك بەرامبەر زەوی، بگرە بچـووك تریشـە. بەلاّم ئادەمیزاد بەرانبەر بەو بونەوەرانە ئێمە بیـانزانین سەرسـوڕهێنەرترینی هەمویانـە لـە لایـەن زانست و هۆش و هەستەوە.

﴿ وَمَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ وَالَّذِيـنَ آمَنُـوا وَعَمِلُـوا الصَّالِحَـاتِ وَلَـا الْمُسِـيءُ قَلِيلًـا مَّـا تَتَذَكَّرُونَ﴾ وە کەسێکی ئەوتۆ کوێر بێ و ئاسمانەکان و زەوی و بونـەوەرانی نـەبینێ و، کەسـێ چاوی بە بونەوەران بکەوێ وەك یەك نـین و، هـەروەها کەسـانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان هێنابـێ و کردەوە چاکەکانی کردبێ و کەسانێ خراپەیان کردبێ یەکسـان نـین لای ئـادەمیزادێ خـاوەن ئەقلّبێ، ئامۆژگاری وەرگرتن و گرنگی دان بەتوانای خودا زۆر کەمە لای ئێوە.

﴿ إِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ بەڕاستی ئەو کاتـە ئـادەمیزاد پرسیاری کارەکانیان لێئەکرێ دێت، گومان لە هاتنیا نیە و، بەلاّم زۆرترینی ئادەمیزاد باوەڕ بـە هاتنی ئەو کاتە ناکەن.

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُـمْ إِنَّ الَّذِيـنَ يَسْتَكْبِرُونَ عَـنْ عِبَـادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَـهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ وە پەروەردگاری ئێوە ئەفەرموێ ئێوە بە نیازی پاکەوە من بپەرستن و، داوای لێبوردنم لێبکەن وولاّمتان ئەدەمەوە. بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ خۆیان بەگەورە دائەنێن لە بـۆ پەرسـتنی من، ئەچنە ناو دۆزەخ بەبێ نرخی و داماوی.

﴿ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُوا فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا ﴾ خـوا کەسـێکی ئەوتۆیـە شـەوی دروستکردوە بۆ سودی ئێوە، بۆ ئەوەی ئێوە پشوبدەن و مـاندوی ڕۆژتـان نـەمێنێ و لـەشـەودا ئارام بگرن و، ڕۆژی دروست کردوە بۆتـان ڕونـاکی پـەخش بکـا بۆتـان و بگـەڕێن بـەدوای پەیداکردنی هۆی ژیانتانا و توشی ئازار نەبن.

﴿ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّـاسِ لَـا يَشْـكُرُونَ ﴾ بەڕاسـتی خـوا خـاوەنی چاکەی زۆرە بەسەر ئادەمیزادەوە و، بەلاّم زۆرترینی ئادەمیزاد سوپاسی چاکەکانی خوا ناکەن.

﴿ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ لَّا إِلَهَ إِلَّا هُـوَ فَـأَنَّى تُؤْفَكُـونَ ﴾ ئەو خوایـە شـەو وڕۆژی دروست کردوە ئەو خودایە دروست کەری هەموو شتێکە، هیچ خوایـە نیـە شـایانی پەرسـتنبێ جگە لەو دوایی ئێوە چۆن لادراون لە پەرستنی من بۆلای جگەی من.

﴿ كَذَلِكَ يُؤْفَكُ الَّذِينَ كَانُوا بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴾ هـەر بـە وێنـەی وەرگێڕانـەوەی ئێـوە، لادراون لەپەرستنی خوا کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیـان بەبەڵگـە ئاشـکرا و یـەك خـەرەکانی ئێمـە ناهێنین و بەدرۆیان ئەخەنەوە.

ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ
بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ
ٱلطَّيِّبَٰتِ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ
ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلْحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ
مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾ قُلْ
إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ
ٱلْبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾
هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ
يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا
شُيُوخًا وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ وَلِتَبْلُغُوٓا أَجَلًا مُّسَمًّى
وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُحْيِۦ وَيُمِيتُ فَإِذَا
قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾

﴿ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاء بِنَاء ﴾ خودا كەسێكی ئەوتۆیە زەوی دروست كردوە بۆ سودی ئێوە بە جۆری ئێوە لەسەری دانیشن بەبێ ئازار و، ئاسمانی دروستكردوە بەجۆرێ یارمەتی ئێوە بدا بۆ پەیداكردنی هۆی ژیان و گوزەرانتان و، وەك گومەزێ وایە بەسەرتانەوە.

﴿ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ ﴾ وە خودا ئێوەی ئادەمیزادی دروستكردوە بەشیرین شێوە بە بالآیەكی رێك و پێك و بە چەند ئەندامێ لە نێوان خۆیانا شیاوی یەكتری بن لە مندالآنی دایكتانا، دوایی خوا ئێوەی دروستكردوە بە شیرینترین شێوەیە بۆ ئێوە،بەجۆرێ ئێوە بتوانن ئەو شتەی لە ئاسمان و زەویدان بەكاریان بهێنن بۆ پێویستی خۆتان و، خودا بەخشیویە بە ئێوە پاكترین و خۆشترین خواردەمەنی، چاكترە لەوەی داویە بە جگەی ئێوە.

﴿ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾ ئەو كەسەی ئەو هەموو شتانەی كردوە، خوایەكە پەروەردگاری ئێوەیە دروست نیيە كەسێ تر بكرێ بەخوا، دوایی ئێوە ئەو خودایە پاكە لە هەموو شتێكی ناشایستە پەروەردگاری هەموو بوونەوەرانە.

﴿ هُوَ الْحَيُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ فَادْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە هەر زیندووبوە و نامرێ، هیچ خوایە نیە شایانی پەرستنبێ جگە ئەو، دوایی ئێوە هەر ئەو خودایە بپەرستن، بەنیازی پاکەوە، هەر بۆ خوایە سوپاس و ستایش بکەن، پەروەردگاری هەموو بونەوەرانە، هەرتەنها بۆلای ئەو روبکەن.

﴿ قُلْ إِنِّي نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ الَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَمَّا جَاءَنِيَ الْبَيِّنَاتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرْتُ أَنْ أُسْلِمَ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ تۆ بڵێ: بە بت پەرستانی قورەیش کە داوات لێئەکەن واز لە ئایینی ئیسلام بهێنێ: بەڕاستی قەدەغەکراوە لە من کە بپەرستم ئەو شتانەی ئەوتۆ ئێوە ئەیان پەرستن لە جگەی خودا لە کاتێکەوە هاتوە بۆلای من چەندین بەڵگەی ئاشکرا و ڕاست لە لایەن پەروەردەکەری خۆمەوە و، فەرمان بە من دراوە کە مل کەچ بم بۆ پەروەردەکەری هەموو بونەوەران.

﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا شُيُوخًا ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە ئێوەی دروست کردوە لە خاك بۆ یەکەم جار و یەکەم کەس، لە پاشان لەتۆ و ئاوێ لە لایەن باوکتانەوە ئەڕژێتە ناومندالانی دایکتانەوە، لە پاشان لە خوێنێکی خەست، لە پاشان ئێوە بە مندالی لە منداڵدانی دایکتان ئەتان هێنێتە دەرەوە، لە پاشان ئێوە ئەهێڵێتەوە لەبەر ئەوەی ئێوە بگەن بەهێز و توانای خۆتان، لەپاشان لەبەر ئەوەیئێوە پیربن.

﴿ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّى مِن قَبْلُ وَلِتَبْلُغُوا أَجَلًا مُّسَمًّى وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ وە هەندێك لە ئێوە کەسێکە ئەمرێ بەرلەوەی پیربێ، خوای مەزن ئەو کارانە ئەکا هەتا کاتێ ئێوە ئەگەن بەکاتێکی کۆتایی پێهاتنی تەمەنی دیاریکراوتان و، بۆ ئەوەی ئێوە بیر بکەنەوە لەدروستکەری خۆتان و لەمردنتان تەمێ خوار بن.

﴿ هُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ فَإِذَا قَضَى أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُ كُن فَيَكُونُ ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە بونەوەرانی زیندو کردوەتەوە یەکەم جار لە نەبونەوە و ئەیان مرێنێ. دوای کۆتایی تەمنیان، دوایی بەڕاستی خودا بیەوێ شتێ دروست بکا، ئەفەرموێ ببە، دوایی کتوپڕ ئەوشتە ئەبێ.

أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ
يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ أَنَّى يُصْرَفُونَ (٦٩) الَّذِينَ كَذَّبُوا
بِالْكِتَابِ وَبِمَا أَرْسَلْنَا بِهِ رُسُلَنَا فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ
(٧٠) إِذِ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلَاسِلُ يُسْحَبُونَ (٧١)
فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ (٧٢) ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ

مَا كُنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا بَل لَّمۡ
نَكُن نَّدۡعُواْ مِن قَبۡلُ شَيۡـٔٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾
ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمۡ تَفۡرَحُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ
تَمۡرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ
مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۚ فَإِمَّا
نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيۡنَا يُرۡجَعُونَ ﴿٧٧﴾
وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ مِنۡهُم مَّن قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ
وَمِنۡهُم مَّن لَّمۡ نَقۡصُصۡ عَلَيۡكَۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ
بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُ ٱللَّهِ قُضِيَ بِٱلۡحَقِّ وَخَسِرَ
هُنَالِكَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٧٨﴾

﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِ اللَّهِ أَنَّى يُصْرَفُونَ ﴾ ئایا تۆ نەتڕوانیوەتەوە بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ گفتوگۆی نابەجێ ئەکەن بۆ پوچ کردنەوەی نیشانە ئاشکراکانی قورئانی خودا چۆن وەرگێڕاون لە پەرستنی خواوە بۆلای بت پەرستی.

﴿ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِالْكِتَابِ وَبِمَا أَرْسَلْنَا بِهِ رُسُلَنَا فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆن بەدرۆیان خستوەتەوە نامەی خودا کە قورئانە و، بەدرۆیان خستوەتەوە شتێ ئێمە پێغەمەرەکانی خۆمانمان بەو شتەوە ناردو بۆلای ئادەمیزاد کە پەرستنی خوایە بەتەنها، دوایی ئەو بێباوەڕانە ئەزانن بە پوچی شتێ لەسەری بوون.

﴿ إِذِ الْأَغْلَالُ فِي أَعْنَاقِهِمْ وَالسَّلَاسِلُ يُسْحَبُونَ فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ ﴾ کاتێ ملوانکە ئاسن و چەند زرێ تر ئەکرێتە ملیان، ڕائەکێشرێن بە ناوی دۆزەخدا. لەپاشان لەناو ئاگرا ئەسوتێنرێن.

﴿ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ﴾ لە پاشان ئەبێژرێ بەو کەسانە لە لایەن پاسەوانەکانی دۆزەخەوە: لە چ جێگەیەکن شتێ ئێوە ئەتان کرد بە هاوبەش بۆ خودا لە پەرستندا لە جگەی خودا، بەو ئومێدەی لە کاتی تەنگانەدا بگاتە فریایان، بۆ هاواریان لێناکەن؟

﴿ قَالُوا ضَلُّوا عَنَّا بَل لَّمْ نَكُن نَّدْعُو مِن قَبْلُ شَيْئًا كَذَٰلِكَ يُضِلُّ اللَّهُ الْكَافِرِينَ ﴾ دانیشتوانی دۆزەخ ئەڵێن: ئەوەی ئێمە ئەمان کرد بە هاوبەش بۆ خوا لە ئێمە ونبون و نایان بینین و بەڵکو بۆ ئێمە دەرکەوت. شتێکمان نەپەرستوە لە جیهاندا شایستەی پەرستن بوبێ، هەر بەو جۆرەی خوداکانیان لێوونبوون هەروایش خودا ڕێگە ڕاست لە بێباوەڕان ون ئەکا لە ڕۆژی دووایی‌دا.

﴿ ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَمْرَحُونَ ﴾ ئەو سزایە توشی ئەوان ئەبێ بەهۆی شتێکەوە بوە ئێوە بەو شتە شادمان نەبون لە جیهاندا و، گرنگیتان پێ ئەدا و وازتان لە ڕابواردنی بەردەوامی دوارۆژ هێناوە بە جۆرێکی ناڕەوا و، بەو بۆنەیەشەوە خۆتانتان بەو شتەوە هەڵئەکێشا بە ئەوپەڕی شانازی و خۆشییەوە. ئەو شانازی کردنە بە سامان و پلەوپایەی جیهانەوە تایبەت نیە بە بێباوەڕانەوە و ئێمەی باوەڕداریش ئەگرێتەوە، جیاوازییان ئەوەیە بێباوەڕان بە ئاشکرا و نهێنی بێباوەڕن و، ئێمە بە ئاشکرا باوەڕدارین. بەڵام هەڵپەی زۆریش ئەکەین بۆ سامان.

﴿ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ بە بێباوەڕان ئەبێژرێ لە دوارۆژدا: ئێوە بچنە ناو دۆزەخ لەهەر حەوت دەرگاکانیەوە بەردەوامن لەناو دۆزەخدا، دوایی دۆزەخ خراپترین جێگەیە کە بۆ ئەو بێباوەڕانە خۆیان بە گەورە دائەنا لە جیهاندا، پلەوپایە و سامانی خۆیان بەکارئەهێنا بۆ چەوسانەوەی هەژاران.

﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴾ دوایی تۆ ئارام بگرە لەسەر ئازاری بت پەرستانی قورەیش. بەڕاستی بەڵێنی خوا بۆ تۆ ڕاستە و یاریدە دۆستانی خۆی ئەدا و، تۆڵە لە دوژمنانی ئایین ئەکاتەوە، دوایی نیشانی تۆی بدەین هەندێ لەو سزایانە ئێمە بەڵێنمان پێداوە توشی بت پەرستانی بکەین لە جیهاندا، وەك کوشتنیان و دیل کردنیان لە جیهاندا، بەر لەوەی تۆ بمری، ئەو کاتە بەڵێنی خۆمانمان بەجێ هێناوە و، یا ئەگەر ئێمە تۆ بمرێنین بەر لەوەی سزای ئەوان بدەین لە جیهاندا، دوایی بۆلای ئێمە ئەگێڕینەوە لە پاشەڕۆژدا و سزای سەخت ترینیان توش ئەبێ.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردوە لە پێش تۆ چەندین پێغەمەر، هەندێ لەو پێغەمەرانە کەسێکە ئێمە باسی ئەوان بەسەرهاتی تاقمەکانیانمان بەسەر ئێوەدا خوێندوەتەوە و، لەو پێغەمەرانەیش کەسی وایان هەیە باسمان نەکردوون بۆ ئێوە و، نەمان خوێندوە بەسەر تۆدا لە قورئاندا،

ئەوانەیان بۆمان باس کردویی وەك ئادەم. ئیدریس. نوح. هود. سالح. ئیبراهیم. لوت. ئیسماعیل. ئیسحاق. یەعقوب. یوسوف. ئەیوب. شوعەیب. هارون. یونوس. داوود. سولەیمان. زەکەریا. یەحیا. عیسا. موحەمەد. درودی خوایان لێبێ. ئەوانە هەموویان بەگوێرەی باوەڕی هەموو زانایان پێغەمەری خودان. بۆ ئەمانەی دوای زانایان بیربۆچونیان جیاوازە: هەندێکیان لایان وایە پێغەمەران هەندێ تریان ئەڵێن: پیاوچاکن، ناویان لە قورئاندا براوە، وەك زولکیفل. ئەلیەسەع. لوقمان. عوزەیر. ئیلیاسین.

زانایان ئەڵێن: ژمارەی پێغەمەران (١٢٤) هەزار پێغەمەرن. هەندێ زانایان ئەڵێن: (٨) هەزارن. چوار هەزاریان بەنوئیسرائیلین، چوار هەزاریان لە جگە بەنوئیسرائیلن. عەلی کوڕی ئەبو تالیب ئەفەرموێ: خودا پێغەمەری لە ڕەش پێستان ناردوە و باسی نەفەرموە لە قورئاندا. زانایان ناوی هەندێ کەسیان ڕوون کردوەتەوە کە لە قورئاندا ناویان نەبراوە، ئیتر پێغەمەربن یا پیاوچاکانی خوابن، هەواڵەی زانیاری خوای مەزنە، وەك: خضر. یوشەع. حزقیل. شەموئیل. شەعیا. ئەرمیا. دانیال. شەمعون. جرجیس. شەمسون.

﴿ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَنْ يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ﴾وە شایانی هیچ پێغەمەرێ نیە کارێکی پەك خەر و نیشانەیەکی ئاشکرا بهێنێ مەگەر بە دەستووری خوا. نەك بە گوێرەی داخوازی بێباوەڕان.

﴿ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ ﴾ دوایی کاتی ڕۆژی دوایی خوا، فەرمانی دادپەروەری خۆی ئەدا لە نێوان ئادەمیزادا بەجۆرێکی دادپەروەری، ئەو کاتە باوەڕداران قازانج ئەکەن و بێباوەڕان توشی زیان ئەبن ئەو کەسانەی ئەوتۆ داوای کاری پەك خەریان ئەکرد لە پێغەمەر بە گاڵتەوە.

ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡعَٰمَ
لِتَرۡكَبُواْ مِنۡهَا وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمۡ فِيهَا
مَنَٰفِعُ وَلِتَبۡلُغُواْ عَلَيۡهَا حَاجَةً فِى صُدُورِكُمۡ وَعَلَيۡهَا وَعَلَى
ٱلۡفُلۡكِ تُحۡمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَأَىَّ ءَايَٰتِ
ٱللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِى ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِنۡهُمۡ وَأَشَدَّ
قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلۡأَرۡضِ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ

﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرِحُوا۟ بِمَا عِندَهُم
مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا
رَأَوْا۟ بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ
مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا سُنَّتَ
ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾

﴿ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە دروستی کردوە بۆ سودی ئێوە گیانداره چوارپێکان لە بزن و مەڕ و هوشتر و گا لەبەر ئەوەی ئێوە سواری هەندێکیان بن و، لە هەندێکیان بخۆن شایستەی خواردنن. بێگومان ئەو چوار پێیانە هەیانە بۆ خواردن ئەشێن وەك بزن و مەڕ و، هەیانە بۆ سواری و خواردن ئەشێن وەك هوشتر و ڕەشە وولاخ. بە تایبەتی ناوی ئەو چوارشتانە براوە; چونکە عەرەبەکان زۆرتر ئەو چوارشتانەیان بەکار ئەهێنا، ئەگینا لە جگەی ئەو چوار شتانە گیاندارانی تر هەن بۆ سوار بوون و خواردن ئەشێن.

﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴾ وە بۆ ئێوە هەیە لەو چوارپێیانەدا سودی تر، وەك شیر و پێست و خوری و موو و کورگ و، بۆ ئەوەیش بەسەر هەندێکیانەوە ئێوە بگەن بەمەبەستێ لە دڵتانایە، وەك گواستنەوەی خۆتان و کەل وپەلتان لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیە تر و، لەسەر ئەو چوارپێیانە و لەسەر کەشتی ئێوە هەڵئەگیرێن هەتا بگەن بە مەبەستی خۆتان بەبێ ماندووبوون.

﴿ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ ﴾ وە خودا نیشان ئەدا بە ئێوە چەندین بەڵگە لەسەر توانا و یەکێتی خۆی، دوایی ئێوە چ بەڵگەیەکتان هەیە باوەڕ نەهێنن؟ زۆر ئاشکرایە هەموویان شایستەی ئەوەن ئێوە باوەڕیان پێ بهێنن.

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ ﴾ ئایا دوایی بێباوەڕانی قوڕەیش نەڕۆیشتوون بەناو زەوی جێگەی گەلانی پێشوو، دوایی ئەوان تەماشا بکەن چۆن بوە کۆتایی و ئەنجامی کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش ئەوانەوە بوون، ژمارەیان زۆرتربوە لە بێباوەڕانی مەکەوە، زۆر بەهێزتربوونبۆ ئاوەدان کردنەوەی زەوی پاشماوەی کۆشك و کارگەی پیشەسازییان لە زەویدا لە بێباوەڕانی مەکە زۆرتربوە، بۆ بیر لەوان ناکەنەوە و باوەڕبهێنن و تەمێ خوار بن.

﴿ فَمَا أَغْنَى عَنهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ ﴾ دوایی ئەو شتەی کۆیان کردبوەوە لای نەدان لە سزای خودا، دوایی کاتێ چووبوو بۆلای ئەوانەی پێشوو پێغەمەرەکانی ئێمە بە چەند نیشانە و کاری پەك خەر وە شادمان بون بەو زانیاریە بێنرخە لایان بو، وای لێکردبون بڵێن: زیندوبونەوە و پرسیار و سزا نیە.

﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾ وە سزای خودا هاتە خوارەوە بۆیان و، سزای ئەو شتەی گاڵتەیان پێئەکرد لە جیهاندا و، ئەیان ووت قورئان چیرۆکی ڕابردووانە و، زیندووبوونەوە و ڕۆژی دوایی درۆیە ئەم لاولای لێگرتن و دەرچونیان بۆ نابێ.

﴿ فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ ﴾ دوایی کاتێ بێباوەڕان ئەو سزا گرانەی ئێمە ئەبینن کە پێغەمەرکانی ئێمە ئەوانیان بەو سزایە ئەترسان لە جیهاندا، بێباوەڕان ئەو کاتە ئەڵێن: ئێمە باوەڕ بەخودا ئەهێنین بە تەنها و، باوەڕمان بەو شتە نیە ئێمە ئەمان کرد بە هاوبەش بۆ خودا لە پەرستندا.

﴿ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا ﴾ دوایی باوەڕهێنانی بێباوەڕان سود بەوان نابەخشێ کاتێ لەو ڕۆژەدا سزای سەختی ئێمە ئەبینن و ڕزگاریان نابێ لە سزای ئێمە.

﴿ سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ ﴾ ڕێگەیەکی ئەوتۆی خودایە ئێمە کردوومانە بە یاسا و دەستور و، ڕابردوە لە نێوان بەندەکانی ئێمەداکە باوەڕهێنان لە کاتی هاتنەخوارەوەی سزادا سودی نیە بۆ بێباوەڕان و، لەو کاتەدا هەموو بێباوەڕان توشی زیان ئەبن و بێئومێدن لە میهرەبانی خوا....

**بە یاریدەی خوا کۆتایی پێ هات**

## ﴿ سورەتی فوسیلەت ﴾ یا سەجدە

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥٤) ئایەتن.



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ
ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ
أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُوا۟ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ
مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ وَفِىٓ ءَاذَانِنَا وَقْرٌ وَمِنۢ بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ
فَٱعْمَلْ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ
أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَٱسْتَقِيمُوٓا۟ إِلَيْهِ وَٱسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ
لِّلْمُشْرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ
هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ
أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴿٨﴾

### بسم الله الرحمن الرحيم

### بەناوی خوا بەخشندە میهرەبان

﴿ حم ﴾ مانای ئەو پیتانە ڕابردوون لە سورەتی ئەلبەقەرە و سورەتەکانی تردا بە درێژی.

﴿ تَنزِيلٌ مِّنَ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ كِتَابٌ فُصِّلَتْ آيَاتُهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴾ ئەم قورئانە نێراوەتە خوارەوە لە لایەن خودای بەخشندەی میهرەبان، نامەیەکە ئایەتەکانی ماناو مەبەستیان ڕون کراوەتەوە، قورئانێکە بە زمانی عەرەبی هاتوەتە خوارەوە بۆ تاقمێ مانا و ناوەرۆکەکەی بزانن، چونکە زمانی خۆیانە. بێگومان هەموو پێغەمەرێ بە زمانی نەتەوەکەی خۆی نامە بۆ نێرراوە، وێنەی ئیبراهیم کەنامەکەی بە زمانی نەتەوەکەی بوە. تەورات بۆ موسا و ئینجیل بۆ

عیسابە زمانی نەتەوەکانیان بوە، پێغەمەری ئیسلام بە زمانی عەرەبی نامەی بۆلای قەیسەر و کیسرا و سەرۆك و پاشکانی نوسیوە و بانگی کردوون بۆلای ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

﴿ بَشِيرًا وَنَذِيرًا فَأَعْرَضَ أَكْثَرُهُمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴾ ئەو قورئانە موژدە ئەدا بە باوەڕداران بە بەهەشت و، بێباوەڕان ئەترسێنێ لە دۆزەخ، دوایی زۆرتر لەو تاقمەی زمانیان عەرەبیە و ڕو لەو قورئانە وەرئەگێڕن، دوایی ئەو قورئانە نابینن بە جۆرێ سودی لێوەربگرن.

﴿ وَقَالُوا قُلُوبُنَا فِي أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ وَفِي آذَانِنَا وَقْرٌ ﴾ وە بت پەرستان ووتیان: ئێمە دڵمان لەناو چەندین پەردەدایە، ئەو داوایەی تۆ بۆلای باوەڕ بەیەکێتی خوا ناچێتە ناو دڵمانەوە و، لەگوێی مانا کەڕیە هەیە گفتوگۆی تۆ نابیسین.

﴿ وَمِن بَيْنِنَا وَبَيْنِكَ حِجَابٌ فَاعْمَلْ إِنَّنَا عَامِلُونَ ﴾ وە لە نێوان ئێمە و لە نێوان تۆدایە پەردەیە هەیە، نایەڵێ داواکاری تۆ بچێتە ناو دڵمان و، وەری بگرین، دوایی کاری خۆت بکە بەجۆرێ بەرژەوەندی ئایینی خۆتی تێدابێ. بەڕاستی ئێمە کاری خۆمان ئەکەین و هەوڵ ئەدەین بۆ پوچ کردنەوەی ئایینی تۆ و، بەردەوام ئەبین لەسەر بیروباوەری خۆمان.

﴿ قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ ﴾ تۆ بڵێ: بەڕاستی من ئادەمیزادێکم وێنەی ئێوە سروشم بۆ ئەنێرێ لە لایەن خوداوە کە بەڕاستی خودای ئێوە خودایەکی تەنهایە و هاوبەشی نیە لەپەرستندا و، جگەی ئەو شایستەی پەرستن نیە.

﴿ فَاسْتَقِيمُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ وَوَيْلٌ لِّلْمُشْرِكِينَ الَّذِينَ لَا يُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُم بِالْآخِرَةِ هُمْ كَافِرُونَ﴾ دوایی ئێوە ڕو بکەن بۆلای پەرستنی ئەو خودایە بەتەنها و باوەڕی پێبهێنن و داوای لێخۆشبونی گوناهەکانتانیان لێبکەن دوای ئەوەی باوەڕتان هێنا و، سزای سەخت بۆ ئەو بت پەرستانەی ئەوتۆیە زەکاتی دارایی خۆیان نادەن بە هەژاران و، ئەوان ئەو کەسانەن باوەڕیان بەرۆژی دوایی نیە.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَهُمْ أَجْرٌ غَيْرُ مَمْنُونٍ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردوە، بۆ ئەوان هەیە پاداشتێکی نەبڕاوە و بێکۆتایی؛ چونکە ئەوان شایستەی ڕێزن.

قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ
الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٩﴾
وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي
أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ اسْتَوَىٰ إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ

فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾
فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا
وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ
ٱلْعَلِيمِ ﴿١٢﴾

﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ ﴾ تۆ بڵێ: من سەرم سوڕ ئەمێنێ ئایا کە بە ڕاستی ئێوە چۆن باوەڕ نایەرن بەخودایەکی ئەوتۆ ئەو زەوی‌یە ئێوە پەسەرێیەوە ئەژین دروستی کردوە بە دووجار، بە وێنەی دوو ڕۆژی ئێوە؛ چونکە لەوکاتەدا نەڕۆژبوە نە جێگە و شوێن و، هەرتەنها خودا بوە، خوایەکە هەموو بونەوەران بەڵگەن لەسەر توانای ئەو.

شێوەی فەرمودەی قورئان جیاوازە لەگەڵ جگەی قورئان، کاتی وا ئەبێ قورئان ئاماژە ئەکا بۆلای شتێ وەك زانایان باسی ناکابە هەموو ڕێگەوە بەدرێژی مەبەستی ئەو ئاماژەیە ئەزانرێ، وەك ئیبنوعەباس ئەڵێ: ﴿ لا تُفسِروُ القُرآن الزمان يُفَسِرُهُ ﴾ ئێو مانای قورئان مەکەن، مانای قورئان کات ئەیکا. بەڕاستی پێش کەوتنی زانیاری نهێنیەکان قورئان ڕوون ئەکەنەوە.

﴿ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَٰلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾ وە ئایا ئێوە چۆن هاوبەش بۆ خوا دائەنێن لە پەرستندا، لە کاتێکا دروست کەری ئەو زەویە شایستەیە پەرستنی بۆ بکرێ، ئەو خودایە بەو جۆرە بێ پەروەردگاری هەموو بونەوەرانە.

﴿ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا ﴾ و خودا دروستی کردوە لەسەر زەوی چەند کێوی نەجولاو، ئەبنە هۆی ئەوە زەوی نەجوڵێ و، ئێوە ژیانتان لێ تاڵ بێ.

﴿ وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاءً لِّلسَّائِلِينَ ﴾ وە خودا پیت و بەرهەمی زۆری داناوە لەناو زەوی‌دا لەنەوتو زێڕو زیو و قیر و ڕوەك و شتی تر بۆ ژیان و گوزەرانی ئێوە، خودا دیاری کردوە لەناو زەوی‌دا خواردەمەنی و هۆی ژیانی دانیشتوانی ڕوی زەوی بەجۆرێکی شایستە و یگونجێ بۆ پەرەپێدانی ئێوە بەئەندازەی چرووپرپتان لەسەر زەوی لە هەمو کات و لەهەمو جێگەیە لە برنج و گەنم و جۆ و دانەوێڵەی تر و کەرەسەی خانوو هەموو شتێ لەماوەی چوارجاردا، ئەو پیت و خواردەمەنی زەویە، یەکسانە بۆ هەموو گیانداران، بە تایبەتی بۆ ڕەگەزێ نیە، بۆ هەموو گیاندارێکە داوای بکەن و پێویستیان پێ هەبێ، بۆ هیچ کەسێ نیە ڕێگە بگرێ لە کەسێکی تر لەو خواردەمەنییانەی زەوی، هەموو کەسێ بۆی هەیە بە جۆرێکی ڕەوا بەکاری بهێنێ. ئەگەر گیاندارێ بەشی نەبێ و برسی بێ، ئەوە بەهۆی ستەمی تاوانبارانی خاوەن هێزن و دەستیان گرتوە بەسەربەشی ئەو گیاندارانەدا. بێگومان خودا بە چاکی زەوی بۆ مرۆڤ ساختە هێناوە ئەگەر خۆیان لەخۆیانی تێك نەدەن و، دادپەروەری پێشێل نەکەن.

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: دوو ڕۆژەی پێشوو بەشێکن لەم چوار ڕۆژە دوایی. یانێ خودا زەوی و خواردەمەنی ناو زەوی دروست کردوە هەموویان لە چوارجاردا. خودا زاناترە لەهەمو کەسێ. لەو ئایەتەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە خوای مەزن لەهەمو کاتێکا بەگوێرەی ئەندازەی ژمارەی گیانداران پیت و بەرهەم دروست ئەکا بۆیان لەناو زەویدا، خودا هەر گیاندارێ دروست بکا هۆی ژیانی لە زەویدا بۆ دائەنێ، ئەگەر کەسێ باوەڕی وابێ کە خوای گەورە گیاندارێ دروست ئەکا بەبێ ئەوەی هۆی ژیانی بۆ ئامادە بکا، ئەو کەسە بەبێباوەڕ دائەنرێ. خوای مەزن دورە لەوەی گیاندارێ دروست بکا بەبێ ئەوەی خواردەمەنی بۆ دانەنێ لە زەویدا.

بۆ زانین: ئەم باسانەی خوارەوە زانای بەناوبانگ موحەمەد جەواد موغنیە لە تەفسیر ئەلکاشفیدا باسکردوە، بەچاکی ئەزانم لێرەدا باسی بکەم، ئەفەرموێ لە بەرگی (٦) لاپەڕە (٤٧٩): هۆی گرانی و برسێتی گیانداران ئەمانەن:

١- پەرەسەندنی دانیشتووانی سەر زەمین و زۆربوونیان ڕۆژانە بەهۆی پەیدابوونی منداڵەوە و، ڕێکەگرتن لە دانیشتووان بۆ پەیداکردنی هۆی ژیانیان، بەهۆی سازدانی جەنگە وە لەلایەن تاوانبارانەوە.

٢- وەك ئەزانین هەندێ لە ڕژێمە خوێن مژەکان دەست ئەگرن بەسەر بەرهەمی زەویدا و، هەندێ جاریش بەرهەمی کشت وکاڵ و دەستکەوتی زەوی ئەسوتێنێ یا فڕەی ئەدەنە ناو زەریاکان، یا دەرمانی ژەهراوی ئەڕێژن بەسەر کشت وکاڵدا لە هەندێ جێگەدا، هەر لەبەر ئەوەی نرخی بەرهەمی خۆیان بەرز ببێتەوە و گرانی پەیدا ببێ و سامانیان زۆر ببێ و جگەی خۆیان بکەن بە کۆیلەی خۆیان. بۆ چارەسەر کردنی نەمانی گرانی و برسێتی هەندێ کەس ئەم بۆچونانەیان هەیە کە تاوانیشە.

١- هەڵگیرساندنی جەنگ بۆ کوشتنی ئادەمیزادانی بێتاوان و کەمبوونەوەیان بە مەلاین کەس، ئەو بۆچوونە زۆر نارەوایە و، بیروڕای ئەو کەسانەیە خاوەنی چەکی سەربازین، ئەیانەوێ بیانفرۆشن و پیتی زەوی بشارنەوە، لەسەر نەمانی گیانی زۆری هەژاران، ئەو تاوانە گەورەیە دژی یاسای ئاسمان و یاسای دەست کرد و دژی مرۆڤایەتییە.

٢- بەبڵاو کردنەوەی نەخۆشی کوشندە لەسەر زەوی کە ببێتە هۆی قەڵاچۆکردنی ژمارەیەکی زۆر لە ئادەمیزادی بێدارایی و کەم دەرامەت کە نەتوانن دەرمان بکڕن و خۆیان ڕزگار بکەن لەو نەخۆشییە، ئەم بۆچونەیش تاوانی زۆر گەورەیە و قەدەغەیە و; ڕاستەوخۆ کوشتنی دانیشتووانی هەژارە.

٣- دیاریکردنی زاوزێ و، نەخشەدانان بۆ زۆرنەبوونی منداڵ، بەهۆی لەباربردنی منداڵان لە منداڵدانی دایکیانا، بۆ ڕوونکردنەوەیئەم بەشەیان پێویستمان بەشی کردنەوەی جۆرێ لەبارچوونی منداڵ بەم جۆرانەی خوارەوە هەیە.

أ- لەباربردنی منداڵ ئەگەر نەگەیشتبێ بەو کاتەی گیان ئەکرێ بەبەریا هەرچەندە دروستە و چاك وایە نەکرێ. ئەگەر گیان کرا بەبەریا قەدەغەیە، چونکە ئامادەیە ببێ بە ئادەمیزاد،

ماوەکەیشی (٤٢) ڕۆژە. بەڵام (عزل) کە فڕێدانی ئاوی پیاوە بۆ دەرەوەی منداڵدان یا بەهۆی تورەکەوە نەیەڵن بڕژێتە ناومنداڵدان، هەرچەندە قەدەغە نیە. بەڵام بێ‌نرخی ژنی تێدایە.

ب- ﴿ الإجهاض ﴾ یانێ فڕێدانی منداڵ لە منداڵداندا بەهۆی پزیشکەوە دروست نی‌یە مەگەر بۆ ڕزگارکردنی دایك و بەکارهێنانی شتێ تر بۆ ئەوەی لە بنەڕەتا منداڵبوون نەیەڵێ قەدەغەیە، ئەگەر بیانو هەبێ بۆ ئەو کارە دروستە، وەك ڕزگارکردنی ژیانی دایك، ئەوەیش بۆ ماوەیە. نەك بەبەردەوامی .

بۆ ئاگاداری: بەلای یاسای ئیسلامەوە، بگرە بەلای یاسای دەستکردی خاوەن ویژدان گیروگرفتی برسێتی چارەسەر ئەکرێ بەوەی ئادەمیزاد زانستی خۆیان بەکاربهێنن بۆ زۆرکردنی ئامێر و بەکارهێنانی بۆ کێڵانی زەوی و زۆربوونی بەروبومی کشت وکاڵ، پیت وبەرهەمی زەوی بەکارنەهێنری بۆ دروست کردنی چەك و هەڵگیرساندنی جەنگی ناڕەوا، دانیشتوانیش بە تەمەڵی دانەنیشن و خۆیان بخەنە کار بۆ زۆرکردنی بەرهەمی زەوی. بۆ نموونە: گۆڤاری (یونوسك) بلاوی کردەوەتەوە پارەی دروستکردنی تاکە بونبایەکی گەورە بەشی دروستکردنی (٧٥) نەخۆشخانە ئەکا کە هەریەکەیان (١٠٠) کورسی تێدابێ، یا ئەتوانرێ پەنجاهەزار ئامێری پێ‌دروستبکرێ بۆ کێڵانی زەوی بە مەلاین فەدان.

﴿ ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ ﴾ لەپاش دروستکردنی زەوی و کێوەکان و خواردەمەنی، خودا ڕوی کرد بۆلای دروستکردنی ئاسمان و، لەو کاتەدا دوکەڵی بۆ ئەهات و ئەڕۆیی، دوایی خودا فەرمووی بە ئاسمان و زەوی: ئێوە ئەو سودانەی لەناوتانا دروستم کردوە ببەخشن بەبەندەکانم پێتان خۆش بێ یا پێتان ناخۆشبێ، ئەوانیش وتیان: ئێمە پەیرەوی تۆ ئەکەین و ئەو سودانە ئەبەخشین بەبەندەکانی تۆ.

﴿ فَقَضَاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ ﴾ دوایی خودا لە دروستکردنی ئاسمانەکان بوویەوە و، کردنی بە حەوت ئاسمان لە دووجاردا، ساختەی هێنا بەشێوەیە شایستەی ڕابواردن و ژیانی بوونەوەرانبێ.

﴿ وَأَوْحَى فِي كُلِّ سَمَاءٍ أَمْرَهَا ﴾ وە خودا دروستی کرد لەناو هەموو ئاسمانێکدا ئەوەی خۆی فەرمانی پێدا لە فریشتەکان و جگەی فریشتەکان، بەجۆرێ هەر خودا خۆی ئەیزانی و ئەیویست بیکا.

﴿ وَزَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَحِفْظًا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ ﴾ و ئێمە ئاسمانێ نزیکە لە زەوی ڕازاندنەوە بە چەند ئەستێرەیە، بە وێنەی چرا وانَ لە ڕووناکیدا و، ئەو ئەستێرانە ئەیانپارێزین لە یەکەم جاری دروستکردنی جیهان و بەردەوامن هەتا ڕۆژی دوایی. دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بەو شێوەیە باسکران بەڕێوەبردن و دیاریکردنی خودایە زۆر بەدەستەڵاتە، هیچ شتێ ناتوانێ لە دەستی ئەو دەرچێ، ئەزانێ بەسوودی هەموو بوونەوەران.

فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَٰعِقَةً مِّثْلَ صَٰعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذْ جَآءَتْهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ

خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ قَالُوا۟ لَوْ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً
فَإِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٌ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى
ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَقَالُوا۟ مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ۖ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ
ٱلَّذِى خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۖ وَكَانُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ
﴿١٥﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِىٓ أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ
عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَخْزَىٰ ۖ وَهُمْ
لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَٰهُمْ فَٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْعَمَىٰ عَلَى
ٱلْهُدَىٰ فَأَخَذَتْهُمْ صَٰعِقَةُ ٱلْعَذَابِ ٱلْهُونِ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ
﴿١٧﴾ وَنَجَّيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾

﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَقُلْ أَنذَرْتُكُمْ صَاعِقَةً مِّثْلَ صَاعِقَةِ عَادٍ وَثَمُودَ ﴾ دوایی ئەگەر بت پەرستانی مەکە وازیان لە باوەڕهێنان هێنا، دوایی تۆ بەوان بڵێ: من ئێوە ئەترسێنم بە سزایە وێنەی سزایە توشی تاقمی عاد و سەمود بو کە بنەبڕی کردن بە دەنگێ لە لایەن جبەئیلەوە.

﴿ إِذْ جَاءتْهُمُ الرُّسُلُ مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ ﴾ کاتێ چوو بۆلایان پێغەمەرەکان نێرران بۆلای باوباپیریان لە پێش ئەوانەوە و ، دوای باوباپیریشیان پێغەمەر نێررا بۆیان وەك ئەو پێغەمەرانەی نێراون بۆ ئەوان کە هود و صالحن و، بەوانیان ووت: ئێوە هیچ کەسێ مەپەرستن جگەی خودا. بەڵام شەیتان لە ڕێگە ڕاست لایدان و باوەڕیان نەهێنا.

﴿ قَالُوا لَوْ شَاء رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَائِكَةً فَإِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ ﴾ لە وولامی نێرراوەکانی خوادا هەموو تاقمێ بە پێغەمەرەکانی خۆیانیان ئەوت ئێوە درۆ ئەکەن: ئەگەر خوای پەروەردگاری ئێمە ئارەزۆی بکردایە ئێمە باوەڕبهێنین، بەڕاستی پەروەردگاری ئێمە فریشتەی ڕەوانە ئەکرد لە جیاتی ئێوە، دوایی ئێمە باوەڕ بەو شتە نایەرین ئێوە پێوە نێرراون، چونکە ئێوەیش ئادەمیزادێکن وێنەی ئێمە بەبێ جیاوازی.

﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً ﴾ دوایی تاقمی عاد خۆیان بەگەورە دائەنا لە زەوی‌دا بەجۆرێکی ناڕەوا و بێ‌ئەوەی بەڵگەیان هەبێ بۆ ئەو کارەی خۆیان و، ئەیان ووت: چ کەسێ لە ئێمە بەهێزترە، ئیتر ئێوە هەڕەشەمان بە چ کەسێ لێ ئەکەن.

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾ ئایا ئەو تاقمەی عاد نەیانزانیوە بەڕاستی خوا کەسێکی ئەوتۆیە ئەوانی دروست کردوە، ئەو خودایە زۆر بەهێزترە لەوان و، ئەوان باوەڕ بەو بەڵگانە نایەرن لەسەر توانای ئێمە.

﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَى وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ ﴾ دوایی ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆ سەریان بایەکی زۆر ساردی کوشندەی زۆر سەخت لە چەند ڕۆژێکی ناهەمواری بێبەختیاری ئەواندا؛ لەبەر ئەوەی ئێمە سزای ئەوان بدەین بە سزایە ڕسوایان بکا لە جیهاندا و، بەڕاستی سزای ڕۆژی دوایی ڕسواترکەری ئەوانە و، ئەوان لەورۆژەدا یارمەتییان نادرێ بۆ گەڕانەوەی ئەو سزایە.

﴿ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيْنَاهُمْ فَاسْتَحَبُّوا الْعَمَى عَلَى الْهُدَى فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ وە تاقمی سەمود ئێمە ڕێگەی ڕاستمان پیشانی ئەوان دابو بتوانن باوەڕبهێنن، دوایی ئەوان بێباوەڕییان بۆخۆیان هەڵبژارد و ڕێزیاندا بەسەر باوەڕهێناندا و بەسەر ڕێگەی ڕاستا، دوایی توشی ئەوان بوو سزایەکی سەختی بێنرخ کەریان و، ئابڕووی بردن لە جیهاندا، بەهۆی شتێ لە جیهان کردبوویان.

﴿ وَنَجَّيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴾ وە ئێمە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنابوو ڕزگارمان کردن لەو سزایە، ئەوان خۆیانیان پاراستبوو لەبت پەرستی و بێفەرمانی خوا.

وَيَوْمَ يُحْشَرُ
أَعْدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ
عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَٰرُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٢٠﴾
وَقَالُوا۟ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا ۖ قَالُوٓا۟ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ
أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾
وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ
وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ
﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم
مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُوا۟ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ۖ وَإِن
يَسْتَعْتِبُوا۟ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾

﴿ وَيَوْمَ يُحْشَرُ أَعْدَاءُ اللَّهِ إِلَى النَّارِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴾ وە تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە و دوژمنانی ئایینی خودا کۆئەکرێنەوە بۆلای ئاگری دۆزەخ، دوایی پاڵیان پێوە ئەنرێ و، فریشتەکان وەك ئاژاڵ لێیان ئەخوڕن بۆلای دۆزەخ و ئەوان بەند ئەکرێن لە دۆزەخدا.

﴿ حَتَّى إِذَا مَا جَاؤُوهَا شَهِدَ عَلَيْهِمْ سَمْعُهُمْ وَأَبْصَارُهُمْ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ هەتا کاتێ ئامادەی لای ئاگر ئەکرێن و ئەچنە لای ئاگر، ئەو کاتە پرسیار لە بێباوەڕی گوناهەکانیان ئەکرێ، دوایی پێغەمەرەکان شایەتی ئەدەن لەسەریان لەگەڵ باوەڕداراندا، بێباوەڕان ئەڵێن: ئێمە بێفەرمانی خوامان نەکردووە. بۆ بەدرۆ خستنەوەیان گوێچکە و چاو و پێستەکانیان شایەتی ئەدەن لەسەریان بەشتێ کردوویانە لە جیهاندا.

﴿ وَقَالُوا لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوا أَنطَقَنَا اللَّهُ الَّذِي أَنطَقَ كُلَّ شَيْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴾ وە دوژمنانی ئاینی خوا بە پێست و ئەندامەکانی خۆیان ئەڵێن: بۆچی ئێوە شایەتی ئەدەن لەسەرمان، پێستو ئەندامەکانیان ئەڵێن: ئێمە دەستەڵاتمان نیيە، خوایەکی ئەوتۆ هەموو شتێکی هێناوەتە گفتوگۆ، ئێمەیشی هێناوەتە گفتوگۆکردن، بۆ ئەوە شایەتی بدەین لەسەرتان و، ئەو خودایە ئێوەی دروست کردووە یەکەم جار لە خاك و، دواڕۆژ ئێوە بۆلای ئەو خوایە ئەگەڕێنەوە و پرسیارتان لێ ئەکرێ.

﴿ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَنْ يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَا أَبْصَارُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ ﴾ وە ئێوە هەرچەندە ئەتوانن ئەو کارانەی ئەیکەن بیشارنەوە لە ئادەمیزاد، ناتوانن گوناهەکانتان بشارنەوە لە گوێچکە و چاو و پێستەکانتان چونکە ئێوە بەو ئەندامانەی خۆتان ئەو گوناهانەتان کردووە، نەتانئەزانی ئەندامەکانتان شایەتیتان لەسەر ئەدەن.

﴿ وَلَكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ اللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴾ وە بەڵام ئێوە ئەو گوناهانەتان ئەکرد، ئێوە گومانتان ئەبرد کە بەڕاستی خوا بەزۆر شت نازانێ لەو شتانەی ئێوەئەیکەن لە جیهاندا کە بەنهێنی بیانکەن.

﴿ وَذَلِكُمْ ظَنُّكُمُ الَّذِي ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَاكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنْ الْخَاسِرِينَ ﴾ وە ئەو گومانە پوچەی ئێوە ئەو گومانەی ئەوتۆ بوو، ئێوە گومانتان ئەبرد بە پەروەردەکەری خۆتان زۆر شت نازانێ ئێوەی لەناوبرد، دوایی ئێوە گەڕان بە وێنەی ئەو کەسانە تووشی زیان و ئازار ئەبن و ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخ و ڕسوائەبن.

﴿ فَإِن يَصْبِرُوا فَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ وَإِن يَسْتَعْتِبُوا فَمَا هُم مِّنَ الْمُعْتَبِينَ ﴾ دوایی دوژمنانی ئایینی خودا ئەگەر ئارام بگرن لەسەر سزای دواڕۆژ، ئاگری دۆزەخ جێگەی ئەوانە و ئارام گرتنیان بێ سوودە، چونکە ئارام بۆ ئەوەیە خەفەت لاببا، بێگومان خەفەتیان بەردەوامە و، ئەگەر ئەوان داوای ڕەزامەندی خوا بکەن لە خۆیان دوایی ئەوان بەو ڕەزامەندیيە ناگەن، وولامیان نادرێتەوە.

وَقَيَّضْنَا لَهُمْ
قُرَنَاءَ فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ
الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ
كَانُوا خَاسِرِينَ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ
وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا
شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَاءُ
أَعْدَاءِ اللَّهِ النَّارُ ۖ لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ ۖ جَزَاءً بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ
﴿٢٨﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ
وَالْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾

﴿ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَاء فَزَيَّنُوا لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾ وە ئێمە ئامادەمـان كـردووە بـۆ بێباوەڕان چەند دۆستێ لە شەیتانەكانی جنۆكە و ئادەمیزاد و زاڵمان كردوون بەسەریانا، دوایی بیروباوەڕی خۆیانیان بۆ ئەڕازێننەوە ئەو شـتەی لـە جیهاندا ئەیكـەن و بـەوانی ئەسـەلمێنن لـە پاشەڕۆژدا زیندووبوونەوە و پاداشت و سزا نیە.

﴿ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ ﴾ وە پێویست كراوە لەسەر بت پەرستانی مەكە فەرمودەی خودا بۆ سزادانیان لەگەڵ چـەند نەتـەوە لە پێش ئەوانەو بوون كە پێویست كرابوو سـزایان بـدرێ لـە جنۆكـە و ئـادەمیزاد. بەڕاستی بێباوەڕانی ئێستا و ئەوانەی پێشوو لەو كەسانەن زیانیان تووشبووە، چونكە باوەڕیان فرۆشتووە بە بێباوەڕی بۆیە شایستەی سزادانن.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَسْمَعُوا لِهَٰذَا الْقُرْآنِ وَالْغَوْا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴾ وە كەسـانێكیئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لە بت پەرستانی مەكە ئەیانوت هەندێكیان بەوانی تریان: ئێوە گوێ مـەگرن لەم قورئانەی موحەممەد ئەی خوێنێتەوە و، گفتوگۆی خراپ بخەنە ناوی و مێشـكی دانیشـتووان تێك بدەن و دەنگ بەرزبكەنەوە بۆ ئەوەی ئێوە سەربكەون و دانیشتووان بـاوەڕی پێ نـەهێنن و نەیبیسن. بێگومان بێباوەڕان لە زۆر جاردا پەلاماری قورئانیان داوە: جارێ بـەوەی جـادووە. جارێ بەوەی هۆنراوەیە و چیرۆكی پێشوانە. جارێ تر بە قاڵەقاڵ و گفتوگۆی پڕوپوچ لەكاتی خوێندنیا و، شتی تری زۆر.

﴿ فَلَنُذِيقَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ الَّذِي كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ دوایی ئێمە بە ڕاستی ئەچێژین بەو کەسانەی باوەڕیان نەهێناوە سزایەکی زۆر سەخت و، سزای ئەوان بە خراپترین سزا ئەدەینەوە لەسەر ئەو کارە خراپانە ئەو کەسانەی ئەوتۆ کردوویانە لە جیهاندا.

﴿ ذَلِكَ جَزَاء أَعْدَاء اللَّهِ النَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ الْخُلْدِ جَزَاء بِمَا كَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴾ ئەو سزا سەختە پاداشتی دوژمنانی ئایینی خودایە بریتیە لە ئاگری دۆزەخ، جێگە بەردەوام بۆ ئەوان لەناو ئاگردایە، پاداشتیان ئەدرێتەوە بە پاداشتێکی خراپ بەهۆی ئەوەۆ، بڕوایان بە بەڵگە ڕاستەکانی ئێمە نەهێناوە و، گفتوگۆی خراپیان تێکەڵاو بە ئایەتەکانی نامەی ئێمە کردووە.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا رَبَّنَا أَرِنَا الَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ الْأَسْفَلِينَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە ئەڵێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ نیشانی ئێمەی بدە ئەو دوو تاقمەی ئەوتۆ لە جنۆکە و ئادەمیزاد ئێمەیان لادابوو لە ڕێگە ڕاست، ئێمە بیان خەینە ژێر پێی خۆمان، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانە بخرێنە قوڵترین جێگە دۆزەخ.

بۆ زانین: ئایەتی (٢٥)ی ئەم سورەتە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە جنۆکە چەند تاقمێکن و چەند نەتەوەیەکن، لەناو خۆیانا پێغەمەر و نێرراویان هەبووە، پیاوچاك و پیاوخراپیان هەبووە، هەروەك ئادەمیزاد.

إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَـٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ
ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحْزَنُواْ وَأَبْشِرُواْ بِٱلْجَنَّةِ
ٱلَّتِى كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحْنُ أَوْلِيَآؤُكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ
ٱلدُّنْيَا وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِىٓ أَنفُسُكُمْ
وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴿٣٢﴾
وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا وَقَالَ
إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ
ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ
وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ
إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَـٰنِ نَزْغٌ

فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ 

﴿ إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ ئەڵێن: پەروەردگار هەر خوایە بە تەنها، لە پاشا گوناه ناکەن و، دڵیان پەیوەستە لەسەر پەرستنی خودا بە گوفتار و بە کردار، بەردەوامن لەسەری، فریشتەکان پۆل پۆل دێن بۆلایان و، دڵخۆشیان ئەدەنەوە و بەوان ئەڵێن: کە ئێوە مەترسن لە مردن و، لەبێبەشبوونتان لە پاداشت و، خەفەت مەخۆن بۆ ئەو گوناهانە کردووتنە لە جیهان، خودا لێتان خۆشبووە، دوای ئەوەی باوەڕتان هێناوە و، خەفەتیش بۆ خێزانەکانتان مەخۆن دوای خۆتان ئێمە هەموو کارێکمان بۆ ئامادەکردوون و، ڕێگەی ڕاستمان پێنیشانداون و، بەو باوەڕدارانە ئەڵێن: ئێوە موژدە بدەن بە یەکتری و شادمان بن بەو بەهەشتەی ئەوتۆ بەڵێنی پێدرابو بتان درێتێ.

﴿ نَحْنُ أَوْلِيَاؤُكُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ ﴾ فریشتەکان ئەڵێن: ئێمە دۆستی ئێوەین لە ژیانی جیهان و لە پاشەڕۆژدا، شایەتی پیاوچاکیتان بۆ ئەدەین و، وازتان لێناهێنین هەتا ئەچنە ناو بەهەشت.

﴿ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَشْتَهِي أَنفُسُكُمْ وَلَكُمْ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ نُزُلًا مِّنْ غَفُورٍ رَّحِيمٍ ﴾ وە بۆ ئێوە هەیە لە ناو بەهەشتا هەرشتێ ئێوە ئارەزۆی بکەن و پێتان خۆشبێ و، بۆ ئێوەیە هەرشتێ ئێوە داوای بکەن و، فریشتەکان ئەڵێن: ئێوە مێوان داری ئەکرێن بەهەموو جۆرە خواردەمەنی و پاداشتێ ئامادەکردبێ بۆ میوانێکی خۆشەویست لەلای خوا، خودا بکە لێخۆشبوونی زۆر بۆ دۆستنی خۆی، میهرەبانە بۆیان.

﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَا إِلَى اللَّهِ وَعَمِلَ صَالِحًا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ وە چ کەسێ گفتوگۆی چاکترە لە کەسێ داوا لە ئادەمیزاد بکا بۆلای پەرستنی خودا و بۆلای دەستووری خودا و، کردەوەی چاکی کردبێ و بلێ: بەڕاستی و بەشانازیێوە من لەو کەسانەم ملکەچی فەرموودەی خودان. بێگومان ئەو کەسانە دۆست و هەڵبژاردەی خودان، موحەمەد لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا داوای پەرستنی خودا دەکاکە چاکترین گفتوگۆیە.

﴿ وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ﴾ وە چاکە و خراپە، باوەڕ و بێباوەڕی وەك یەك نین و، زۆر لە یەك جیاوازن، تۆ بەرگری بکە لە خراپە بەهۆی شتێکی ئەوتۆ چاکترین شتە، ئەویش بریتییە لەوە تۆ ئارام بگری بەرانبەر خراپەی بێباوەڕان.

﴿ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ ﴾ دوایی کاتێ تۆ بەو شێوەیە بوبی و، ئارامت گرت و لێبوردنت هەبو، کەسێکی ئەوتۆ دوژمنایەتی هەبێ لە نێوان تۆ و لە نێوان ئەوا، بەوێنەی دۆستێکی خۆشەویستی لێدێ و، دۆستایەتی جێگەی دوژمنایەتی ئەگرێ.

﴿ وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا الَّذِينَ صَبَرُوا وَمَا يُلَقَّاهَا إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴾ وە بەو پلە و پایە بەرزە ناگا مەگەر کەسانێکی ئەوتۆ ئارامیان گرتبێ و، بەرانبەر بە خراپە لێبوردنی بوبێ و تۆڵەی مەبەست نەبێ و، ناگا بەو پلە و پایەیە مەگەر خاوەنی بەشێکی گەورەبێ و، ڕەزامەندی خوا لای گەورەتربێ لە هەموو شتێ و، نەیەوێ خراپە بکا بەرانبەر بە دوژمنی خۆی.

﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴾ وە ئەگەر پاڵی نابە تۆ بە پاڵ پێوەنانێ لە لایەن شەیتانەوە، خستیە دەروونتەوە کە خۆت دووربخەیتەوە لە ئارام گرتن و، بەکردەوەی چاك بەرگری لە خراپە نەکەیی و، بتەوێ تۆڵە لە دوژمن بسێنی، دوایی تۆ پەنا بگرە بەهۆی یارمەتی خوداوە لە پاڵ پێوەنانی شەیتان. بەڕاستی خودا پاڕانەوەی تۆ و پەناگرتنی تۆ ئەبیسێ و، ئەزانێ بە شتێ بە دڵی تۆدا ئەڕوا. ئەو ئایەتە ئاگادری‌یەکە کە ئادەمیزاد جێگەی هەڵەیە. کەواتە پێویستە ئاگاداربین، با ئەوپەڕی پلەوپایەی بەرزمان هەبێ لە خواپەرستندا.

وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ
ٱلَّيۡلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُۚ لَا تَسۡجُدُواْ لِلشَّمۡسِ
وَلَا لِلۡقَمَرِ وَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمۡ
إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ
رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمۡ لَا يَسۡـَٔمُونَ۩ ﴿٣٨﴾
وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلۡأَرۡضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ
ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡۚ إِنَّ ٱلَّذِيٓ أَحۡيَاهَا لَمُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ
قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآۗ أَفَمَن
يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ
إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلذِّكۡرِ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ
وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٞ ﴿٤١﴾ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ
خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدۡ قِيلَ

لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾
وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ءَا۬عْجَمِىٌّ
وَعَرَبِىٌّ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ وَٱلَّذِينَ
لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى أُو۟لَٰٓئِكَ
يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ
فَٱخْتُلِفَ فِيهِ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ
بَيْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا
فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ ﴾ وەهەیکە لەو بەڵگە ئاشکرانە لەسەر توانا و بوونی خودا، هاتنی شەو و ڕۆژ بەدوای یەکدا، جیاوازن لە لایەن درێژی و کورتی ماوەکەیاندا، لە لایەن سەرما و گەرماوە، تاریکی و ڕووناکی‌یەوە، هەروەها خۆر و مانگ بەڵگەن لەسەر توانای خودا، بەجۆرێ هەریەکەیان بەدەوری بازنەی خۆیانا ئەسوورێنەوە، خۆر بە دەوری خۆیا، مانگ بەدەوری خۆردائەسوورێتەوە.

بۆ زانین: دروستبوونی خۆر گەورەترین بەڵگەیە لەسەر توانای خودا، تاقی‌کردنەوەی چۆنی‌یەتی درووستبوونی زۆر گرانە لای زانایان، چونکە خۆر یەکپارچە ئاگرە لە توانادا نی‌یە بە جۆرێکی شایستە تاقی بکرێتەوە.

بەڵام هەندێ لە زانایان لەسەر چۆنی‌یەتی درووستبوونی مانگ بە گوێرەی زانیاری خۆیان هەندێ شتیان ووتوە. بۆ نموونە: ڕۆژنامەی (الأخبار)ی میسری لە ژمارەی (٦-٢) ی (١٩٧٠)دا، بیروبۆچوونی دوو زانای دەرکەوتووی (سوفیەتیان لە ڕۆژنامەی (پرافدا)ی سوفیەتە گۆڕاوە بۆلای زمانی عەرەبی و بلاویان کردوەتەوە، ئەو دوو زانایە کە ناویان (م.فاسین) و (أپر باکۆفە) بە کورتی و پوختەی بیر و بۆچوونیان ئەڵێن: (لێکۆڵینەوەی زانیاری تازە هەموو ئەو بیروبۆچوونانە بێژراون لە لایەن مانگەوە و پەیدابوونی پوچیان ئەکاتەوە و، ئەڵێن: لێکۆڵینەوەی زانیاری تازە دەری خستووە: دروستبوونی مانگ بە دەستی هێزێکی بێ‌وێنە دروستبووە لە زانست و توانادا. لە پاشا مانگ بەهۆی ئەو ئامێرە پێش کەوتووانەی ناوخۆی ئەکەوێتەکارکردن، هەروەها ئەڵێن: مانگ لە دووبەشی سەرەکی پەیدابووە، یەکەمیان بەشێکە

به‌رگری له‌ گه‌رما ئه‌کا، قه‌باره‌که‌ی (٤) کیلۆمه‌تره‌. به‌شی دووهه‌میان قه‌باره‌که‌ی (٣٠٠) کیلۆمه‌تره‌، به‌سه‌ریه‌وه‌ چه‌ند ئامێری جیاواز هه‌ن دروستبوون بۆ پاراستنی ئه‌و ئامێرانه‌، مانگ ئه‌خه‌نه‌ گه‌ڕ بۆ کاروباری خۆی و، ئه‌ڵێن: مانگ دروستکراوه‌ و، ئه‌و شته‌ی ئه‌وتۆ ئه‌وی دروستکردووه‌ هێزێکی سه‌رسوڕێنه‌ره‌ له‌ زانیاریدا.

ئێمه‌ش له‌ لایه‌ن خۆمانه‌وه‌ ئه‌ڵێین: زۆر ڕاسته‌ ئه‌و هێزه‌ زۆر زاناو به‌توانایه‌. ئه‌گه‌ر چه‌ند زانایه‌کی ژیری پێکه‌وتو، مانگیان دروست کردبێ، دوایی ئه‌و بوونه‌وه‌ره‌ ژیرانه‌ له‌ چ جێگه‌یه‌که‌وه‌ هاتوون؟.

هه‌ر له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خۆیان ماندووکردووه‌ که‌ بڵێن: مانگ به‌ده‌وری زه‌وی‌دا ئه‌سووڕێته‌وه‌. بێگومان ئه‌و بیروبۆچوونه‌ تازه‌یه‌ پرسیار بکات که‌ له‌ چ جێگه‌یه‌که‌وه‌ ئه‌و ئامێرانه‌ هاتوون بێ وڵامه‌. که‌واته‌ ئه‌و بیروبۆچوونه‌ تازه‌یه‌ ده‌ری ئه‌خا ڕێکه‌وت ئه‌و ده‌سته‌ڵاته‌ی نیه‌، ئه‌و هێزه‌ی مانگ و هه‌موو بوونه‌وه‌رانی تری دروست کردووه‌ خودایه‌کی تاك و ته‌نها و به‌توانایه‌ و باڵاده‌ستی نی‌یه‌.

هه‌ندێ له‌ ئاده‌میزاد سوژده‌یان ئه‌برد بۆ خۆر و مانگ. گومانیان ئه‌برد سوژده‌ بردن بۆ ئه‌وان سوژده‌ بردنه‌ بۆ خوا، خۆر و مانگیان به‌ جێگه‌ی سود دائه‌نا، خوای مه‌زن فه‌رمووی:

﴿ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾ ئێوه‌ سوژده‌ مه‌به‌ن بۆ خۆر و بۆ مانگ، ئێوه‌سوژده‌ ببه‌ن بۆ خودایه‌کی ئه‌وتۆ شه‌و و ڕۆژ و خۆر و مانگی دروستکردووه‌ ئه‌گه‌ر ئێوه‌ خودا ئه‌په‌رستن.

سوژده‌ بردن بۆ خۆر و مانگ په‌رستنی خودا نی‌یه‌، وه‌ك ئێوه‌ گومان ئه‌به‌ن.

﴿ فَإِنِ اسْتَكْبَرُوا فَالَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهُمْ لَا يَسْأَمُونَ ﴾ دوایی ئه‌گه‌ر بێباوه‌ڕان داوای گه‌وره‌یی ئه‌که‌ن و سوژده‌ بۆ خودا نابه‌ن دوایی که‌سانێکی ئه‌وتۆ له‌ فریشته‌کان لای په‌روه‌ردگاری تۆن پاك و خاوێنی بۆ ئه‌و ده‌رئه‌بڕن و نوێژ ئه‌که‌ن به‌ شه‌و و ڕۆژ و، ئه‌وان له‌ په‌رستنی خودا ماندوو نابن.

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ﴾ وه‌ هه‌ندێکه‌ له‌و به‌ڵگانه‌ له‌ سه‌ر توانای خودا، به‌ڕاستی تۆ زه‌وی ئه‌بینی ووشك و بێ‌شینایه‌، دوایی کاتێ ئێمه‌ ئاوی باران ئه‌ڕێژین به‌سه‌ریا ئه‌که‌وێته‌ جوڵه‌ و گه‌شه‌ ئه‌کا و، به‌و بارانه‌ گیا و هه‌موو ڕووه‌کێ په‌ره‌ئه‌سێنێت.

﴿ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ به‌ڕاستی که‌سێکی ئه‌وتۆ زه‌وی زیندووکردووه‌ته‌وه‌ و شینایی و ڕووه‌کی لێ‌ده‌رهێناوه‌، به‌ڕاستی مردووان زیندوو ئه‌کاته‌وه‌ له‌ ڕۆژی دواییدا. به‌ڕاستی خودا توانای به‌سه‌ر هه‌موو شتێکا هه‌یه‌ و، ئه‌توانێ بۆ جارێ تر دوای مردنیان زیندوویان بکاته‌وه‌.

﴿إِنَّ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي آيَاتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَا﴾ به‌ڕاستی که‌سانێکی ئه‌وتۆ له‌ ڕاستی ئایه‌ته‌کانی قورئانی ئێمه‌ لا ئه‌ده‌ن و، تانه‌ و تاوانجی تێ ئه‌گرن، به‌ گفتوگۆی ناپه‌سه‌ند و ئه‌ڵێن: جادووه‌ یا ئه‌فسانه‌یه‌، ئه‌وانه‌ په‌نهان نین له‌سه‌ر ئێمه‌ و، توانای هه‌ڵهاتنیان نی‌یه‌ و ڕزگاریان نابێ له‌ سزای ئێمه‌.

﴿ أَفَمَن يُلْقَى فِي النَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِي آمِنًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ ﴾ دوایی کەسێ فڕەبدرێتە ناو ئـاگری دۆزەخ چاکترە یا کەسێ بە ئاسـوودەیی و بـەبێ ئـەوەی بـڕوا بـۆلای ڕۆژی دوایـی، بێگومـان باوەڕدارن ناترسن و ئەو کەسانەی لائەدەن لـە ڕاستی و فڕە ئەدرێنە ناو ئاگر وەك یەك نین.

﴿ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ ئێوەی بێباوەڕ هەرشتێ ئارەزۆتان هەیە لـە بـاوەڕ و لـە بێباوەڕی بیکەن بە ڕاستی خودا ئەزانێ بە شتێ ئێوە ئەیکەن و، پرسیارتان لێئەکرێ.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِالذِّكْرِ لَمَّا جَاءَهُمْ وَإِنَّهُ لَكِتَابٌ عَزِيزٌ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ بڕوایان بە قورئان نەهێناوە کاتێ قورئان چووە بۆلایان سزایان ئەدرێ و، خۆیان لـە خـودا ناشـارنەوە و، بەڕاستی قورئان نامەیە کە زۆر گەورە و سەرکەوتووە و، پارێزراوە لـە دەست کاری.

﴿ لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴾ بە هیچ جـۆرێ گـۆڕان ڕووی تێناکا بە زۆرکردنی و، نە بەکەم کردنەوە، نەلـەمەوبەر نە لـەمەودوا، هیچ کەسـێ بـۆی ناچێتە سەر دەست کاری بکا، قورئانێکە لـە لایەن خودایەکەوەیە هاتووەتە خوارەوە هەموو شتێ لـە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، شایستەی ئەوەیە سوپاسی بکرێ.

بۆ ئاگاداری: هەوڵ و کۆششی زۆر لـەکۆنەوە و لـەم سەردەمەی ئێمەیشدا دراوە لـە لایـەن دوژمنانی ئیسلامەوە بۆ گۆڕین و دەستکاریکردنی قورئانی پیرۆز. بەڵام نامەی خودا پارێزراوە بۆ کەس نەچوەتە سەردەست کاری و گۆڕانی، هـەر لایـەنی ویستبێتی دەستکاری بکـا تووشـی ڕسـوایی بـووە، بۆنموونـە ڕژێمـی زاوێنـی هـەزارانی قورئـانی چـاپ کـرد، هـەندێ ئایـەتی دەستکاری‌کرد، بە گومانی خۆی وای زانی بۆی ئەچێتە سەر. بەڵام بە گورجی بەردی ڕەق درا بە کەلـوەیانا. بۆ نموونە: لـە سـاڵی (١٩٦٨) ئایـەتی (٨٥) لـە سـورەتی ئـالی عیمرانـدا پیتـی (فَلَن)یان سڕیبۆوە. لە ساڵی (١٩٦٩) ئایەتی (٦٤)ی ئەلمائیدە لە جێگـەی (لعنوا–آمنـوا)یـان دانابوو ئەو قورئانە چاپکراوەی خۆیان بـڵاو ئـەکردەوە لـەناو زەویدا و، لـە نـاو ڕژێمـەکانی عـەرەبدا و، لـەناو ڕژێمـەکانی مالیزیـا، پاکسـتان، هیندوسـتان، ئەندەنوسـیا، غینیـا، ئـێران، ساحیلولعاج. بۆ بەرپەرچدانەوە و ڕسواکردنیان زاناکانی میسر و جێگەکانی تـر، دانیشـتووانی هەموو جیهانیان لـەو کارە نارەوایە ئاگادار کرد، بۆیان نەچووە سەر.

﴿ مَا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ إِنَّ رَبَّـكَ لَـذُو مَغْفِـرَةٍ وَذُو عِقَـابٍ أَلِيـمٍ ﴾ تـۆ خەفەت مەخۆ بەو شتەی ئەبێژری بەتۆ، بە تەنها ئەو جۆرە بەتۆ نەبێژراوە مەگەر وێنەی ئـەوەی بەتۆ ئەبێژری بێژراوە بە پێغەمەرەکانی تر لـە پێـش تـۆوە بەڕاسـتی پـەروەردگاری تـۆ خـاوەنی لێخۆشبوونە بۆ کەسانێ پەشیمان ببنـەوە و، خـاوەنی سـزایە بـۆ کەسـانێ بـەردەوامبن لەسـەر بێباوەڕی و بێفەرمانی خودا.

﴿ وَلَوْ جَعَلْنَاهُ قُرْآنًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا لَوْلَـا فُصِّلَـتْ آيَاتُـهُ أَأَعْجَمِـيٌّ وَعَرَبِـيٌّ ﴾ وە ئەگـەر ئێمـە قورئانمان بە جگەی زمانی عەرەبی بمان ناردایەتە خوارەوە بت پەرسـتانی قورەیـش ئـەیان ووت: بۆچی ئایەتەکانی قورئان ماناکانیان ڕوون نەکراوەتەوە، بە زمانی عەرەبی نەهاتوە خوارەوە هـەتا ئێمە بیانزانین؛ ئایا چۆن ئەبێ ئەو قورئانە بە زمانی عەجەمی بێ و، ئەو پێغەمـەرەی بـۆی هاتبێ

عەرەب بێ. خوای مەزن بیانووی برین، ئەو قورئانەی بە زمانێکی زۆر پاراو و ئاشکرا بۆی ناردووەتە خوارەوە بە زمانێ خۆیان ئەیزانن؟

﴿ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ آمَنُوا هُدًى وَشِفَاء وَالَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِي آذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ﴾ تۆ بڵێ: ئەو قورئانە شارەزایی کەرە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بۆلای ڕێگەی ڕاست و، ڕزگاریان ئەکا لە نەخۆشی و، بێباوەڕی و بیماری و گومانی دڵیان و، نایانەوێ ڕوناکی ئەو قورئانە دڵیان ڕون بکاتەوە و، ئەو قورئانە کوێراییە بەسەر چاوی بێباوەڕان و دووڕووانەوە ڕاستی نابینن.

﴿ أُوْلَئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍ بَعِيدٍ ﴾ ئەو کەسانەی نەزانن و سود لە قورئان وەرناگرن و، وولامی ئەو کەسە نادەنەوە بانگیان ئەکا بۆلای باوەڕهێنان و، وولامی نادەنەوە، بەوێنەی ئەو کەسانەن لە جێگەیەکی دورەوە بامگیان بکرێ، دوایی ئەو بانگە نابیسن و لێی تێناگەن.

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ فَاخْتُلِفَ فِيهِ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە وەك قورئانمان ناردە خوارەوە بۆ سەرتۆ هەر بەو جۆرەیش ئێمە نامەیەکە تەوراتە بەخشیبومان بە موسا لە پێش تۆ و، دوایی تاقمەکەی تۆ جیاوازی بیروباوەڕ پەیدا ئەبێ لە نێوانیانا لە بارەی قورئانەوە، هەروەك تاقمی موسا لە بارەی تەوراتەوە، جیاوازی بیروباوەڕیان لێپەیدابوو، تاقمێکیانت باوەڕیان هێنا و تاقمێ تریان باوەڕیان نەهێنا، ناقمێ ووتیان نامەی خودا ڕاستە تاقمێ تریان ووتیان درۆیە.

﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ﴾ وە ئەگەر فەرموودەی پەروەردگاری تۆ پێش نەکەوتایە کە سزای تاوانباران دوانجا هەتا ڕۆژێ زیندوو ئەکرێنەوە، ئەگەر بەو جۆرە نەبووایە بەڕاستی فەرمان ئەدرا لە پەروەدگاری تۆوە، بۆ بنەبڕکردنی تاوانباران و کەسیان بە سەر زەوییەوە نەئەما. بەڵام سزایان دوا خرایەوە بۆ ئەوەی پەشیمان ببنەوە و باوەڕبهێنن.

﴿ وَإِنَّهُمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴾ وە بەڕاستی بت پەرستان و بێباوەڕان بەناو گوماندان لەبارەی ڕاستی هەریەکە لە قورئان و تەورات، بە گومانێکی ئاشکرا و گفتوگۆی ناپەسەند ئەکەن.

﴿ مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ ﴾ هەرکەسێ کردەوەی چاکی کردبێ دوایی سودی ئەو چاکەیە هەر بۆخۆیەتی و بۆخۆی ئەگەڕێتەوە و، هەرکەسێ خراپەی کردبێ دوایی زیان و سزاکەی لەسەر خۆیەتی و بۆ کەسێ تر نیە و، پەروەردگاری تۆ ستەم لە بەندەی خۆی ناکا و، دادپەروەرە پاداشتی هەموو کەسێ بە گوێرەی کرداری خۆی ئەداتەوە.

**بە یاریدەی خوای مەزن کۆتایی پێهات**

**لە ١٤ای ڕەبیعی دووەم (١٤٢١)ی کۆچی بەرانبەر بە ٢٠٠٠/٧/١٥ی زایینی**

به‌ناوی خوای به‌خشنده‌ی میهره‌بان. سوپاس و ستایش بۆ په‌روه‌رده‌که‌ری هه‌موو بوونه‌وه‌ران. دروودی بێپایان له‌سه‌ر پێغه‌مه‌ر و خێزان و یارو یاوه‌ران و په‌یڕه‌وانی بێ.

إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ۚ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى قَالُوٓا۟ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَظَنُّوا۟ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٤٨﴾ لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾

﴿ إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ السَّاعَةِ وَمَا تَخرُجُ مِن ثَمَرَاتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَى وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِ ﴾ بۆلای په‌روه‌ردگاری بوونه‌وه‌ران ئه‌گێڕێته‌وه زانینی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی و، هیچ دانه‌وێڵه‌یه له قوزاخه و په‌رده‌ی خۆی نایه‌ته ده‌ره‌وه، هیچ ژنێ منالّی خۆی له منالّدانیا هه‌لّناگرێ و دایانێ. مه‌گه‌ر به‌هۆی زانیاری خوداوۆ. هه‌ر خودایه به‌بێ‌گومان کاته‌کانیان بزانێ، هه‌رچه‌نده له‌وانه‌یه پیسپۆڕانی تایبه‌تی کاتی نزیك بوونه‌وه‌یان بزانێ. له‌سه‌ره‌تای مانگی سێهه‌مدا زانایان ئه‌زانن ئایا منداڵ نێره یا مێیه.

﴿ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَائِي قَالُوا آذَنَّاكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴾ وه تۆ بیری ئه‌و ڕۆژه بکه‌ره‌وه بانگی بت په‌رستان ئه‌کرێ له لایه‌ن خوداوۆ له چ جێگه‌یه‌کن ئه‌وانه‌ی به گومانی ئێوه هاوبه‌شی من بوون له په‌رستندا، بت په‌رستان ئه‌ڵێن: ئێمه به‌تۆی ڕائه‌گه‌یه‌نین، هیچ که‌سێ ئه‌مڕۆ شایه‌تی نادا که تۆ هاوبه‌شت بێ له په‌رستندا و، ئێمه له‌وان بێزاری ده‌رئه‌بڕین.

﴿ وَضَلَّ عَنهُم مَّا كَانُوا يَدْعُونَ مِن قَبْلُ وَظَنُّوا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴾ وه ئه‌و شته‌ی بت په‌رستان له‌مه‌وبه‌ر له جیهاندا ئه‌یان په‌رستن له‌وان وونبووه و، بروای ته‌واو په‌یدا ئه‌که‌ن هیچ جۆره ڕاکردنێ له سزای خودادا نیه.

﴿ لَا يَسْأَمُ الْإِنسَانُ مِن دُعَاءِ الْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ الشَّرُّ فَيَئُوسٌ قَنُوطٌ ﴾ ئادەمیزاد ماندوو نابێ لە داواکردنی چاکە و، ئەو شتانەی سوودی لێوەرئەگرێ لە تەندروستی و پلەوپایەو و ئاسایش و، ئەگەر ئازار و ئارامی و خراپە لە هەژاری و شتی تر توشیان بووبێ لە بەزەیی خوادا، لە میهرەبانی خوادا بێئومێد ئەبن.

﴿ وَلَئِنْ أَذَقْنَاهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِن بَعْدِ ضَرَّاءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَذَا لِي ﴾ وە ئەگەر ئێمە چاکەیە ببەخشین بە ئادەمیزادێکی بێباوەڕ لە دوای ئەو سەختیە توشی ئەو بووبوو، بەڕاستی ئەڵێ: ئەو چاکەیە لەبەر چاکی خۆمە و، خۆم شایستەی ئەو چاکەیەم وە هیچ کەسێ پێی نەداوم.

﴿ وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَى رَبِّي إِنَّ لِي عِندَهُ لَلْحُسْنَى ﴾ وە من گومان نابەم ڕۆژی دوایی بەرپا ببێ، بەڕاستی ئەگەر من لەو ڕۆژەدا بگێڕمەوە بۆلای پەروەردگاری خۆم، بەڕاستی بۆ من ئەبێ چاکە لای ئەو و، ڕێز و خۆشیم ئەداتێ، چونکە شایستەی ئەوانەم بمداتێ.

﴿ فَلَنُنَبِّئَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِمَا عَمِلُوا وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴾ دوایی بەڕاستی هەواڵ ئەدەین بە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بەشتێ لە جیهاندا کردوویانە، بەڕاستی بەوانی ئەچێژین سزایەکی سەختی بەردەوام.

وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ
أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ
(٥١) قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم
بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ (٥٢) سَنُرِيهِمْ
ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ
أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ (٥٣) أَلَآ إِنَّهُمْ
فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ (٥٤)

﴿ وَإِذَا أَنْعَمْنَا عَلَى الْإِنسَانِ أَعْرَضَ وَنَأَى بِجَانِبِهِ ﴾ وە هەرکاتێ ئێمە چاکەمان بڕێژایە بەسەر هەندێ ئادەمیزادا وازی لە باوەڕهێنا و سوپاسی خوا ئەهێنا و، خۆی بە گەورە دائەنا و بیری لە گەورەیی ئێمە نەئەکردەوە و، خۆی لێئەگۆڕا، بەتەواوی خۆی لە سوپاسی خوا دوور ئەخستەوە.

﴿ وَإِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ فَذُو دُعَاء عَرِيضٍ ﴾ وە هەرکاتێ خراپەیە توشـی ئـەو ببوایـە ئەگەڕایـەوە بۆلای خودا و ئەبو بەخاوەنی پاڕانەوەیەکی زۆر و، داوای لە خودا ئەکرد ئەو خراپەیە لـەسەری لاببا، لە کاتی خۆشیدا خودای لەبیر ئەچۆوە، لە کاتی ناخۆشی‌دا ئەگەڕایەوە بۆلای خودا.

﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ ﴾ ئایـا ئێـوە هەواڵ ئەدەن بەمن ئەگەر ئەو قورئانە لە لایەن خوداوۆ هاتبێ وەك من ئەیلێم، لە پاشـان ئێـوە باوەڕی پێ‌نەهێنن لەگەڵ ئەو هەموە بەڵگانە لـەسەر ڕاستی ئەو قورئانە، چ کەسێ گومڕاترە لـەو کەسەی لە ناو دژایەتی‌یەکی دووروودرێژدابێ بەرانبەر بەڕاستی ئەو قورئانە. بێگومان ئەو کەسـە گومڕاترە.

﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ﴾ ئێمە لـەمـەودوا چـەندین بەڵگەی ئاشکرا و بەهێز نیشانی دانیشتووانی مەکەی ئەدەین لـەسەر توانای ئێمە کە پەیدا ئـەبن لـەناو شـارەکانی ئـەملاولای مەکـە کـە بـاوەڕداران داگیریـان ئەکـەن و ئەبنـە جێگـــەداری بێ‌باوەڕداران، هەروەك ئێمە نیشانی ئەوانماندا شوێنەواری گەلانی پێشو بـــەهۆی بێ‌باوەڕی‌یـەوە بنەبڕبوون و، نیشانی ئێـوەی ئـەدەین چـەند بەڵگـەی ئاشـکرا لـەناوخۆتانا کـە شـاری مەکـە باوەڕداران داگـیری ئەکـەن و زۆرشـت نیشـانی ئـەوانی ئـەدەین لـەم لاولای مەکـە و لـەناو مەکەیشدا، هەتا ڕون ئەبێتەوەبۆ بت پەرستانی مەکە بەڕاستی قورئان لە لایەن خـوداوە هـاتووە و، ئایینی ئیسلام ڕاستە.

بۆ ئاگاداری: خوای مەزن هەواڵ ئەدا بـە ئـادەمیزاد لـە بـارەی ئـەو بەڵگـە ئاشـکرایانەوە لـەمەوپاش پەیدائەبن لە ئادەمیزادەوە کە خودا زانستی وایان فێرئەکا شتی وا دروسـت بکەنلـە هەموو جێگە دوورەکانی زەوی‌یەوە، گفتوگۆ لەگەڵ یەکتری بکەن و، لە زەوی‌یەوە بۆ ئاسمـان و لە ئاسمانەوە بۆ زەوی.

هەروەها نیشانیان ئەدا ئایینی ئیسلام لە هەموو گۆشە و کەناری زەوی‌دا پەیدا ئەبێ.

﴿ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴾ ئایا بەس نی‌یە بۆ پـەروەردگاری تـۆ کـە بـە ڕاستی ئاگادارە لـەسەر هەموو شتێ دێت و بڕوا بەم جیهانەدا لە نهێنی و ئاشکرا و، لە گـەورە و بچووکی و، لەوانەیش لەمەودوا پەیدا ئەبن و ئەوانەیش ڕابردوون.

﴿ أَلَا إِنَّهُمْ فِي مِرْيَةٍ مِّن لِّقَاء رَبِّهِمْ أَلَا إِنَّـهُ بِكُـلِّ شَـيْءٍ مُّحِيـطٌ ﴾ ئێـوە ئاگـادارین: بەڕاسـتی بێ‌باوەڕان لە ناو گوماندان لەوەی بگەن بە خزمەت پەروەردگاری خۆیان و، لـــە گومـاندان و زیندووبونەوە و ڕۆژی دوایی هەبن و، ئێوە ئاگادارین بەڕاستی پەروەردگار ئـەزانێ بـە هـەموو شتێ و هیچ شتێ لەو پەنهان نیە، هەمو کەسێ بە گوێرەی کرداری خۆی پاداشت وەرئەگرێ بە چاك و بە خراپ.

## ﴿ سورەتی شورا ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگە لە ئایەتەکانی (٢٣-٢٤-٢٥-٢٧) لە مەدینە هاتوە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥٣) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ
ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣﴾ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ
ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ
وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي
ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ
مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ
﴿٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ
حَوۡلَهَا وَتُنذِرَ يَوۡمَ ٱلۡجَمۡعِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٞ فِي
ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ
مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ حم .عسق ﴾ مانای ئەم پیتانە لە سورەتی ئەلبەقەرە و سورەتەکانی تردا باس کراوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەو دوو پیتانە ناوی ئەم سورەتەن. پێشەوا (ڕازی) ئەفەرموێ: گفتوگۆکردن لەبارەی مانای ئەم پیتانە تەسکە و، کردنەوەی دەرگایەکی زۆری وایە ڕێگە بۆلایان نارِوا، چاك وایە زانینیان هەواڵەی خوا بکرێ.

﴿ كَذَٰلِكَ يُوحِي إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكَ اللَّهُ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ وێنەی ئەم نامەیە خودایەکی زۆر بەدەستەلاتە، دانەری هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیدا بە سروش نازدوویەتی بۆلای تۆ و بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ لە پێغەمەران لە پێش تۆبوون. کەواتە وێنەی ناوەرۆکی ئەم سورەتە بە تەنها بۆلای تۆ نەنێرراوە.

﴿ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴾ بۆ خودایە شتێ لەناو ئاسمانەکان و زەوی‌دان، لە جنۆکە و فریشتە و ئادەمیزاد، خودا کارەکانی زۆر بالایە، لە هەموو شتێ گەورەتر.

﴿ تَكَادُ السَّمَاوَاتُ يَتَفَطَّرْنَ مِن فَوْقِهِنَّ وَالْمَلَائِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي الْأَرْضِ ﴾ بەهۆی گفتوگۆی نارەوای بێباوەڕان کە ئەیانووت: خودا هاوبەشی هەیە لە پەرستندا، نزیکبوو لەبەر خراپی ئەو گفتوگۆیە هەموو ئاسمانەکان پارچەبن و بکەون بەسەر یەکدا، دوایی بکەونە سەر زەوی و بونەوەر بنەبڕبن، فریشتەکان بە سوپاس و دەستووری خودای پەروەردگاری خۆیان، پەروەردگار پاك ئەکەنەوە و دووری ئەخەنەوە لە کارێ شایستەی پلەی بەرزی ئەو نەبێ و، داوای لێبوردن ئەکەن بۆ کەسێ لەسەر زەوی‌یە ، ئەگەر خودا هاوبەشی هەبووایە فریشتەکان بەسوپاسەوە نوێژیان بۆ خودا نەدەکرد، داوای دواخستنی سزایان بۆ دانیشتووانی سەرزەوی نەئەکرد. بە ئومێدی ئەوەی پەشیمان ببنەوە و باوەڕبهێنن.

﴿ أَلَا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ ئێوە ئاگادار بن: بەڕاستی خودا لێبوردنی زۆرە و کەس بێ ئومێد ناکا، زۆر میهرەبانە بۆ وەرگرتنی پەشیمان بوونەوەی بەندەکانی خۆی.

﴿ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ اللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيْهِمْ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ لە جگەی خودا چەند وێنە و هاوبەش لە پەرستندا بۆ خودا وەردەگرن. خودا ئاگادارە بەسەر گفتوگۆ و کرداریانا و، کاری ئەوان بەتۆ نەسپێرراوەوە، خودا تۆڵەیان لێ‌ئەسێنی، تۆ هەر ڕاگەیاندنت لەسەرە، لەسەر خوایە پرسیار و پاداشت لە ڕۆژی دوواییدا.

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ قُرْآنًا عَرَبِيًّا لِّتُنذِرَ أُمَّ الْقُرَىٰ وَمَنْ حَوْلَهَا ﴾ وە هەر بەو جۆرەی ئێمە سروشمان نارد بۆلای تۆ و پێغەمەرانی پێش تۆ، هەروایش ئێمە قورئانێکمان بە زمانی عەرەبی نارد بۆلای تۆ، لەبەر ئەوەی تۆ دانیشتووانی مەکە کە شارێکە وك دایك وایە بۆ گوندەکانی بیانترسێنێ لە سزای خودا ئەگەر باوەڕ نەهێنن و، دانیشتووانی جێگەکانی دەورووبەری مەکەیش بترسێنێ بۆ یەکەم جار لەوانەوە دەست پێبکەی دواتر، پەیامی خوا ڕابگەیەنرێ بە دانیشتووانی هەموو ڕوی زەوی لە عەرەب و جگەی عەرەب.

﴿ وَتُنذِرَ يَوْمَ الْجَمْعِ لَا رَيْبَ فِيهِ فَرِيقٌ فِي الْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِي السَّعِيرِ ﴾ و بۆ ئەوەیش ئادەمیزاد بترسێنێ لە ڕۆژی کۆبوونەوەی بونەوەران بۆ پرسیار کردن لەوانَ چ کارێکیان کردووە لە جیهاندا، ئەو ڕۆژە گومان لە هاتنیا نی‌یە، لەو ڕۆژەدا چاك و خراپ جوێ ئەکرێتەوە تاقمێ بۆ ناو بەهەشت و تاقمێ تر بۆ ناو ئاگری گەرمی گڕداری دۆزەخ.

﴿ وَلَوْ شَاء اللَّهُ لَجَعَلَهُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن يُدْخِلُ مَن يَشَاء فِي رَحْمَتِهِ وَالظَّالِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾ وە ئەگەر خودا ئارەزۆی هەبووایە، بەڕاستی هەموو ئادەمیزادی ئەکرد بە یەك نەتەوەی تەنها، بە جۆرێ یا هەموویان باوەڕدار ئەبون یا هەموویان بێباوەڕ ئەبوون. خودا بەزۆر هیچ شتێ بە هیچ کەسێ ناکا و، ئەقڵ و ژیری پێداون هەموویان چاك و خراپ جوێ ئەکەنەوە و، بەلام خودا ئەخاتە ناو میهرەبانی و ڕێگەی ڕاستی خۆی کەسێ ئارەزۆی هەبێ و بەسەربەستی خۆی باوەڕی هێناوە و، هیچ دۆست و یارمەتی دەرێ بۆ ستەمکاران نیە کە بەسەربەستی خۆیان باوەڕیان نەهێناوە و، هیچ کەسێ ڕزگاریان ناکا لە سزای خوا و ئاگری دۆزەخ.

أَمِ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلْوَلِىُّ وَهُوَ يُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ وَهُوَ
عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٩﴾ وَمَا ٱخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَىْءٍ فَحُكْمُهُۥٓ
إِلَى ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّى عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾
فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا
وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ أَزْوَٰجًا ۖ يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ۚ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ
وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ
يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿١٢﴾
۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ
إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ۖ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ
وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ۚ كَبُرَ عَلَى ٱلْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ۚ ٱللَّهُ
يَجْتَبِىٓ إِلَيْهِ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا
تَفَرَّقُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ
سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ
أُورِثُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِنۢ بَعْدِهِمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١٤﴾

﴿ أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء فَاللَّهُ هُوَ الْوَلِيُّ ﴾ هەرچەندە ستەمکاران دۆست و یارمەتی دەریان نیە. بەڵام لە جگەی خودا چەند دۆستێکیان بۆخۆیان دانا، دوایی هەر خودا بەرێوەبەر و دۆستی هەموو بوونەوەرانە. ئەگەر بە دڵێکی پاکەوە بیریان بکردایە هاوبەشیان بۆ خودا دائەنا.

﴿ وَهُوَ يُحْيِي الْمَوْتَى وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ وە خودا مردووان زیندووئەکاتەوە و، توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکا، بونەوەران دوای کۆتایی پێهاتنی تەمەنیان خودا ئەیانمرێنێ و لە پاشان زیندوویان ئەکاتەوە بۆ وەرگرتنی پاداشت و، ئەو بتانە توانای هیچ شتێکیان نی‌یە.

﴿ وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ ﴾ وە هەرشتێ ئێوەی ئادەمیزاد بیروباوەڕتان جیاوازە لەو شتەدا ئایا ڕاستە یا درۆیە، دوایی فەرماندان بۆی ئەگەڕێتەوە بۆلای نامەی خودا، ئەو نامەیە دادپەروەرە و، چاك و خراپ جوێ ئەکاتەوە.

﴿ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبِّي عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ ئەو دادپەروەرە هەر خوای پەروەردگاری منە، من هەر لەسەر یارمەتی ئەو پشت ئەبەستم و هەموو کارێکم ئەسپێرم بەو، بۆلای ئەویش من ئەگەڕێمەوە لە هەموو ڕووداوێکی سەختا، هەر ئەو یارمەتی دەرمە.

﴿ فَاطِرُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَمِنَ الْأَنْعَامِ أَزْوَاجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ ﴾ خوا دروست کەری ئاسمانەکان و زەوی‌یە، بەهۆی توانای خۆیەوە دروستی کردوون، بە جۆرێ بەڵگەن لەسەر یەکێتی خودا و، دروستکردنی ئەوان و مێرولەیە یەکسانە، خودا دروستی کردوە لە ڕەگەزی خۆتان چەند هاوسەرێ لە نێر و لەمێ، هەتا ئێوە بە ئارامی و بە شادمانی بەیەکەوە بژین، لە چوارپێکانیش لە ڕەگەزی خۆیان چەند جۆرێکی لە نێر و لەمێ دروست کردوون بۆ یەکتری و بۆ سوودی ئێوە، بەو بۆنەوە خودا ئێوە و چوارپێکان زۆر ئەکا چین لە دوای چین بەو درووست کردنە.

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴾ هیچ شتێ وێنەی خودا نیە لە هەموو ڕووەیەکەوە، دروستکەری هەمو بوونەوەرانە، هیچ خودایە نی‌یە جگە ئەو، خودا هەمو شتێ ئەبیسێ، هەموو شتێ ئەزانێ.

﴿ لَهُ مَقَالِيدُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاء وَيَقْدِرُ إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ کلیلی گەنجینە و پیتی ئاسمانەکان و زەوی هەر بۆ خوایە بە تەنها، خودا ڕۆزی و خۆراکەمنی زۆر ئەکا و ڕای ئەخا بۆ هەرکەسێ ئارەزۆی هەبێ و، کەم ئەدا بە کەسێ ئارەزۆی هەبێ، بەڕاستی خودا ئەزانێ بەهەموو شتێ. بێگومان کەمی دارایی لەگەڵ ساغی و نەترسان و ئاسایشدا، هەزار جار چاکترە لەگەڵ نەخۆشی و ترسی ژیان و ئاژاوەی ناوخێزان و ناو هاونیشتمان و پەلامار و دەست درێژی و دوژمن.

﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحًا وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ﴾ خودا ڕوونی کردووەتەوە بۆ ئێوە ڕێگەیەکی ئاشکرا لە ئاینی ئیسلامدا و، لە پەیڕەوی کردنی فەرمانی خوادا، شتێ خودا سپاردوویە بە نوح و، شتێکی ئەوتۆیش ئێمە بە سروش ناردوومانە بۆلای تۆ لە قورئاندا.

﴿ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ ﴾ وە شتێ ئێمە سپاردوومانە بە ئیبراهیم و موسا و عیسا کە ئێوە بەردەوامبن لەسەر کردنی نوێژەکانتان و، پەیڕەوی بنچینەکانی بیروباوەڕی ئیسلام بکەن و، ئێو پارچەپارچە مەبن و بیروباوەڕی جیاواز لە یەکتری هەڵبژێرین. خودا هەموو پێغەمەرەکانی ڕەوانە کردووە بۆلای ئادەمیزاد، فەرمانیان پێبدەن و باوەڕیان بە یەکێتی خودا و بە ڕۆژی دوایی هەبێ و، بەردەوامبن لەسەر نوێژکردن و، لە باوەڕهێنان بەوانە جیاوازی پەیدا ئەکەن و پارچەپارچە نەبن. ئێمە ئادەمیزاد خوامان یەکبێ و پەیام و یاسامان یەکبێ، بۆ ئێمە ئەم هەمو ئاژاوە و جەنگانە تۆماربکەین لەسەرخۆمان؟

﴿ كَبُرَ عَلَى الْمُشْرِكِينَ مَا تَدْعُوهُمْ إِلَيْهِ ﴾ شتێ ئێوە داوای ئەکەن لە بت پەرستان کە باوەڕبهێنن بە یەکێتیی خودا و واز لە بت پەرستی بهێنن گرانە لەسەریان و پەیڕەوی ئەو ئامۆژگاریە چاکە ناکەن، تۆ داوای دارایی لەوان ناکەی و پلەوپایەت ناوێ، داوای ڕێگەی ڕاست و برایەتی و ئاشتی و یەکبوون ئەکەی بۆ ئەبێ لایان گرانبێ؟

﴿ اللَّهُ يَجْتَبِي إِلَيْهِ مَن يَشَاءُ وَيَهْدِي إِلَيْهِ مَن يُنِيبُ ﴾ خوا هەڵئەبژێرێ بۆلای باوەڕبوون بەیەکێتی خودا و بۆ لای پەیڕەوی ئایینی خۆی کەسێ ئارەزۆی هەبێ و، ڕێگەی ڕاست شارەزای کەسێ ئەکا بگەڕێتەوە بۆلای.

﴿ وَمَا تَفَرَّقُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ﴾ وە نەتەوەکانی پێشوو و خاوەن نامەکان پەراگەندە و پارچەپارچە نەبوون و تاقمی زۆریان لێپەیدا نەبووە مەگەر لە دوای ئەوەی زانیان بەڕاستی پێغەمەرە بۆیان دەرکەوت کە ئەو پێغەمەرەیە نامەکانیان باسی کردووە و، باوەڕیان پێنەهێنا لەبەر دڵپیسی و داواکردنی پلەوپایەی جیهان، ئەگینا ئەیانزانی پێغەمەر ڕاست ئەکا.

﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى لَّقُضِيَ بَيْنَهُمْ ﴾ وە ئەگەر فەرمودەی پەروەردگاری تۆ پێش نەکەوتایە و پێویستی نەکردایە سزادان و لەناوبردنی ئەوان دوانجا بۆلای کاتی دیاریکراو بۆ سزادان و لەناوبردنیان و، بەڕاستی فەرمان ئەدرا بەبنەبڕکردنیان و لەناوبردنیان و چاك و خراپ جوێ ئەکرانەوە.

﴿ وَإِنَّ الَّذِينَ أُورِثُوا الْكِتَابَ مِن بَعْدِهِمْ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴾ وە بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ بەخشرابوو بەوان نامەی تەورات و ئینجیل لە دوای پێغەمەرەکانیان لەناو گوماندان لەبارەی کاری موحەمەدەوە، دوایی باوەڕی پێناهێنن، ئەیان خاتە ناو گومانەوە کە باوەڕی پێبهێنن.

فَلِذَٰلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿١٥﴾

وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ
دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ
١٦ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ
لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ ١٧ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ
بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ
أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ ١٨

﴿ فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ ﴾ دوایی لەبەر ئەوەی بت پەرستان و خاوەن نامەکان لەناو خۆیان تێك چوون لەبارەی کاروباری ئایینەوە لەبەر ڕاستی قورئان و ئەو زانستەی بە تۆ بەخشراوە، تۆ بانگی ئادەمیزاد بکە بۆلای یەکگرتن و، پەیرەوی ئەو شتانە بکەن سپێردراوە بە پێغەمەرەکانیان و، تۆ بەردەوامبە و ڕامەوەستە لەسەر بانگ کردنیان بەو جۆرەی فەرمانی پێ‌دراوە.

﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنتُ بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِن كِتَابٍ ﴾ و تۆ دوای هەواو هەوەسی پڕوپوچی بێباوەڕان مەکەوە لەبیروباوەڕی جیاوازیانا و، تۆ بڵێ: من باوەڕم هێناوە بە شتێ خواناردوویەتیە خوارەوە لە هەموو نامەکاندا،نەك بەجۆرێ باوەڕمان بە هەندێکیان ببێ و باوەڕمان بە هەندێکیان نەبێ.

﴿ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ ﴾ وە من فەرمانم پێ‌دراوە کە دادپەروەر بم بە یەکسانی لە نێوان ئێوەدا بۆ گەیاندنی فەرمانەکانی خودا و دەستووری و، گەورە و بچووك لای من وەك یەك تەماشا بکەم، خودا پەروەردگاری ئێمە و ئێوەیە بە بێ‌جیاوازی، هەموومان بەندەی خوداین.

﴿ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴾ کرداری ئێمە بۆ خۆمانە و، کردەوەی ئێوەیش بۆ خۆتانە، هەموو یەکێ لە ئێمە و لە ئێوە پاداشتی کردەوەی خۆی وەرئەگرێ، هیچ جۆرە دوژمنایەتی و ئاژاوەیە لە نێوان ئێمە و ئێوەدا نیە، چونکە ڕاستی دەرکەوتوە بۆ هەموو لایەکمان خودا لە ڕۆژی دواییدا هەردوولامان لە نێوان یەکدا کۆ ئەکاتەوە بۆ وەرگرتنی پاداشتی کرداری خۆمان و، بۆلای خودایە گەڕانەوەی هەموو ئادەمیزاد، تۆڵەی ستەم لێ‌کراو لە ستەمکار ئەسێنرێ. خاوەن نامەکان ئەیان ویست بە بەڵگەی پڕوپوچ موسڵمانان لە ئایین وەرگێڕن ئەیان ووت نامەی ئێمە و پێغەمەری ئێمە لە پێش نامە و پێغەمەری ئێوەۆ هاتوون. کەواتە ئایینی ئێمە ڕاستە خوای مەزن فەرمووی.

﴿ وَالَّذِينَ يُحَاجُّونَ فِي اللَّهِ مِن بَعْدِ مَا اسْتُجِيبَ لَهُ حُجَّتُهُمْ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ لە خاوەن نامەکان دژایەتی و گفتوگۆی خراپ و نابەجێ ئەکەن لەبارەی ئایینی خوداوە، دوای ئەوەی لە لایەن ئادەمیزادەوە وڵامی ئایینی خودا درایەوە و، هاتنە ناوی ئایینی ئیسلامەوە و باوەڕیان هێنا و بەڵگەو ئاژاوەکەیان پوچە و جێگەی خۆی نەگرت بە گوێرەی مەبەستی ئەوان لە لایەن پەروەردگاری خۆیان و لەسەریانە خەشم و نەفرەتی خودا و، بۆ ئەوانە سزای زۆر سەخت لە ڕۆژی دواییدا.

﴿ اللَّهُ الَّذِي أَنزَلَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ وَالْمِيزَانَ ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە ناردویەتیە خوارەوە هەموو نامەکان بەڕاستی و بە دادپەروەری و، دەستورێکە مافی هەموو کەسێ پێ ئەکێشرێ بە یەکسانی پاداشتی خۆیان وەرئەگرن.

پێغەمەری خودا باسی هاتنی ڕۆژی دوایی ئەکرد بۆ بێباوەڕان، ئەوانیش بەلاقرتیەوە ئەیان ووت: ئەو ڕۆژە چ کاتێ دێت، ئەگەر تۆ ڕاست ئەکەی؟ خودا فەرمووی:

﴿ وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ السَّاعَةَ قَرِيبٌ ﴾ وە چ شتێ بێئاگاداری تۆ بکا بۆ هاتنی ڕۆژی دوایی، بێگومان تۆ نایزانی لەوانەیە هاتنی ڕۆژی دوایی نزیکبێ، هەر کەسێ مرد ڕۆژی دوایی ئەو هاتووە.

﴿ يَسْتَعْجِلُ بِهَا الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِهَا وَالَّذِينَ آمَنُوا مُشْفِقُونَ مِنْهَا ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان بە هاتنی ڕۆژی دوایی نیە داوای هاتنی ئەکەن بە گورجی و، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە لە هاتنی ڕۆژی دوایی ئەترسن.

﴿ وَيَعْلَمُونَ أَنَّهَا الْحَقُّ أَلَا إِنَّ الَّذِينَ يُمَارُونَ فِي السَّاعَةِ لَفِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ ﴾ وە باوەڕداران ئەزانن هاتنی ڕۆژی دوایی ڕاست و بێگومانە و، زۆر سامناکە، ئێوە ئاگادارین: کەسانێکی ئەوتۆ گومانیان هەیە لە هاتنی ڕۆژی دواییدا لەناو گومڕاییەکی زۆر دوردانسەر بۆ هیچ لایە دەرناکەن.

ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ
(١٩) مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن
كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن
نَّصِيبٍ (٢٠) أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ
مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ
وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (٢١) تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ

مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٢﴾

﴿ اللَّهُ لَطِيفٌ بِعِبَادِهِ يَرْزُقُ مَن يَشَاء وَهُوَ الْقَوِيُّ الْعَزِيزُ ﴾ خودا بەندەکانی خۆی بەخێو ئەکا بە جۆرەها چاکەی خۆی بەبێ جیاوازی لە نێوان باوەڕدار و بێباوەڕدا، ڕۆزی ئەدا بەهەر کەسێ ئارەزۆی هەبێ لەوان بەگوێرەی زانیاری خۆی، خودا زۆر بەتوانایە، زۆر گەورە بەدەستەڵاتە لە زەوی و لە ئاسماندا کەس ناتوانێ بەرانبەری بووەستێ ، ئاشکرا و نهێنی ئەزانێ هیچ کەسێ ئاگاداری فەرمانی خودا نیە، خودای مەزن ئادەمیزادی جوێ کردووەتەوە: هەندێکیان بەدارایی و پلەوپایەی جیهان. هەندێکیان بە لەش ساغی و زانست هەتا هەریەکەیان یارمەتی ئەوانی تریان بدەن.

﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الْآخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيَا نُؤْتِهِ مِنْهَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾ هەر کەسێ مەبەستی کاروکردەوەی پاشەڕۆژبێ لە پەرستنی سنوورەکانی خودا، ئێمە بۆ ئەو کەسە ئەکەین لە پاداشتی کارەکەی بە دەچەنانە هەتا حەوت سەد چەنانە، هەرکەسێ مەبەستی کاری جیهانبێ لە دارایی و پلەوپایە و بەجێهێنانی ئارەزۆی خۆی، ئێمە هەندی لەمەبەستەکانی خۆی پێئەبەخشین و، لە پاشەڕۆژدا هیچ بەشێکی نیە لە پاداشتی چاکە; چونکە ئەو کەسە کاری بۆ پاشەڕۆژی خۆی نەکردووە. ئەوەی باسکرا بۆ ئەو دوو تاقمە و ویستی خوای مەزنە.

﴿ أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ ﴾ ئایا بۆ بت پەرستان هەیە چەند هاوبەشێ بۆ خودا لە بتەکان و جگە بتەکان بۆ ئەوانی ڕوون کردبێتەوە لە ئاییندا شتێ خودا فەرمانی پێنەدابێ، بە وێنەی بت پەرستی و باوەڕنەبوون لە زیندووبوونەوە و کارکردن هەر بۆ جیهان بە تەنها، کاتێ ئەو بتانە نەیانتوانیوە ئەو کارانەیان بۆ ڕون بکەنەوە چۆن ئەیان پەرستن.

﴿ وَلَوْلَا كَلِمَةُ الْفَصْلِ لَقُضِيَ بَيْنَهُمْ ﴾ وە ئەگەر لەبەر فەرمووده و فەرمانی خودا نەبوایە بۆجوێکردنەوەی چاك و خراپ وە بۆ دواخستنی سزادانیان، بەڕاستی فەرمان ئەدرا بە لەناوبردن و بنەبڕکردنیان لە جیهاندا. بەڵام خودا بە میهرەبانی خۆی مۆڵەتیان ئەدا بەڵکو پەشیمان بنەوە و باوەڕبهێنن.

﴿ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ تَرَى الظَّالِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا كَسَبُوا وَهُوَ وَاقِعٌ بِهِمْ ﴾ وە بەڕاستی لەپاشەڕۆژدا سزایەکی ئازاردەر هەیە بۆ ستەمکاران تۆ ئەبینی لە دواڕۆژدا ئەترسن لە سزای ئەو خراپەیە کردوویانە لە جیهاندا و، بێگومان ئەو سزایە تووشی ئەوان ئەبێ بترسن یا نە.

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فِي رَوْضَاتِ الْجَنَّاتِ لَهُم مَّا يَشَاؤُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ذَلِكَ هُوَ الْفَضْلُ الْكَبِيرُ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە لە ناو چیمەن و پاکترین و خۆشترین جێگەکانی بەهەشتان، بۆ ئەوان هەیە لە لای پەروەردەکەری خۆیان هەرشتێ ئارەزۆی بکەن و هەمو شتێکیان بۆ ئامادە کردووە، ئەو شتە بە نرخ و نایابە ئەدری بە باوەڕداران لە پاداشتی ئەو شتە کەمەی ئەوان کردوویانە ڕێزێکی زۆر گەورەیە بۆ ئەوان.

ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰۗ وَمَن يَقۡتَرِفۡ حَسَنَةٗ نَّزِدۡ لَهُۥ فِيهَا حُسۡنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗاۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخۡتِمۡ عَلَىٰ قَلۡبِكَۗ وَيَمۡحُ ٱللَّهُ ٱلۡبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَعۡفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۚ وَٱلۡكَٰفِرُونَ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ ﴿٢٦﴾

﴿ ذَلِكَ الَّذِي يُبَشِّرُ اللَّهُ عِبَادَهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾ ئەو ڕێزە گەورەیە ئامادەکراوە شتێکی ئەوتۆیە خودا موژدەی داوە لێیدا بەو بەندانەی ئەوتۆی خۆی باوەڕیان هێناوە و، کردەوە چاکەکانیان کردووە.

﴿ قُل لَّا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا الْمَوَدَّةَ فِي الْقُرْبَى ﴾ تۆ بڵێ بە قورەیشییەکان: من داوا ناکەم لەسەر ڕاگەیاندنی فەرموودە خودا کە بەختیاری هەردوو جیهانی ئێوەی تێدایە، مەگەر ئەو شتەی من داوای لە ئێوە بکەم ئەمەیە: ئێوە منتان خۆشبوێ، چونکە من خزمی ئێوەم، داواتان لێئەکەم لە خودا نزیك ببنەوە هەتا ئێوە توشی ئازار نەبن و سەربەرزی هەردووجیهان بن، پەیڕەوی کردنی فەرموودەی خودا سوودی هەموو ئادەمیزادی تێدایە و، ئایینێکی مرۆڤایەتییە.

بۆ زانین: زانایان بیروبۆچوونیان جیاوازە: ئایا مەبەست لە ووشەی ﴿ الْقُرْبَى ﴾ چ شتێکە؟ لە تەفسیری ﴿ غرائب القرآن - رغائب الفرقان ﴾ دا هاتووە بە چوار مانا:

١- مەبەست ئەوەیە ئێوە منتان خۆشبوێ و، وولامی داواکاری‌یەکم بدەنەوە و، ئازاری من مەدەن و پەلامارم مەدەن، لەبەر ئەوەی من خزمی ئێوەم.

٢- یاریدەدەرانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ووتیان: ئەو پیاوە بووە بەهۆی ڕانومایی ئێوەوە و، دارایی بەدەستەوەنیە و، خوشکەزای ئێوەیە، هەندێ دارایی بۆ کۆبکەنەوە، ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە: فەرموی: من کرێم لە ئێوە ناوێ، هانی‌دان لەسەر خۆشەویستی خزمانی خۆیان و، سەریان لێ‌بدەن.

٣- مەبەست لە ﴿ الْقُرْبَى ﴾ خۆشویستن و پەرستن و نزیکبوونەوەیە لە خودا، کردنی کاری چاك.

٤- بریتی‌یە لەوەی پێویستە عەلی و فاتیمە و حەسەن و حوسەینتان خۆشبوێ و چاکەیان لەگەڵ بکەن.

﴿ وَمَن يَقْتَرِفْ حَسَنَةً نَّزِدْ لَهُ فِيهَا حُسْنًا إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴾ و هەرکەسێ چاکەیە بکا و خودا بپەرستێ ئێمە لەناو ئەو چاکەیەدا، چاکەیەکی زۆر گەورەتری بۆ زۆر ئەکەین بە (دەچەنانە هەتا حەوت سەد چەنانە) بەڕاستی خودا لێ خۆشبوونی زۆرە بۆ گوناهباران، سوپاسی کەمی بەندەکانی وەرئەگرێ و پاداشتی زۆریان ئەداتێ. بێ‌باوەڕان ئەیان ووت: ئەو قورئانەی نێردراوە بۆ موحەمەد، خۆی هەڵی بەستووە، خودا لە وولامدا فەرمووی:

﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا فَإِن يَشَإِ اللَّهُ يَخْتِمْ عَلَى قَلْبِكَ ﴾ ئایا بت پەرستان چۆن ئەتوانن بڵێن: تۆ ئەو قورئانەت هەڵبەستووە، بە درۆ داوتە بەسەر خوادا، دوایی ئەگەر تۆ هەوڵی کاری وا بدەی خوا مۆر ئەدا بەسەر دڵی تۆدا و نایەڵێ تۆ ئەو کارە بکەی، ئەو کارەیش زۆر دوورە لە تۆوە.

﴿ وَيَمْحُ اللَّهُ الْبَاطِلَ وَيُحِقُّ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾ وە تۆ ڕاست ئەکەی و، خودا ئەو بوختانەی ئەوان پوچ ئەکاتەوە و، ئایینی ڕاستی ئیسلام و ڕاستی تۆ ئاشکرا ئەکا بەهۆی فەرموودەی نامەی خوداوە کە ئەی‌نێرێ بۆلای تۆ. بەڕاستی خودا ئەزانێ بەشتێ لە دڵی تۆدایە و، بەشتێ لە دڵی ئەواندایە، هەموو شتێ بە گوێرەی زانیاری خۆی پاداشتی ئەداتەوە.

﴿ وَهُوَ الَّذِي يَقْبَلُ التَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِ وَيَعْفُو عَنِ السَّيِّئَاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴾ وە خودا کەسێکی ئەوتۆیە پەشیمان بوونەوە وەرئەگرێ لە بەندەکانی خۆی و، ئەبورێ لە خراپەکانیان و، ئەزانێ بەشتێ ئێوە ئەیکەن.

﴿ وَيَسْتَجِيبُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِ وَالْكَافِرُونَ لَهُمْ عَذَابٌ شَدِيدٌ ﴾ وە خودا وولامی کەسانێکی ئەوتۆ ئەداتەوە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە و لە خودا ئەپاڕێنەوە و خودا لەبەر گەورەیی و میهرەبانی خۆی پاداشتی ئەو کەسانە زۆرتر ئەکا بۆ بێ‌باوەڕان هەیە سزایەکی سەخت هەندێ لە زانایان مانای ئەو ئایەتەیان بەم جۆرە کردووە: باوەڕداران وولامی بانگەشەی خودا ئەدەنەوە، خوای مەزن لەبەر گەورەیی خۆی پاداشتی زۆریان ئەداتێ.

وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ
لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ
خَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ
وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ وَهُوَ ٱلۡوَلِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٨﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٖۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ
إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ ﴿٢٩﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا
كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ
فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٣١﴾
وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلۡجَوَارِ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ ﴿٣٢﴾ إِن يَشَأۡ يُسۡكِنِ ٱلرِّيحَ
فَيَظۡلَلۡنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٍ
﴿٣٣﴾ أَوۡ يُوبِقۡهُنَّ بِمَا كَسَبُواْ وَيَعۡفُ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٤﴾ وَيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ
يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٖ ﴿٣٥﴾

خوای مەزن ڕۆزی و سامان ئەدا بەبەندەکانی خـۆی بـەگوێرەی سودی هـەموو کەسـێ و بەهەموو کۆمـەڵێ بـەجۆرێ هـەندێکیان کـەمتریان ئـەداتێ و هـەندێکیان زۆرتـر. بـۆ ئـەوەی هەرەیەکەیان بە گوێرەی توانای خۆیان یارمەتی یەکتری بدەن و، بۆ ئەوەی ڕەوڕەوەی ژیانیان بە جۆرێکی ئاسان بڕوا بەڕێوە، هەندێکیان بە سـامان و، هـەندێکیان بەدەسـت و بـەزمان و لـەش یارمـەتی یـەکتری بـدەن، بـەگوێرەی ماندووبوونیـان و کارکردنیـان سـامانیان ئـەداتێ. بـۆ ڕوونکردنەوەی باشتر خودا ئەفەرموێ:

﴿ وَلَوْ بَسَطَ اللَّهُ الرِّزْقَ لِعِبَادِهِ لَبَغَوْا فِي الْأَرْضِ ﴾ وە ئەگەر خودا ڕۆزی و سـامانی زۆر بـدا بە هەموو بەندەکانی خۆی، بە ڕاستی ئەوان یاخی ئەبن لە زەوی‌دا و، ستەم لە یەکتری ئەکەن.

﴿ وَلَكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَاءُ إِنَّهُ بِعِبَادِهِ خَبِيرٌ بَصِيرٌ ﴾ وە بەڵام خودا ڕۆزی و سامان ئـەدا بـە ئەندازەیە خۆی ئارەزۆی بکا لـەکەم و زۆر، بەجۆرێ سـودی ئـەوانی تێدابـێ و، بـە ئـەندازەی

کارکردنی خۆیان، وا ئەبێ سامانی زۆر ئەدا بە بەرانبەر بە کارکردنی کەم و، دارایی کەمیش ئەدا بەرانبەر کارکردنی زۆر،ئەوانەیش لەبەر چەند هۆیەکە هەر خودا خۆی ئەیزانێ. بەلاّم سامانی زۆر لە ڕێگەی نارەوا و دەستبڕینەوە قەدەغەیە و ئەبێتە هۆی زیان و ئازار بۆخۆی و بۆ دانیشتووان. بەڕاستی خودا ئاگاداری کردەوەی بەندەکانی خۆیەتی، هەموو شتێکی نهێنی و ئاشکرایان دەبینێ.

﴿ وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِن بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنشُرُ رَحْمَتَهُ وَهُوَ الْوَلِيُّ الْحَمِيدُ ﴾ وە خودا کەسێکی ئەوتۆیە باران ئەنێرێتە خوارەوە لەدوای ئەوەی دانیشتووان بێئومێد ئەبن لە بارینی باران و، خودا پیتی باران و سودی باران و ئەو هەرزانییەی لە بارانەوە پەیدائەبێ بەشی ئەکا لەناو زەوی‌دا و بۆ هەموو ئادەمیزاد و، هەر خودایە بەڕێوەبەری بەندەکانی خۆی بەشێوەیەکی چاك و، خواپەرستان سوپاسی زۆری بۆ ئەکەن.

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَابَّةٍ ﴾ وە هەندێکە لە بەڵگە ئاشکراکان لەسەر توانای خودا، دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و شتێ بلاّوبوونەتەوە لەواندا، لەو شتە جیاوازانە ئەڕۆن بەڕێوە، هەندێکیان ئاقڵن و هەندێکیان بەسەزمان و هەندێکیان گەورە و هەندێکیان بچووك.

﴿ وَهُوَ عَلَى جَمْعِهِمْ إِذَا يَشَاءُ قَدِيرٌ ﴾ وە خودا هەر بەو جۆرەی بلاّوی‌کردوونەتەوە توانای هەیە لەسەر کۆکردنەوەیانا لە ڕۆژی دواییدا هەرکاتێ ئارەزۆی بکا.

﴿ وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ ﴾ وە هەرشتێ تووشی ئێوە بووبێ لە خەفەت و ئازار و ناخۆشی و نەبارینی باران و گرانی بەهۆی ئەو شتە خراپانەیە بە توانای خۆتان کردووتانە و، خودا لە زۆر گوناهی ئێوە خۆشبووە و سزای ئێوەی نەداوە لەسەر کردنیان.

﴿ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ اللَّهِ مِن وَلِيٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴾ وە ئێوە ناتوانن ڕێگەبگرن لە سزای خودا لە زەوی‌دا و، لەهەر جێگەیەبن توشتان ئەبێ و، بۆ ئێوە نیە لە جگەی خودا هیچ کەسێ بتانپارێزێ لە سزای خودا و یارمەتیتان بدا بۆ لابردنی.

﴿ وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ إِن يَشَأْ يُسْكِنِ الرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَى ظَهْرِهِ ﴾ وە هەندێکە لەو بەڵگە ئاشکرایانە لەسەر توانای خودا ئەو کەشتیانە لەناو دەریادان، وەك کێوانە لە گەورەیی‌دا، وەك کۆشك وان لە بەرزیدا.

ئەگەر خودا ئارەزۆ بکا ئەو بایە کەهۆی ڕۆیشتنی کەشتیەکانە ئەیوەستێنێ یا ئاوی دەریاکە ئەوەستێنی، دوایی کەشتی‌یەکان بەسەر ئاوی دەریاوە ئەوەستن و جم و جوڵ ناکەن و ناڕۆن بەسەر دەریاکەدا.

بۆ زانین: هەرچەندە کەشتیەکان و فڕۆکە و ئوتۆمبێل ئادەمیزاد دروستیان ئەکا. بەلاّم ئەو بایەی کەشتیەکان ئەبا بەڕێوە و، ئەو تەختە و درەختە و ئەو ئامێرانە ئەوانیان پێ دروست ئەکرێ خودا دروستی کردوون، هەروەها ئەو کەسەیش ئەوانە دروست ئەکەن خودا دروستی کردوە.

﴿ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴾ بەڕاستی لەو کەشتیانەدا بەو جۆرە باسکرا چەندین بەڵگەی ئاشکرا هەن لەسەرتوانای خودا، بۆ هەموو کەسێ بەرگەی ئازار بگرێ، سوپاسی خودا بکا.

﴿ أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ ﴾ یا ئەگەر خودا ئارەزۆ بکا کەشتیەکان بەو شتانەوە لەسەرینی لە ئادەمیزاد و کەل و پەڵەکانیانەوە لەناویان ئەبا، بەهۆی ئەو بێفەرمانی خوداوە ئەوان کردوویانە و، لەزۆر گوناهی ئەوان خۆشبووە لەبەر ئەوەی تۆڵەیان لێنەسێنێ.

﴿ وَيَعْلَمَ الَّذِينَ يُجَادِلُونَ فِي آيَاتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴾ وە لەبەر ئەوەی ئەو کەسانەی ئەوتۆ گفتوگۆی نابەجێ ئەکەن بۆ پوچ کردنەوەی ئایەتەکانیٔ نامەی ئێمە بزانن ڕاکردنیان بۆ نیە لە سزای خودا و لە دەستەلاٚتی خودا دەرچوونیان بۆ نی‌یە و، بشزانن بەڵگەی ئاشکرای ئێمە شایستەی پوچ کردنەوەنین.

فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ
الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ
يَتَوَكَّلُونَ ﴿٣٦﴾ وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا
غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ ﴿٣٧﴾ وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَوٰةَ
وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣٨﴾ وَالَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ
الْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُا سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا
وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَلَمَنِ انتَصَرَ
بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴿٤١﴾ إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ
يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُولَٰٓئِكَ لَهُمْ
عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ
﴿٤٣﴾

﴿ فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾ دوابی شتێ بەئێوە دراوە لە لایەن خوداوە، لەو شتەی کە پەیوەندی بەجیهانەوە هەیە، لە دارایی و ماڵ و پلەوپایە، دوایی ئەو شتە ژیان و گوزەران و ڕابواردنی جیهانە بە گورجی دێن و ئەڕۆن و نامێنن.

﴿ وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ وە هەمو شتێ پێویستی ژیانی جیهان جێبەجێ بکا بۆ ئادەمیزاد لای خودا چاکترە لە هەموو شتێ بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە. بەڵام بێباوەڕان لای خودا جگە لە سزا هیچ شتێ تریان بۆ نیە و، باوەڕداران لە هەموو کارێکیانا پشت بە خوا ئەبەستن و، گەورەیی هەر بە لە خواترسان و ڕەزامەندی خودا دائەنێن.

﴿ وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ ﴾ وە ئەوەی لای خودایە چاکترە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ خۆیان دوور ئەخەنەوە لە گوناهە گەورەکان لەو گوناهانە لە خراپیدا لە سنوور دەرچوون، وەك ستەم کردن و بوختان و کوشتن و داوێن پیسی و، هەرکاتێ ئەو کەسانە ڕقیان هەڵسا لە جگەی خۆیان لەبەر شتێ پەیوەندی بەخۆیانەوە هەبێ، ڕقی خۆیان ئەخۆنەوە و، لەوان ئەبورن. بەڵام ئەگەر پەیوەندی بە یاسای ئیسلامەوە هەبو، چاوپۆشی ناکەن و بە گوێرەی توانای خۆیان ئیشی بۆ ئەکەن.

﴿ وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ ﴾ وە بۆ کەسانێکی ئەوتۆیشە وەڵامی پەروەردگاری خۆیانیان داوەتەوە و، لە هیچ شتێکدا بێفەرمانی خودایان نەکردووە، بە خۆشی‌یەوە نوێژەکانیان بەجێهێناوە.

﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴾ وە بۆ کەسانێکیشە کارەگشتی‌یەکان ئەکەن بە ڕاوێژ و پرسی یەکتری‌یە لە نێوان خۆیانا و، یارمەتی یەکتری ئەدەن بەیەك دەست بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارانە و، هەندێ لەو شتەی ئێمە بەوانمان بەخشیوە ئەیدەن بە هەژاران.

﴿ وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴾ وە بۆ کەسانێکی ئەوتۆیشە هەرکاتێ ستەم و دەستدرێژی توشی ئەوانبوو لە لایەن بێباوەڕانەوە پەیوەندی بەسودی گشتیەوە هەبوو، تۆڵە لە ستەمکاران ئەسێنێتەوە، یارمەتی یەکتری ئەدەن، بەجۆرێ لە سنوور دەرئەچن و بەوجۆرە کە خودا ئەفەرموێ.

﴿ وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴾ وە پاداشت و تۆڵەی یەك خراپە، تۆڵە و پاداشتێکە وێنەی ئەو خراپەیە، بەبێ ئەوەی زۆرتربێ، دوایی هەرکەسێ ئاشەوایی و دۆستایەتی بخاتە نێوان خۆی و ستەمکارەوە و، لەو ببورێ دوایی پاداشتی ئەو کەسە لەسەر خودایە، بەڕاستی خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت، لە کاتی تۆڵەکردنەوەدا لە سنوور دەربچێ.

﴿ وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُولَٰئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ ﴾ وە بەڕاستی تۆڵەی خۆی لەو کەسە بکاتەوە ستەمی لێنەکا و دوای ستەم لێکردنی، دوایی ئەو کەسانە هیچ جۆرە گوناهێکیان لەسەر نیە، چونکە مافی خۆی وەرگرتوەتەوە، دوای ئەوەی ستەمی لێکراوە.

﴿ إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُولَٰئِكَ لَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ بەڕاستی لۆمە و گوناه لەسەر کەسانێکی ئەوتۆیە ستەم لە ئادەمیزادی بێتاوان ئەکەن

پەکەم جار و، کاری خراپ ئەکەن لە زەویدا، بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی هەبێ و بەجۆرێکی ناڕەوا لە سووری ڕاستی دەرئەچن، ئەو کەسانە سزایەکی ئازارداریان بۆ هەیە لای خودا.

﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾ وە بەڕاستی هەرکەسێ ئارامی گرتبێ لەسەر ئازار، لە ستەمکار خۆشببێ و، لەبەر ڕەزامەندی خودا و واز لە تۆڵەکردنەوە بهێنێ. بەڕاستی ئەو ئارامگرتن و لێبوردنە لەو کارەچاکانەیە بڕیاری لەسەر دراوە لە لایەن خوادۆوە، ئەبێتە هۆی ڕێگەگرتن لە خراپە و، ڕەوشتی بەرزی پێغەمەرانە و، زاڵبوونە بەسەر خراپەی دەروونداَ.

وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ
لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴿٤٤﴾
وَتَرَىٰهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ
مِن طَرْفٍ خَفِىٍّ ۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ
خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ
فِى عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم
مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ٱسْتَجِيبُوا۟
لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۚ مَا لَكُم
مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴿٤٧﴾ فَإِنْ أَعْرَضُوا۟
فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَإِنَّآ إِذَآ
أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ
بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ كَفُورٌ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا
وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ
وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾

﴿ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن وَلِيٍّ مِّن بَعْدِهِ وَتَرَى الظَّالِمِينَ لَمَّا رَأَوُا الْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَى مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ ﴾ وە هەرکەسێ خودا لە رێگەی ڕاست لابدا، دوایی بۆ ئەو کەسە نی‌یە هیچ کەسێ سەرداری‌بێ بۆلای رێگەیە لە دوای ئەوەی خودا لایداوە لە رێگەی ڕاست و، تۆ ستەمکاران ئەبینی کاتی سزای رۆژی دووایی ئەبینن، ئەڵێن: ئایا رێگەیە هەیە بۆلای گەڕانەوە بۆلای جیهان و هەتا ئێمە باوەڕبهێنین.

﴿ وَتَرَاهُمْ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا خَاشِعِينَ مِنَ الذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرْفٍ خَفِيٍّ ﴾ وە تۆ ستەمکاران ئەبینی ڕائەبوێرن بەسەر ئاگری دۆزەخدا، ئەترسن بە ڕسوایی و بێ‌نرخیەوە، لەلای گۆشەی چاویانەوە بە نهێنی تەماشای ئەو ئاگرە ئەکەن و، سەرشۆڕ ئەکەن و سەرهەڵنابڕن لە ترسانا، بە وێنەی کەسێ بیبەن بۆ کوشتن.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ الْخَاسِرِينَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَلَا إِنَّ الظَّالِمِينَ فِي عَذَابٍ مُّقِيمٍ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە ئەڵێن: بەڕاستی ئەو کەسانەی توشی زیان بوون کەسانێکی ئەوتۆن زیانیان لە خۆیان و لە خێزانەکانی خۆیان داوە لە رۆژی دواییدا، بە جۆرێ خۆیانیان کردووە بە خواردەمەنی بۆ ئاگر و، لە جیهاندا خێزانەکانیان فێری ئایین نەکردووە و، توشی سزای رۆژی دووایی بوون. ئێوە ئاگاداربن بەڕاستی ستەمکاران لە ناو سزایەکی بەردەوامدان لە رۆژی دواییدا.

﴿ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنْ أَوْلِيَاءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ اللَّهِ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِن سَبِيلٍ ﴾ و بۆ ستەمکاران هیچ دۆستێ نی‌یە دۆستایەتیان بکا و یارمەتیان بدا لە جگەی خوا، ڕزگاریان بکا لە سزای رۆژی دووایی و، هەرکەسێ خودا لە رێگەی ڕاست لای بدا، دوایی بۆ ئەو کەسە نی‌یە هیچ جۆرە رێگەیە بیانبا بۆلای ڕزگارکردنیان.

﴿ اسْتَجِيبُوا لِرَبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُ مِنَ اللَّهِ ﴾ ئێوەی ئادەمیزاد وولامی ئەو شتە بدەنەوە پەروەردگاری خۆتان داواتان لێ‌ئەکات و، ئێوە باوەڕبهێنن لە پێش ئەوەی کە رۆژی بێت گەڕانەوەبۆ ئەو رۆژە نەبێ لە لایەن خواوە.

﴿ مَا لَكُم مِّن مَّلْجَإٍ يَوْمَئِذٍ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٍ ﴾ بۆ ئێوە نابێ لەو رۆژەدا هیچ پەناگایە و هیچ کەسێ ڕزگارتان بکا لە سزای خوا و، ئێوە توانای ئەوەتان نابێ بڕوا بەو شتە خراپانە نەیەرن کردووتانە و، بڵێن: ئێمە نەمانکردوون.

﴿ فَإِنْ أَعْرَضُوا فَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ ﴾ دوایی ئەگەر ستەمکاران ڕویان وەرگێڕا لە داوای خودا و باوەڕیان نەهێنا، دوایی ئێمە تۆمان ڕەوانە نەکردووە پاسەوانبی بەسەریانەوە، هیچ شتێ لەسەر تۆ نیە مەگەر تۆ پەیامی ئێمە بەوان ڕابگەیەنی و کردویشتە.

﴿ وَإِنَّا إِذَا أَذَقْنَا الْإِنسَانَ مِنَّا رَحْمَةً فَرِحَ بِهَا وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَإِنَّ الْإِنسَانَ كَفُورٌ ﴾ وە بەڕاستی هەرکاتێ ئێمە بەخشیێتمان بە ئادەمیزاد لە لایەن خۆمانەوە چاکەیە لەلەش ساغبو هەرزانی و پلەوپایە دڵشاد بووە بەو چاکەیەوە لە خۆی ئەگۆڕا و، ئەگەر

تووشی ئەوان ببوایە خراپە و ئازاری لە گرانی و نەخۆشی و، هەژاری بەهۆی ئەو شتەوە بە توانای خۆیان کردوویان لە پێشا لە بێفەرمانی خـودا، دوایی بە ڕاستی ئادەمیزاد سوپاسی خودایان نەکردووە لەسەر چاکەکانی پێشوو.
﴿ لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَنْ يَشَاءُ إِنَاثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَاءُ الذُّكُورَ ﴾ بۆ خودایە خاوەنییەتی و پاشایەتی ئاسمانەکان و زەوی و هەر خودا ئەیانپارێزێ، دروست ئەکا هەرشتێ ئارەزۆی بکا و، کەس ناتوانێ بەرەنگاری بکا، خودا ئەبەخشێ منالی مێینە بەهەرکەسێ ئارەزۆی بکا و منالی نێرینەی نابێ، ئەبەخشێ بە هەرکەسێ ئارەزۆی هەبێ منالی نێرینە و مێینەی ناداتێ.
﴿ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا وَيَجْعَلُ مَن يَشَاءُ عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴾ خودا کۆ ئەکاتەوە بۆیان هەردوولایان، دوایی منالی نێرینە و مێینەیان ئەداتێ و، خـودا دروست ئەکا هەرکەسێ ئارەزۆی بکا بە نەزۆك و منالی نابێ. بەراستی ئەزانێ بەشتێ دروستی بکا، توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە کە دروستی بکا. لە پێغەمەراندا ئەو فەرمودانەی خودا ڕەچاو ئەکرێ. بۆ نموونە: لوت هەر کچی بووە و کوری نەبووە. ئیبراهیم هەر کوڕی هەبووە و کچی نەبووە، پێغەمـەری ئیسلام خودا کوڕ و کچیشی داوەتێ. ئادەمیزاد بە دەستی خۆی نیە منالەکان نێربن یا مێ بن یا هەردوولایانبێ، یا نەزۆك بێ، ئەوانە هەموویان بە دەست و توانای خودان.
بۆ زانین: هەتا ئیستا زانایانی پزیشکی ڕێگەیان نەبردووە بۆلای چارەسەرکردنی نەزۆکی لە پیاوان و لە ژناندا، پزیشکەکان پەنایان بردووە بۆلای موتوربەی دەستکرد هەرکاتێ پیاوەکە نەزۆکبێ. بە جۆرێ تۆوی جگەی مێرد ئەکەنە مندالانی ژنەوە، ئەو جـۆرە کارە قەدەغەیە و، ئەگەر بەو کارە مندالێ پەیدابوو ئەبێ بە مندالی ئەو ژنە و پەیوەندی بە پیاوەکەوە نییە بە هیچ جۆرێ وەك بێگانە وایە بۆی، ئەگەر ئەو کارە ئەنجام بدرێ بە بێ مێرد ئەو مندالە نابێ بە مندالی هیچ کەسێ لە پیاوان.

وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾
وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾

جووەکان بە پێغەمەریان ووت: ئەگەر تۆ پێغەمەری خودای، گفتوگـۆ لـەگـەڵ خـوادا بکـە ڕاستەوخۆ، تەماشای بکە، بەوێنەی موسا، ئێمە باوەڕ بە تۆ ناهێنین هەتا تۆیش ئەو کارە نەکەی، خودای مەزن فەرمووی: موسا خودای نەبینیوە، توانای ئەوەی نەبووە خودا ببینێ و، هیچ کەسێ فەرموودەی خودا نابیسێ بە جگەی ئەمانە:

١- ﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ اللَّهُ إِلَّا وَحْيًا ﴾ وە شایستە نی‌یە بـۆ هیـچ ئـادەمیزادێ کـە خودا گفتوگۆی لـەگەڵدا بکات لـە جیهاندا مەگەر بە سروش، سروشیش کارێکی نهێنی‌یە و بە گورجی پەیدائەبێ و ئەڕوا بە گوێرەی ویستی خودا، یا خودای مەزن ئەیخاتـە دڵـی کەسـێ بـۆ کردنی کارێ، وەك خودا خستیە دڵی ئیبراهیمەوە کە کوڕی خۆی سەرببڕێ. خستیە نـاو دڵـی دایکی موسا کە موسا بخاتە ناو سندوقێکەوە و، فڕەبداتە ناو ڕووباری نیلەوە.

٢- ﴿ أَوْ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ﴾ یا گفتوگۆی لـەگەڵ بکا لـە پشتی پەردەوە، بەبێ ئەوەی خودا ببینێ، وەك ئەوەی موسا فەرموودەی خودای بیست بە بێ ئەوەی خودا ببێنێ.

٣- ﴿ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِ مَا يَشَاءُ إِنَّـهُ عَلِـيٌّ حَكِيـمٌ ﴾ یـا خـودا فروسـتادەیە لـە فریشتەکان ڕەوانە بکابۆلای پێغەمەرێ، دوایی ئەو فریشتەیە سروش ببا بۆلای ئەو پێغەمەرە شتێ ئارەزۆ بفەرموێ بەهۆی دەستووری خۆیەوە، وەك ئەوەی جوبرەئیل زۆر جاران ئەڕۆیشت بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەڕاستی خودا زۆر بالادەست و بە دەستەڵاتە و، ڕێگەی بێ‌ناگـیرێ بـۆ کردنـی هەرکارێ بیەوێ، هەمو شتێ لـە جێگەی شیاوی خۆیـا دائـەنێ. خـودا گفتوگـۆ ئـەکا لـەگـەڵ پێغەمەران، جارێ بەهۆی فریشتەکانەوە ، جارێ بەبێ فریشتە.

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ﴾ وە هەر بەو جۆرەی ئێمـە سـروشمان نـارد بـۆلای پێغەمەرانی پێشوو، هەر بەو جۆرەیش ئێمە قورئانمان بە سروش ڕەوانە ئەکەین بۆلای تۆ بـەهۆی جبرئیلەوە فەرمانی ئێمە بە تۆ ڕابگەیەنێ، قورئان ناوبراوە بە ڕۆح؛ لەبەر ئەوەی ژیانە بۆ گیان و بۆ لـەش.

﴿ مَا كُنتَ تَدْرِي مَا الْكِتَابُ وَلَا الْإِيمَانُ ﴾ لە پێش ناردنی سروش بـۆلای تـۆ، تـۆ نەتئـەزانی نامەی خـودا چ شـتێکە و، دەسـتووری باوەڕهێنـان چۆنـە و، بـە چ جـۆرێ بـە دانیشـتووانی ڕابگەیەنین.

﴿ وَلَٰكِن جَعَلْنَاهُ نُورًا نَّهْدِي بِهِ مَنْ نَّشَاءُ مِنْ عِبَادِنَا ﴾ وە بـەلام ئێمـە قورئانمـان کـردووە بـە ڕووناکی‌یەك، ئێمە بەهۆی ئەو قورئانەوە ڕێگەی ڕاست نیشان ئەدەین بەهەرکەسـێ ئـارەزۆی بکەین لە بەندەکانی ئێمە.

﴿ وَإِنَّكَ لَتَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ صِرَاطِ اللَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ أَلَا إِلَى اللَّهِ تَصِيرُ الْأُمُورُ ﴾ وە تۆ بانگی ئادەمیزاد بکە بۆلای ڕێگەی ڕاستی ئایینی ئیسلام، ڕێگەی ئەو خودایەی ئەوتۆ شتێ لـە ئاسمانـەکان و لـە زەویدان هـەربۆ ئـەوە و، ئـەو سەرپەرشتیان ئەکات، ئێوە ئاگاداربن هەموو کارەکان هەر بۆلای خـودا ئەگەڕێتـەوە، هـەموو ئـادەمیزاد بـە گوێرەی کردەوەی خۆیان پاداشت وەرئەگرن.

# ﴿ سورەتی زوخروف ﴾

لە مەکە هاتوتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (٤٤) لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. هەندێ تریان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (٥٤) لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٨٩) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا
لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا
لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا
أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِىٍّ فِى
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِىٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ
﴿٧﴾ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ
﴿٨﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ
خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ
مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠﴾
وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا
كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ
لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا۟ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ
ثُمَّ تَذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا۟ سُبْحَٰنَ




## بسم الله الرحمن الرحيم

## بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

﴿ حم ﴾ مانای ئەو پیتانە لە سورەتی ئەلبەقەرە و سورەتەکانی تردا روون کراونەتەوە. بیگومان قورئان لەم پیتە و لە پیتەکانی تر پیکهاتووە، بە جۆرێ کەس ناتوانێ وینەی ئەم قورئانە یا سێ ئایەتی لیٚ‌دابنێ، بۆ ئەوەی ئەو کەسانە ئەلین: ئەم قورئانە دانراوی موحەمەدە. پەکیان بکەویت.

﴿ والکتاب المبین .إنا جعلناه قرآنا عربیا لعلکم تعقلون ﴾ سویندم بەو نامەیە فەرمانەکانی خودا و ریگەی راست و چاك جوێ ئەکاتەوە لە ریگەی چەوت و کردەوەی خراپ، بەراستی ئیمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بە زمانی عەرەبی، بۆ ئەوەی ئیوە ماناکەی بزانن و، بە باشی بیربکەنەوە لە مانا و ناوەرۆکی ئایەتەکانی و لە ئامۆژگاری و یاسا و دەستوورەکانی.

بۆ ئاگاداری: وینەی ئەم ئایەتە لە ئایەتی (٧)ی سورەتی یوسوف و لە ئایەتی (١١٣)ی سورەتی تاها و لە ئایەتی (٣)ی سورەتی سوژدە و لە ئایەتی (٧)ی سورەتی شورادا، دوپات کراونەتەوە، هاتنەخوارەوەی قورئان بە زمانی عەرەبی‌ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم قورئانە هەر بۆ نەتەوەی عەرەب نیررا بێ. بەلکو بۆ ئەو مەبەستەیە کە دانیشتووانی مەکە کە پیغەمەر لەناو ئەواندا بوە، یەکەم جار ئەوان لە ماناکەی بگەن، کە بە زمانی پاراوی خۆیان هاتوەتە خوارەوە. کەچی لە توانای ئەواندا نی‌یە وینەی ئەم قورئانە یا سێ ئایەتی دابنین.

﴿ وإنه في أم الکتاب لدینا لعلي حکیم ﴾ وە بەراستی قورئان وەرگیراوە لە ناو نامەیەکدا کە لەوحەلمەحفوزە سەرچاوەی هەموو ئاسمانی‌یەکانە، لەلای ئیمە پاریزراوە لە دەستکاری و گۆران، پلەوپایەیەکی زۆر بەرزی هەیە بەرانبەر بە نامەکانی تر، پەك خەری دوژمنانی پیغەمەرە، خاوەنی زانست و زانیاری‌یەکی بێ‌وینەیە، هەمو ئایەتەکانی لە جیگەی شیاوی خۆی‌دا دانراون.

﴿ أفنضرب عنکم الذکر صفحا أن کنتم قوما مسرفین ﴾ ئایا دوایی ئیمە واز لە ئامۆژگاریی و لە ترساندنی ئیوە ئەهینین بە واز لیهینان بە جۆرێ لە تاوانی ئیوە ببورین، قورئان ئەنیرینە خوارەوە، فەرمانتان پیٚ‌ئەدەین بە کردنی کاری چاك و نەکردنی کاری خراپ؛ لەبەر ئەوەی ئیوە تاقمیکن لە سنوور دەرچوو زۆر نەزانن.

﴿ وکم أرسلنا من نبي في الأولین ﴾ و ئیمە زۆر کەسمان لە پیغەمەران رەوانەکرد و لەناو نەتەوەکانی رابردوودا بۆلای ئەوان و، هەموویان پیغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆ ئەخستەوە.

﴿ وما يأتيهم من نبي إلا كانوا به يستهزؤون ﴾ وە هیچ پیغەمەرێ نەچوە بۆلای نەتەوەکانی پیشوو مەگەر ئەو نەتەوانە گالتەیان ئەکرد بەو پیغەمەرانە، هەر بەوجۆرەی قورەیشیەکان گالتە بە تۆ ئەکەن.

﴿ فأهلكنا أشد منهم بطشا ومضى مثل الأولين ﴾ دوایی تاقمیکمان لەناوبردن و زۆر بەهیزتربوون و چەك و ژمارەیان لە بت پەرستانی قورەیش زۆرتر بوە و، وینە و بەسەرهاتی گەلانی رابردوو لە قورئاندا باسیان کراوە، لەبەر ئەوەی ئەم گەلەی تۆ بیربکەنەوەو ئامۆژگاری وەربگرن.

﴿ ولئن سألتهم من خلق السماوات والأرض ليقولن خلقهن العزيز العليم ﴾ وە ئەگەر تۆ پرسیار لەم گەلەی خۆت بکەی چ کەسێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە لە وولامی تۆدا ئەلین: خودایەکی زۆر بە دەستەلات، زانا بە هەموو شتێ دروستی کردوون، کەچی جگەی خودا ئەپەرستن و بروایان وایە ناتوانێ مردووان زیندووبکاتەوە دوای مردنیان.

﴿ الذي جعل لكم الأرض مهدا وجعل لكم فيها سبلا لعلكم تهتدون ﴾ خودا کەسیکی ئەوتۆیە زەوی دروستکردووە بۆ ئیوە بە جیگەی دانیشتن بۆتان و، دروستی کردووە بۆ ئیوە لە زەوی‌دا چەندین ریگەیە، شارەزایی وەرگرن بەهۆی ئەوانەوە بڕۆن بۆ هەرجیگەیە ئارەزۆتان بێ.

﴿ والذي نزل من السماء ماء بقدر فأنشرنا به بلدة ميتا كذلك تخرجون ﴾ وە کەسیکی ئەوتۆ یەناردوویەتیە خوارەوە لە هەوری ئاسمانە و ئاوێ بە ئەندازەی پیویستی ئیوە و ژیانتان، نە ئەوەندە زۆربێ و نە ئەوەندە کەمبێ ئازارتان بدا، دوایی ئیمە بەو ئاوە زیندوو ئەکەینەوە جیگە و شاریکی مردووی بێ‌شینایی و بێ‌درەخت بە هاتنە دەرەوەی رووەکی جۆراوجۆر، هەربەوجۆرەیش ئیوە لە گۆرەکانتانا ئەهینرینە دەرەوە بە زیندوویی.

﴿ والذي خلق الأزواج كلها وجعل لكم من الفلك والأنعام ما تركبون ﴾ ووە کەسیکی ئەوتۆیە دروستی کردووە بۆ ئیوە هەموو جۆرە جوتەیە لە گیانداران و بێ‌گیان: هاوین و زستان. شەو و رۆژ. شیرین و تالّ. نیر ومێ. هەتا دێ دروستی کردووە بۆ ئیوە لە کەشتی‌یەکان و چوارپیکان شتێ ئیوە سواریان بن، هەروەها جگەی ئەوانیش لە فرۆکە و ترۆمبیل و جگەی ئەوانیش.

﴿ لتستووا على ظهوره ثم تذكروا نعمة ربكم إذا استويتم عليه ﴾ لەبەر ئەوەی ئیوە لەسەر پشتیان ئارام بگرن و دانیشن لەسەریان، بۆ هاتوچۆتان و پەیداکردنی گوزەرانتان، لە پاشان ئیوە بیر لە چاکەی پەروەردگاری خۆتان بکەنەوە هەرکاتێ ئیوە دانیشتن لەسەریان و بەکارتان هینان بۆ خزمەتکردنی خۆتان.

﴿ وتقولوا سبحان الذي سخر لنا هذا وما كنا له مقرنين وإنا إلى ربنا لمنقلبون ﴾ وە لەبەر ئەوەی ئیوە سوپاسی خودا بکەن و ئیوە بلین: چاك و دووری لە کاری نارەوا بۆ کەسیکی ئەوتۆ بێ ئەو شتەی ئیمە سودی ئەبینین و بۆی رامکردووین و، ئیمە توانای رامکردنی ئەم شتانەمان نی‌یە ئەگەر میهرەبانی تۆ نەبێ و، ئیمە بۆلای پەروەردگاری خۆمان ئەگەرینەوە.

وَجَعَلُوا۟ لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا ۚ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ
لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم
بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَٰنِ مَثَلًا
ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى
ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ
ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَٰدُ ٱلرَّحْمَٰنِ إِنَٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ
شَهَٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَٰنُ مَا عَبَدْنَٰهُم ۗ
مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ
كِتَٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا۟
إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾
وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَآ
إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾
۞ قَٰلَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ ءَابَآءَكُمْ ۖ قَالُوٓا۟
إِنَّا بِمَآ أُرْسِلْتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾

**﴿ وجعلوا له من عباده جزءا إن الإنسان لكفور مبين ﴾ وە لەگەڵ ئەویشدا بت پەرستان ئەڵین: خودا ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە، هەندێ لەبەندەکانی خودا بە پارچەیە لە خودا دائەنین و، لایان وایە فریشتەکان کچی خوان و بەشیکن لە خودا و، بەراستی ئادەمیزاد باوەڕیان بە چاکەکانی خودا نی‌یە بەسەریانەوە.**

**تەفسیری زمناکۆیی**

﴿ أم اتخذ مما يخلق بنات وأصفاكم بالبنين ﴾ ئایا خودا چۆن وەرگرێ هەندێ لەو شتەی خۆی و دروستی کردووە بە کچ بۆ خۆی کە لای ئیوە بێنرخە و، ئیوە هەلبژیرن بۆ خۆتان کورتان بداتێ کە لای ئیوە بەریزن، ئەو جۆرە بیرەی ئیوە زۆر نارەوایە و، ئیوە زۆر تاوانبارن، خودا منالی نەبوە نە کور و نەکچ.

﴿ وإذا بشر أحدهم بما ضرب للرحمن مثلا ظل وجهه مسودا وهو كظيم ﴾ وە هەرکاتێ موژدە بدرایە بەیەکێ لە بت پەرستان بە لە دایکبوونی شتێ ئەودای ئەنا بە وینە و پارچەیە لە خودا، روی ئەو کەسە لە خەفەتا رەش هەلئەگەرا و، دەروونی پر ئەبوو لە رق و خەفەتی ئەوەی کچی بوە.

﴿ أومن ينشأ في الحلية وهو في الخصام غير مبين ﴾ ئایا ئیوەی بت پەرست و نەزان مینەیەکی ئەوتۆ برازینیتەوە و، بەخیوبکرێ ئەیکەن بە بەشی خودا و، ئەو ژنە لە کاتی گفتوگۆ و ئاژاوەدا بە ئاشکرایی ناتوانێ بەرگری لە خۆی بکا و مەبەستی خۆی روون بکاتەوە.

﴿ وجعلوا الملائكة الذين هم عباد الرحمن إناثا أشهدوا خلقهم ستكتب شهادتهم ويسألون﴾ وە بت پەرستان ئەو فریشتانەی ئەوتۆ بەندەی خودای بەخشندەن ئەیان کەن بە ژن و بەکچی خودا، ئایا بێباوەران ئامادەی کاتی دروستکردنی ئەوانبوون هەتا بلین: ژنبوون و پیاونین، ئامادەبوونەکەیان ئەنوسرێ و تۆمار ئەکرێ لە نامەی کردارانا و، لە رۆژی دواییدا داوای جۆری ئەو ئامادەبوونەیان لێئەکرێ.

﴿ وقالوا لو شاء الرحمن ما عبدناهم ﴾ وە بت پەرستان ئەیان ووت: ئەگەر خودای خاوەن بەخشندە ئارەزۆی بکردایە ئیمە ئەو بتانە و فریشتانەمان نەئەپەرستن و، زۆری لێئەکردین نەیان پەرستبن، زۆر نەزانن و گومانیان وایە ئادەمیزاد بەردو درەختی بیگیانە و شایستەی پاداشت و تۆلەنین، ئادەمیزاد و خاوەنی ئەقلن چاك و خراپ جوێ ئەکەنەوە.

﴿ ما لهم بذلك من علم إن هم إلا يخرصون ﴾ بت پەرستان هیچ جۆرە زانیاری و بەلگەیەکیان نیە کە خودا رازی بوە بۆ پەرستنی ئەو بتانە و ئەو فریشتانە، ئەوان هیچ جۆرە بەلگەیەکیان نیە فریشتەکان ژنن و پەرستنیان دروستە جگەی لەوەی درۆ ئەکەن لەو گفتوگۆیەدا.

﴿ أم آتيناهم كتابا من قبله فهم به مستمسكون ﴾ ئایا ئیمە ناردوومانە بۆلای ئەوان نامەیە لە ئاسمانەوە لە پیش قورئانەوە بیژرابێ فریشتەکان کچی خوان؟ دوایی ئەوان دەست بگرن بەو نامەیە و کاری پێ بکەن. بیگومان نیانە.

﴿ بل قالوا إنا وجدنا آباءنا على أمة وإنا على آثارهم مهتدون ﴾ بەلکو ئەوان ئەلین: بەراستی ئیمە باوباپیری خۆمانمان دەستکەوتووە لەسەر ئەم ئایینە و ئەم ریگەیە بوون و، بەراستی ئیمە شارەزایی و وەرئەگرین لەسەر کار و کردەوەی ئەوان و، دوای ئەوان ئەکەوین و، واز لەو ئایینەی ئەوان نایەرن.

﴿ وكذلك ما أرسلنا من قبلك في قرية من نذير إلا قال مترفوها إنا وجدنا آباءنا على أمة وإنا على آثارهم مقتدون ﴾ وە هەر بەو جۆرەی ئیمە تۆمان رەوانەکردووە. ئیمە لە پیش تۆ و هیچ پیغەمەریکمان رەوانەکردووە لە ناو هیچ گوندیکا، دانیشتووانی ئەو گوندەی ترساندبیّ لە بیّفەرمانی خودا، ساماندار و سەرۆکەکانیان ئەیان ووت: بەراستی باوباپیری خۆمانمان دەست کەوتووە لەسەر ئەم ئایینە و ئەم ریگەیە و، بەراستی ئیمە لەسەر پاشماوە و کاری ئەوانین و دوای ئایینی ئەوان ئەکەوین.

﴿ قال أولو جئتكم بأهدى مما وجدتم عليه آباءكم ﴾ تۆ بلیّ بەو بیّباوەرانە: ئایا ئەگەر من بە ئایینیکی راست تر لەم ئایینە ئیمە باوباپیرانی ئیوەمان دەست کەوتوە لەسەری، بیم یۆلاتان هەر دوای ئەوان ئەکەون و، باوەر بە خودایەکی تەنها نایەرن؟

﴿ قالوا إنا بما أرسلتم به كافرون فانتقمنا منهم فانظر كيف كان عاقبة المكذبين ﴾ بیّباوەران لە بریتی ئەوەی بیربکەنەوە لە فەرموودەی پیغەمەرەکەیان ووتیان: ئیمە باوەرمان بە شتیّ نیە ئیوە بەو شتە نیراون بۆلای ئیمە، دوایی ئیمە تۆلەمان لە بیّفەرمانەکانی ئەوان کردەوە بنەبرمان کردن، دوایی تۆ تەماشا بکە چۆن بووە پاشەرۆژی ئەو کەسانە پیغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستوەتەوە، تۆ ئارام بگرە بەراستی ئایینی تۆ سەرئەکەویّ بەسەر ئەو ئایینە پوچەی ئەواندا.

وَإِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِ
إِنَّنِي بَرَاءٌ مِّمَّا تَعْبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا الَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُ سَيَهْدِينِ
﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةً بَاقِيَةً فِي عَقِبِهِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلْ
مَتَّعْتُ هَٰؤُلَاءِ وَآبَاءَهُمْ حَتَّىٰ جَاءَهُمُ الْحَقُّ وَرَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿٢٩﴾
وَلَمَّا جَاءَهُمُ الْحَقُّ قَالُوا هَٰذَا سِحْرٌ وَإِنَّا بِهِ كَافِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُوا
لَوْلَا نُزِّلَ هَٰذَا الْقُرْآنُ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنَ الْقَرْيَتَيْنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمْ
يَقْسِمُونَ رَحْمَتَ رَبِّكَ ۚ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ
الدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِّيَتَّخِذَ بَعْضُهُم
بَعْضًا سُخْرِيًّا ۗ وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوْلَا

أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةً وَٰحِدَةً لَّجَعَلْنَا لِمَن يَكْفُرُ بِٱلرَّحْمَٰنِ
لِبُيُوتِهِمْ سُقُفًا مِّن فِضَّةٍ وَمَعَارِجَ عَلَيْهَا يَظْهَرُونَ ﴿٣٣﴾
وَلِبُيُوتِهِمْ أَبْوَٰبًا وَسُرُرًا عَلَيْهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخْرُفًا وَإِن
كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ
لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾

﴿ وإذ قال إبراهيم لأبيه وقومه إنني براء مما تعبدون ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئیبراهیم بە باوکی و بە تاقمەکەی خۆی ووت: بەراستی من بیزارم لەشتێ ئیوە ئەیپەرستن جگە لە خودایەکی ئەوتۆ منی درووست کردووە.

﴿ إلا الذي فطرني فإنه سيهدين وجعلها كلمة باقية في عقبه لعلهم يرجعون ﴾ بەراستی ئەو خودایە منی درووست کردووە شارەزایی من ئەکا بۆلای ریگەی راستی ئایینی ئیسلام و، ئیبراهیم یەکیتی خوای کرد بە ووشەیە بەردەوامیێ لەناو ئەو مندالانەی لەدوای خۆیەوە پەیدا ئەبن، ئەوەبو هەندێ لە منالەکانی لەسەر ئایینی ئەومانەوە، داوایان لە ئادەمیزاد کرد بۆلای یەکیتی خودا، بۆ ئەوەی ئەو منالانەی ئەو بگەرینەوە بۆلای یەکیتی خودا و واز لە بت پەرستی بهینن.

﴿ بل متعت هؤلاء وآباءهم حتى جاءهم الحق ورسول مبين ﴾ بەلام من ئەوانەی ئیستا ماونەتەوە لەسەر بت پەرستی خۆیان و باوکیانم بەرخوردا کردووە و مۆلەتم دان هەتا چو بۆلای ئەوان قورئان و پیغەمەرێ فەرمان و یاسا و فەرمودەی خودایان بۆ روون بکاتەوە.

﴿ ولما جاءهم الحق قالوا هذا سحر وإنا به كافرون ﴾ وە کاتێ چوو بۆلایان قورئان و راستی ئایینی ئیسلام ئەو بت پەرستانە ووتیان: ئەو قورئانەیە جادوویەکی ئاشکرایە و، بەراستی ئیمە باوەرمان بەو قورئانە نایەرین و، بەبێنرخ تەماشای قورئانیان کرد.

﴿ وقالوا لولا نزل هذا القرآن على رجل من القريتين عظيم ﴾ وە بت پەرستانی قورەیش ووتیان: بۆ ئەو قورئانە نەنیراوەتە خوارەوە بۆسەر پیاویکی گەورەی ئەم دوو گوندەی مەکە و تایف کە خاوەنی دارایی و کەس و کاری زۆرن، چۆن هاتوەتە خوارەوە بۆ سەر موحەمەد کە هەژارە.

بت پەرستان گومانیان وابوو، لەبەر ئەوەی پیغەمەرایەتی پلەیەکی گەورەیە پیویستە بدرێ بە کەسیکی گەورە و ناودار و خاوەنی سامانبێ، وینەی وەلیدی کوری موغەیرە لە مەکە و، عورووەی کوری مەسعود لە تایف. بە ئەقلی ناتەواوی خۆیان وایان ئەزانی ساماندار نەبێ کەس

خاوەنی ریز نی‌یە. نەیان ئەزانی سامان نابیتە هۆی ریز، چونکە چاك و خـراپ و تاوانبـار ئەبنـە خاوەنی سامان، پلـەی پیغەمەرایەتی شایستەی کەسیکە خاوەنی گیانیکی پاکبێ وینەی موحەمـەد ﴿ﷺ﴾.

﴿ أهم يقسمون رحمة ربك نحن قسمنا بينهم معيشتهم في الحياة الدنيا ﴾ ئایا ئەو بێباوەرانە چاکە و پیغەمەرایەتی پەروەدگاری تۆبەش ئەکەن، هەتا بـە ویستی خۆمـان بیـدەن بـە کەسێ ئارەزۆیان هەبێ، ئیمە ژیان و گوزەرانی ئەوان بەش ئەکەین لـە نیـوان ئـەواندا لـە زیندەگـانی جیهاندا. کە ئەوان ناتوانن ژیانی خۆیان ببەن بەریوە کە تایبەتە بە خۆیانەوە. ئیتر چـۆن ئـەتوانن پلـەی پیغەمەرایەتی بدەن بە کەسێ خۆیان بیانەوێ. کەواتە ئیمـە بـە گویـرەی ویسـتی خۆمـان هەندێ کەس ئەکەین بە ساماندار و هەندێ تر بە هەژار و بێسامان، هەندێ بە خـاوەنی هـیز و هەندێ بەلاواز. هەر بەو جۆرەیش پیغەمەرایەتی بە دەستی ئیمەیە و، کەس ناتوانێ بەرگری لـە فەرمانی ئیمە بکا لـەسەر بەخشینی پلـەوپایەی هەردوو جیهان.

﴿ ورفعنا بعضهم فوق بعض درجات ليتخذ بعضهم بعضا سـخريا ورحمـت ربـك خـير ممـا يجمعـون ﴾ وە ئیمـە پلـەوپایـەی هـەندێ ئـادەمیزاد بـەرز ئەکەینـەوە بەسـەر هـەندێ تریانـا، هەندیکیان بە سامانی زۆر و هەندیکیان بەسامانی کەم، هەندیکیان بە کاربەدەست و هەندیکیان بە کارگوزار. هەندیکیان بە زیرەك و هەندیکیان بە تەمەڵ، لـەبـەر ئـەوەی هـەندیکیان هـەندێ تریان بەکاربهینن لـە سوودی هەردوولایانا، بە گویرەی توانای خۆیان پیویستی یەکترێ جێبەجێ بکەن لـە جیهاندا، تەنها کەسێ بۆی ناگونجێ هەموو شتێ بزانێ و هـەموو کـارێ بکـا. بـەلکو پیویستی هەیە بە یارمـەتی دانـی جگـەی خـۆی لـە هـەندێ کـاردا، پیغەمەرایـەتی و چاکـەی پەروەردگاری تۆ بۆ تۆ چاکترە لـە شتێ ئەوان کۆی بکەنەوە لـە سامان و دارایی و، گـەورەیی و رۆزی لـە چاکەکانی خودایە نەك لـەو شتەی ئەوان کۆی بکەنەوە.

لـەبەر بەرژەوەندی ئـادەمیزاد بـە گشـتی: خـوای مـەزن هـەندیکیان ئـەکا بـە پیشەسـاز و هەندیکیان بە بازرگان. هەندیکیان بە جوتیار و هەندێ تریان بە پزیشك، هـەندێ بـە ئـەندازیار هەندی بە پاریزەر، هەندێ بە مامۆستا و هەندێ بە قوتابی، هەندێ بە فـەرمانرەوا و هـەندێ بـە کارمەند، هەریەکەیان پیویستی ئەوانی تر دابین بکەن لـەبەر بەرژەوەندی گشتی.

﴿ ولولا أن يكون الناس أمة واحدة ﴾ وە ئەگەر لـەبەر ئەوە نەبوایە کە ئادەمیزاد هـەموویان کۆببونایەتەوە لـەسەر بێباوەری و ببونایە بە یەك تاقم و، وازیان لـە رۆژی دوایی بهینایـە، کاتـێ چاویان بە بێباوەران بکەوتایە لـەناو گوزەرانی خۆش ئەژین لـە جیـهاندا و، دلیـان بـۆلای ئـەو خۆشی‌یە نەرۆیشتایە.

﴿ لجعلنا لمن يكفر بالرحمن لبيوتهم سقفا من فضة ومعارج عليها يظهرون ﴾ بەراستی ئیمـە ئەمانبەخشـی بـە کەسـێ بـاوەر نـەهینێ بـەخودای خـاوەنی بەخشـندە، سـەریان و روبـەری کۆشـکەکانیان لـەز بـوو بـە چـەندین پلیکانـە، لەوانـەوە سـەرکەون لـە قـاتی خـوارەوەی کۆشکەکانیان بۆ قاتی سەرەوە.

﴿ ولبيوتهم أبوابا وسررا عليها يتكؤون وزخرفا ﴾ وە ئیمە ئەمان بەخشی چەندین دەرگا بـە کۆشکەکانی ئەوان و، زیر بـۆ رازاندنـەوەیان و، چـەندین کورسـی و قەرەویلـە پـاڵ بدەنـەوە

لەسەریان و لەسەریان بخەون و، هەموو شتیکی تری نایاب؛ چونکە ئەوانە هەموویان بیّنرخن لای ئیمە.

﴿ وإن كل ذلك لما متاع الحياة الدنيا والآخرة عند ربك للمتقين ﴾ وە بەراستی ئەوانەی باسکران لە جۆری ئەو کۆشکانە رابواردنی ژیانی جیهانە و بەردەوام نابێ و بێنرخە و، پاداشتی رۆژی دوایی لای پەروەردگاری تۆ بۆ ئەو کەسانەیە لە خودا ئەترسن و خۆیان لە گوناه ئەپاریزن.

وَمَن يَعۡشُ عَن ذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ نُقَيِّضۡ لَهُۥ شَيۡطَٰنٗا
فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٞ ٣٦ وَإِنَّهُمۡ لَيَصُدُّونَهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحۡسَبُونَ
أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ٣٧ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيۡتَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ
بُعۡدَ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرِينُ ٣٨ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ
إِذ ظَّلَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ ٣٩ أَفَأَنتَ تُسۡمِعُ
ٱلصُّمَّ أَوۡ تَهۡدِي ٱلۡعُمۡيَ وَمَن كَانَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ٤٠
فَإِمَّا نَذۡهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنۡهُم مُّنتَقِمُونَ ٤١ أَوۡ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِي
وَعَدۡنَٰهُمۡ فَإِنَّا عَلَيۡهِم مُّقۡتَدِرُونَ ٤٢ فَٱسۡتَمۡسِكۡ بِٱلَّذِيٓ أُوحِيَ
إِلَيۡكَۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ٤٣ وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ
وَسَوۡفَ تُسۡـَٔلُونَ ٤٤ وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ
أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ ٤٥

﴿ ومن يعش عن ذكر الرحمن نقيض له شيطانا فهو له قرين ﴾ وە هەرکەس واز لە قورئانی خودای خاوەند بەخشندەی بهینێ و خۆی لە ئاستی کویربکا، ئیمە بۆ ئەو کەسە ئامادە ئەکەین شەیتانێ دەستەلات پەیدائەکا بەسەریا، دوایی ئەو شەیتانە ئەبێ بە هاونشینی و لیی جوێ نابیتەوە لە جیهاندا و، فریوی ئەدا و کاری خراپی پێ ئەکا.

﴿ وإنهم ليصدونهم عن السبيل ويحسبون أنهم مهتدون ﴾ وە بە راستی ئەو شەیتانانە دواکەوتووانی خۆیان لائەدەن لە ریگەی باوەرهینان و لە ریگەی شارەزایی یاسای قورئان و، گومان ئەبەن کە بەراستی خۆیان ریگەی راستیان وەرگرتووە و، شەیتان فریوی داون.

﴿ حتى إذا جاءنا قال يا ليت بيني وبينك بعد المشرقين فبئس القرين ﴾ هەتا کاتێ ئیمە دواکەوتووی ئەو شەیتانە زیندوو ئەکەینەوە لە رۆژی دواییدا بۆلای ئیمە بۆ پرسیار و سزا، ئەڵێ: خۆزگایە نیوانی من و نیوانی تۆ، بە ئەندازەی دوری خۆرئاوا و خۆرهەڵات بوایە، دوایی بە شەیتان ئەڵێ: تۆ خراپ و هاونشینی بوی بۆ من.

﴿ ولن ينفعكم اليوم إذ ظلمتم أنكم في العذاب مشتركون ﴾ وە هاوبەشبوونی ئیوە لەناو سزای ئاگری دۆزەخدا سود بە ئیوە نابەخشێ لەم رۆژەی دواییدا، کاتێ ئیوە ستەمتان لە خۆتان کردووە لە جیهاندا، هەمو یەکێ لە ئیوەو بەشی تەواوی خۆتان لە سزای ئاگر وەرئەگرن.

﴿ أفأنت تسمع الصم أو تهدي العمي ومن كان في ضلال مبين ﴾ ئایا دوایی تۆ ئەتوانی راستی ببیسینێ بە کەسێ خۆی کەرکردبێ، یا ئەتوانی شارەزایی پیاویکی کویر بکەی بۆلای ریگەی راست و، یا لە ناو گومرایی‌یەکی ئاشکرای وابێ کە بەبێ باوەر بمرێ لە جیهاندا، دوایی تۆ دلی خۆت بەبۆنەی بێباوەری ئەو کەسانەوە تەنگ مەکە.

﴿ فإما نذهبن بك فإنا منهم منتقمون ﴾ دوایی ئەگەر ئیمە تۆ ببەینەوە بۆلای خۆمان و، جیهان بەجێ بهیلی، بەر لەوەی سزادانی ئەوان ببینی، بەراستی تۆلە لەوان ئەکەینەوە و، لە هەردوو جیهاندا سزایان ئەدەین.

﴿ أو نرينك الذي وعدناهم فإنا عليهم مقتدرون ﴾ یا ئەگەر ئیمە بمانەوێ ئەو شتەی ئەوتۆ ئیمە ئەوانمان پێترساندووە، نیشانی تۆی بدەین بەر لە مردنی تۆ و جیهان بەجێ بیلی، دوایی بەراستی ئیمە توانامان بەسەر سزادانی ئەواندا هەیە، هەروایشبوو هەندێ لەو سزایانە تووشی بێباوەرانبو، هەندیکیان کوژران و دیلکران.

﴿ فاستمسك بالذي أوحي إليك إنك على صراط مستقيم ﴾ دوایی تۆ دەس بگرە بەو قورئانەی ئەوتۆ بە سروش نیراوە بۆلای تۆ، با ئەوانیش بەدرۆت بخەنەوە، بەراستی تۆ لەسەر ریگەیی راستیت و خودا یارمەتیت ئەدا.

﴿ وإنه لذكر لك ولقومك وسوف تسألون ﴾ وە بەراستی قورئان ریزە بۆ تۆ و بۆ کەسێ کاری پێبکا لە تاقمی تۆ، باوەری پێبهینێ و، دوایی ئیوە پرسیارتان لێئەکرێ لە رۆژی دواییدا، ئایا ئیوە کارتان کردووە بە یاساکانی.

﴿ واسأل من أرسلنا من قبلك من رسلنا أجعلنا من دون الرحمن آلهة يعبدون ﴾ وە تۆ پرسیار بکە لەو کەسانەی باوەریان هیناوە بە پیغەمەران ئیمە رەوانەمان کردووە لە پیش تۆ و لە پیغەمەرەکانی ئیمە. ئایا ئیمە دامان ناوە چەند خودایە بپەرستین لە جگەی خودایە خاوەنی بەخشندەیی‌یە بۆ هەموو بوونەوەران.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا
مُوسَىٰ بِـَٔايَـٰتِنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّى رَسُولُ

رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنْهَا يَضْحَكُونَ ﴿٤٧﴾
وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ۖ وَأَخَذْنَٰهُم
بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا
رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ
ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ
قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِى مِن
تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ
وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ
مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ
فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا
ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُمْ
سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْـَٔاخِرِينَ ﴿٥٦﴾

**﴿ ولقد أرسلنا موسى بآياتنا إلى فرعون وملئه فقال إني رسول رب العالمين ﴾** وە بەراستی ئیمە موسامان رەوانە کرد بۆلای فیرعەون و تاقمە بەناوبانگەکانی فیرعەون بەچەند کاری پەك خەری ئاشکرای ئیمە، دوایی موسا ووتی بەوان: بەراستی مـن پیغەمـەری پـەروەردگاری هـەمو بونەوەرانم، موسایش وەك تۆ کەم سامانبوو. کەواتە هەژاری و کەم سامانی لای خودا بەریزە.

**﴿ فلما جاءهم بآياتنا إذا هم منها يضحكون ﴾** دوایی کاتـێ موسـا چـو بۆلایـان بـەو کـارە ئاشکرا و پەك خەرانـەی ئیمـەوە، کوتوپـر بـەبێ بیرکردنـەوە ئـەوان بـەو کـارە پـەك خەرانـە پیئەکەنین و گالتەیان پیئەکردن.

**﴿ وما نريهم من آية إلا هي أكبر من أختها وأخذناهم بالعذاب لعلهم يرجعون ﴾** وە ئیمـە نیشانی فیرعەون و تاقمەکەیمان نەئەدا هیچ سزا و نیشانەیە مەگەر دواییان گـەورەتربوو لـەوەی پیشویان و، ئیمە ئەوانمان توشی سزاکرد یەك لـە دوای یەك بۆ ئەوەی لە بێبـاوەری بگەریتـەوە

و، واز لە بێفەرمانی خودا بهینن بەهۆی ئەو سزایانەوە کە بریتی بوون لەمانـە: لافـاو. کولـە. ئەسپێ. بۆق. خۆین. گۆڕانی دەم و چاویان. چەند سالێ گرانی. بۆیە داوایان لە موسا کرد داوا بکات ئەو سزایانە لەسەریان هەلگیرێ.

﴿ وقالوا یا أیها الساحر ادع لنا ربك بما عهد عندك إننا لمـهتدون ﴾ وە کاتـێ فیرعـەون و تاقمەکەی ئەو سزایانەیان ئەبینی ئەیان ووت: ئەی کەسێ کە تۆ جادوگەری: لە پـەروەردگاری خۆت داوا بکە بەهۆی ئەو بەلینە دراوە بـەتۆ، کـە تـۆ پیغەمـەری پارانـەوەی تـۆ وەرئـەگیرێ پەروەردگاری تـۆ ئـەم سـزایەمان لەسـەر لابـا، بەراسـتی ئیمـە باوەرئـەهینین، داواکـاری تـۆ وەرئەگرین.

﴿ فلما كشفنا عنهم العذاب إذا هـم ینکثـون ﴾ دوایـی کاتـێ ئیمـە ئـەو سـزایەمان لابـرد لەسەریان بەهۆی پارانەوەی موسا و، کوتوپڕ بەبێبیرکردنەوە پەیمانی خۆیانیان شکاند و باوەریان نەهینا بەراستی موسا.

﴿ ونادى فرعون في قومه قال یا قوم ألیس لي ملك مصر وهذه الأنهار تجري من تحتي أفلـا تبصرون ﴾ وە فیرعەون دوای ئەوەی کارەپەك خەرەکانی موسای بینی، لەناو تاقمەکـەی خۆیـا جاری داو خوتبەی بۆ خویندنەوە و، ووتی: ئەی کۆمەڵ و تاقمی من: ئایا پاشایەتی زەوی میسر و سامانی ئەم هەریمە و، ئەم روبارانە ئەروا بە ژیر ئەم کۆشکانەدا سامانی من نین، ئایا پاشـایەتی من و هەژاری موسا و، هیزی من و لاوازی موسا نابینن؟

﴿ أم أنا خیر من هذا الذي هو مهین ولا یکاد یبین ﴾ بەلکو بیگومـان چاکـترم بـەهۆی ئـەم سامانە زۆرەوە لەم کەسەی ئەوتۆ لاواز و بێنرخە و شایانی سەرۆکایەتی نیە و، نزیك نیە بتوانی گفتوگۆی خۆی ئاشکرا بکات. رەوشتی میسریەکان بەجۆرێ بو کاتـێ یـەکیکیان بکردایـە بـە گـەورەی خۆیـان، بازنـەی زیریـان ئـەکردە دەسـتی و ملوانکـەی زیریـان ئـەکردە ملـــی و، ئەیانرازاندەوە بە خشلی جۆراوجۆر، بۆیە فیرعەون ووتی:

﴿ فلولا ألقي علیه أسورة من ذهب أو جاء معـه الملائکـة مقـترنین ﴾ دوایـی ئەگـەر پلـەی بەرزی دراوەتێ بۆ فرە نادرێ بەسەر موسادا چەند بازنەیە لە زیر، دوایـی بـە چ جـۆرێ داوای گەورەیی ئەکا و، ئەیەوێ ببێ بە رابەر و گەورەتان، بەبێ ئەوەی خاوەنی زیر و نیشانەی رابەری پیوە بێ، یا ئەگەر پیغەمەر و رابەرە ئەبوایـە لەگـەڵ موسـادا بونایـە فریشـتەکان، لـە دوایـەوە بڕۆشتنایە لەناو پیاوەکانیا و، لەو جوێ نەبونایەوەەە.

﴿ فاستخف قومه فأطاعوه إنهم كانوا قوما فاسقین ﴾ دوایی فیرعـەون تاقمەکـەی خـۆی بـە نـەزان دانـاو دەسـتی گـرت بەسـەر ئـەقلیانا و، دوایـــی پـەیرەوی فیرعـەونیان کـرد لـە بەدرۆخستنەوەی موسا، بەراستی تاقمی فیرعەون تاقمـێ بـون لایـان دابـو لـە ئـایینی خـوادا و پەرستنی خوادا.

﴿ فلما آسفونا انتقمنا منهم فأغرقناهم أجمعین فجعلناهم سلفا ومثلا للآخرین ﴾ دوایی کاتـێ ئەو تاقمە ئیمەیان تورەکرد بە کردنی گوناهی نالەبار، ئیمە تۆلەمان لەوان کـردەوە و، شـایانی

سزابوون. دوایی ئەوانمان بەگشتی خنکان بە ئاوی دەریای سور، دوایی ئەوانمان کرد بە پیشەوای بێباوەڕان بۆلای ئاگری دۆزەخ و، بە ئامۆژگاری کردن و تەمێ کردن و پەند بۆ ئەو کەسانەی باوەڕناهێنین بە پیغەمەرەکانیان.

وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ
مَثَلًا إِذَا قَوۡمُكَ مِنۡهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓاْ ءَأَٰلِهَتُنَا
خَيۡرٌ أَمۡ هُوَۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلَۢاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾
إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ وَجَعَلۡنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ
﴿٥٩﴾ وَلَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِي ٱلۡأَرۡضِ يَخۡلُفُونَ ﴿٦٠﴾
وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمۡتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ
مُّسۡتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوٌّ مُّبِينٌ
﴿٦٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدۡ جِئۡتُكُم بِٱلۡحِكۡمَةِ
وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي تَخۡتَلِفُونَ فِيهِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ
﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسۡتَقِيمٌ
﴿٦٤﴾ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُواْ
مِنۡ عَذَابِ يَوۡمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن
تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةً وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٦٦﴾

کاتێ پیغەمەری خودا ئایەتی (٩٨)ی سورەتی (ئەلئەنبیائی) خویندەوە بەسەر قورەیشیەکاندا کە ئەفەرموێ: ﴿ﷺ﴾ بە راستی ئیوە و شتێ ئیوە ئەیپەرستن سوتەمەنی دۆزەخن.

قورەیشیەکان ووتیان: ئەم گفتوگۆیەی تۆیە بۆ هەر پەرستراویکە لە جگەی خودا، پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: بەلێ. ووتیان: کەواتە عیسا و عوزەیر و فریشتەکان ئەپەرسترین. ئەوان بچنە ناو دۆزەخ، با ئیمەش و بتەکانیشمان بچینە ناو دۆزەخ. خوای مەزن فەرمووی:

﴿ ولما ضرب ابن مريم مثلا إذا قومك منه يصدون ﴾ وەهـەرکاتێ عیسـای کـوری مەریـەم بەوینە ئەهینراوە لـە لایـەن هـەندێ لـە بـت پەرسـتانەوە کـە ئـەیووت: عیسـایش لـە لایـەن گاورەکانەوە ئەپەرسترێ، کاتێ ئەویش بکرێ بە سوتەمەنی دۆزەخ، ئیمەیش رازیـن بچینـە نـاو دۆزەخ، دوایی تاقمەکەی تۆ لـە خۆشیاندا دەنگیان بەرزئەکردەوە و لـە بۆ ئەو وینە هینانەوەیە.

﴿ وقالوا أآلهتنا خير أم هو ﴾ وە قورەیشیەکان بە پیغەمەریان ووت ﴿ﷺ﴾ ئایـا خوداکـانی ئیمە چاکترە لای تۆ یا عیسای کوری مەریەم؟ دیارە عیسای کوری مەریەم لای تۆ چاکترە، کـە ئەو بچیتە ناو ئاگر کە ئیمە و خوداکانمان لـەگەڵ ئەودا بین لـەناو ئاگری دۆزەخـدا رازیـن بـەو کارە.

﴿ ما ضربوه لك إلا جدلا بل هم قوم خصمون ﴾ ئەو وینەیان ئاراستەی تـۆ نەئـەکرد لـەبـەر ئەوەی راستی دەسبکەوێ بەلـکو هەر لـەبەر ئەوەبو دوژمنایەتی تۆ بکـەن و گفتوگـۆی نابـەجێ ئاراستەی تۆ بکەن و، ئەگینا ئەیانزانی مەبەستی تۆ لـەو پەرستراوانە بتـەکانی ئەوانـە بـە تەنـها. بەلـکو ئەوانە تاقمیکن دوژمنی سەختی تۆن و گفتوگۆی نارەوا لـەگەڵ تۆ بەکارئەهینن.

﴿ إن هو إلا عبد أنعمنا عليه وجعلناه مثلا لبني إسرائيل ﴾ عیسای کوری مەریەم بـەو جـۆرە نیە ئیوە ئەیلین بەلـکو بەندەی دروست کراوی ئیمەیە و، ئیمە چاکەی خۆمانمان بەسەر داریـژاو کردمان بە پیغەمەر و خودا نیە و، کردومانە بە وینەیەکی سەرسورینەر بۆ بەنو ئیسرائیلیەکان و بەوینە بیگیرنەوە بۆ خۆیان و، بیکەن بە بەلـگە لـەسەر توانای ئیمە، بە وینەی ئـادەم ئیمـە بـەبێ باوك دروستمان کردووە. بەلاّم لە جیاتی ئەوەی لـە خـودا بترسـن، لـەبارەی عیسـا و دایکـی عیساوۆ، بوختانی وایان بۆ کردوون ئاسمان برووخینێ.

﴿ ولو نشاء لجعلنا منكم ملائكة في الأرض يخلفون ﴾ وە ئەگـەر ئیمـە ئـارەزۆ بکـەین لـە جیاتی ئیوە فریشتەکان دروست ئەکەین و، ئیوە لـەناو ئەبەین و ئەوان لە زەوی‌دا جیگەی ئیـوە ئەگرنەوە، بێفەرمانی خوا ناکەن و، ئیمە پیویستمان بە ئیوە و بە پەرستنی ئیوە نیە.

﴿ وإنه لعلم للساعة فلا تمترن بـها واتبعـون هـذا صـراط مسـتقيم ﴾ بەراسـتی قورئـان بـە ئادەمیزادی راگەیاند وە رۆژی دوایی دیت، هەوالی داونەتێ زۆر سامناکە. دوایی ئیوە گومانتان لە پەیدابوونیانەبێ. بیگومـان کـەس نازانـێ چ کاتـێ رۆژی دوایـی پەیدائـەبێ. بـەلاّم قورئـان ئاگاداری ئادەمیزادی کـردووە بـە هـاتنی نیشـانەی نزیکـی هـاتنی رۆژی دوایـی زۆرن: هاتنـە خوارەوەی قورئان. رەوانەکردنی پیغەمەری ئیسلام. هاتنە خوارەوەی عیسا. کوشتنی دەجال لـە لایەن عیساوۆ. چەند شتی تریش، دوایی ئیوە دوای دەستووری من بکەون کە لـەلای خواوە بـۆم هاتووە، ئەوەی من لـەسەریی ریگەیەکی راستە، ئیوە ئەگەیەنێ بە ئـاوات وبـەختیاری هـەردوو جیهانتان.

﴿ ولا يصدنكم الشيطان إنه لكم عدو مبـين ﴾ وە شـەیتان ئیـوەە لانـەدا لـە راسـتی و لـە کارکردن بە یاسای قورئان. بەراستی شەیتان و دوژمنیکی ئاشکرای ئیوەیە و، هاتنتـان ئـەدا بـۆ کردنی کاری خراپ و قیزەون.

﴿ ولما جاء عيسى بالبينات قال قد جئتكم بالحكمة ﴾ وە كاتێ عیسا بەچەند بەلگەی ئاشكرا و كاری پەك خەر چو بۆلای بەنوئیسرئیلیەكان، بەوینەی زیندووكردنەوەی مردووان، رزگاركردنی بەلەكاویەكان. هەوالدانی بە شتە نهینی‌یەكان. عیسا بە بەنوئیسرائیلیەكانی ووت: من هاتووم بۆلای ئیوە لە لایەن خوادوۆ بە یاسایكی پر لە زانست و كاركردن بە یاسای ئینجیل كە لە لای خوداوە بۆم نیردراوە.

﴿ ولأبين لكم بعض الذي تختلفون فيه فاتقوا الله وأطيعون ﴾ وە من هاتووم بۆلای ئیوە لەبەر ئەوەی بەراستی رونی بكەمەوە هەندێ لەو شتەی ئەوتۆ، بیروباوەرتان جیاوازە لەو شتەدا، لەبارەی یاسا و دەستووری ئایینەوە، نەك لەبارەی كاروباری جیهانەوە، دوایی ئیوە لەخودا بترسن و بێ‌فەرمانی خودا مەكەن و، پەیرەوی من بكەن لەو كارانەدا من داواتان لێ‌ئەكەم.

﴿ إن الله هو ربي وربكم فاعبدوه هذا صراط مستقيم ﴾ بەراستی خودا پەروەردگاری من و ئیوە یە، دوایی ئیوە هەر ئەو بپەرستن، ئەمەی من دوای لە ئیوەی ئەكەم ریگەی راستە، ئیوە ئەگەینێ بەبەختیاری.

﴿ فاختلف الأحزاب من بينهم فويل للذين ظلموا من عذاب يوم أليم ﴾ دوایی تاقمە یەك گرتوەكانی گاور و جوەكان لە نیوخۆیانا تیك چون و بیروباوەری خراپیان لێ‌پەیدا بوە، جوەكان ئەیان ووت: عیسا منالیكی نائاساییە، ئەوەیش دژی بیروباوەری موسلمانان و گاورەكانە. گاورەكانیش لە نیوخۆیانا بون بەسێ تاقم، نەستوریەكان ئەلین: عیسا كوری خودایە، یەعاقیبیەكان ئەلین: عیسا راستەوخۆ خودایە، مەلكانیەكان ووتیان: عیسا سێ‌هەمی سێ‌خودان. خودا و، روحول‌قودس و، عیسا. دوایی هاوار و سزای گران بۆ كەسانیكی ئەوتۆیە ستەمیان لە خۆیان كرد، لە سزای رۆژیكی خاوەن ئازار توشی ئەوان ئەبێ.

﴿ هل ينظرون إلا الساعة أن تأتيهم بغتة وهم لا يشعرون ﴾ بەراستی قورەیشیەكان و ستەمكاران چاوەروانی هیچ شتێ ناكەن مەگەر چاوەروانی رۆژی دوایی ئەكەن، كۆتوپر دیت بۆلایان و، ئەوان هەستی پێ ناكەن. بیگومان ئەو كاتە پاداشتی بێ‌باوەری و ستەمكردنی خۆیان وەرئەگرن.

ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ

وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الْأَنفُسُ وَتَلَذُّ الْأَعْيُنُ وَأَنتُمْ فِيهَا
خَالِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ
تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾
إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي عَذَابِ جَهَنَّمَ خَالِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ
فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا هُمُ الظَّالِمِينَ ﴿٧٦﴾
وَنَادَوْا يَا مَالِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ قَالَ إِنَّكُم مَّاكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ
جِئْنَاكُم بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَارِهُونَ ﴿٧٨﴾ أَمْ أَبْرَمُوا أَمْرًا
فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَاهُم بَلَىٰ
وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾

﴿ الأخلاء يومئذ بعضهم لبعض عدو إلا المتقين ﴾ هەمو دۆست و خۆشەویستان لەکاروباری جیهاندا لەم رۆژەی دواییدا هەندیکیان دوژمنی هەندێ تریانن، جگە لەو کەسانەی لەخودا ترساون و خۆیانیان لەکردەوەی خراپ پاراستوە، ئەو کەسانە دۆستایەتیان بەردەوامە، بە پیچەوانەی بێباوەڕان.

﴿ یا عباد لا خوف علیکم الیوم ولا أنتم تحزنون ﴾ ئەی ئەو بەندانەی من کە خۆتانتان لە گوناە پاراستوە لەم رۆژەی دواییدا هیچ ترسیکتان لەسەر نیە بۆ سزادانتان و، ئیوە خەفەت بۆ هیچ شتێ مەخۆن، بە ئاواتی خۆتان ئەگەن.

﴿ الذین آمنوا بآیاتنا وکانوا مسلمین ادخلوا الجنة أنتم وأزواجکم تحبرون ﴾ ئەو بەندانەی من کەسانیکی ئەوتۆن باوەڕهیناوە بە ئایەتەکانی نامەی ئیمە و بە رۆژی دوایی بە نیازی پاکەوە و، مل کەچی فەرمانەکانی ئیمە بون، ئیوە و خیزانە باوەڕدارەکانتان بچنە ناو بەهەشت ئیوە شادمان ئەکرین بە پاداشتی زۆر نایاب.

﴿ یطاف علیهم بصحاف من ذهب وأکواب وفیها ما تشتهیه الأنفس وتلذ الأعین وأنتم فیها خالدون ﴾ ئەگیرێ بەسەریانا چەندین سینی زیر پرە لە خواردەمەنی نایاب و، بەچەندین پەرداخی پر لە خواردنەوەی بەتام و، لەناو بەهەشتا هەیە شتێ دەرونیان ئارەزۆی بکا و، چاویان بە بینینی گەش ببیتەوە و، ئەوان بەردەوامن لەناو ئەو بەهەشتەدا، هەتا هەتایە.

﴿ وتلك الجنة التي أورثتموها بما كنتم تعملون لكم فيها فاكهة كثيرة منها تأكلون ﴾ وە ئەو بەهەشتەی ئەوتۆ بەخشراوە بە ئیوەە و کراوە بە میراتی ئیوە بەهۆی شتیکەوە بوە ئیوە لە جیهاندا کردوتانە لە کارەچاکەکان بۆ ئیوە هەیە لە ناو ئەو بەهەشتەدا میوەی نایابی جۆراوجۆر، ئیوە ئەیان خۆن هەرکاتێ ئارەزۆی بکەن.

﴿ إن المجرمين في عذاب جهنم خالدون لا يفتر عنهم وهم فيه مبلسون ﴾ بەراستی تاوانباران لەناو سزای دۆزەخدان و بە بەردەوامی ئەو سزایە سوکناری بۆ ئەوان و، ئەوان بێئومیدن لە رزگاری بونی ئەو سزایە و لەسەریان لاناچێ.

﴿ وما ظلمناهم ولكن كانوا هم الظالمين ﴾ وە ئیمە ستەممان لەو تاوانبارانە نەکردوە لەناو ئەو سزایەدان و، بەلاّم خۆیان ئەو کەسانەن ستەمیان لە خۆیان کردووە، کەواتە شایستەی ئەو سزایەن، چونکە بێفەرمانی خودایان کردووە.

﴿ ونادوا يا مالك ليقض علينا ربك قال إنكم ماكثون ﴾ وە لەو کاتە نا ئومیدیەدا بانگ ئەکەن لە پاسەوانی دۆزەخ. تۆ داوا بکە لە پەروەردگاری خۆت فەرمانی مردن بدا بەسەر ئیمەدا، بۆ ئەوەی رزگارمان بێ لەم سزا سەختە، پاسەوانی دۆزەخ ئەلێ: دانیشن لەناو ئەو سزایەدا، بەراستی رزگاری ئیوە نابێ.

﴿ لقد جئناكم بالحق ولكن أكثركم للحق كارهون ﴾ خودا ئەفەرموێ بەو تاوانبارانە لەو کاتە نائومیدیەدا، بەراستی ئیمە هاتین بۆلای ئیوە بە کاریکی راستەوە کە ناردنی قورئان و پیغەمەر بوو، بەلاّم زۆرتر لە ئیوەە راستیتان پێ ناخۆشبوو، باوەرتان نەهینا.

﴿ أم أبرموا أمرا فإنا مبرمون ﴾ بت پەرەستان بەوەوە نەئەوەستان راستی بە درۆبخەنەوە. بەلاّم ئەوان هەموو پیلانیك و کاریکی خراپیان فەراهەم ئەهینا بۆ لەناوبردنی پیغەمەر و ئایینی ئیسلام، دوایی بەراستی ئەو پیلانەی ئەوانمان پوچ ئەکردەوە. ئەو فەرموودەی خودایە لەوەۆ هاتوە: بت پەرستانی قورەیش بریاریاندا لەهەر هۆزیکی قورەیش، پیاویکی ئازا و کارامە هەلبژیرن و برۆن موحەمەد بکوژن، هەتا خوینەکەی بلاّو ببیتەوە بەناو هەموو هۆزەکاندا، پیلانەکەیان ساختەهینا و چون بۆ کوشتنی پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ خوای مەزن و بەتوانا پیلانەکەیان پوچ کردەوە و، بە نەگبەتی خۆیان تەواوبوو.

﴿ أم يحسبون أنا لا نسمع سرهم ونجواهم بلى ورسلنا لديهم يكتبون ﴾ ئایا بت پەرستان گومان ئەبەن بەراستی ئیمە شاراوەی دلی ئەوان چپەی ئەوان نابیسین، بەلێ ئیمە ئەیان بیسین و ئاگامان لییانە و، فریشتەکانی ئیمە ئەوەی ئەوان ئەیلین و ئەیکەن لەلای خۆیانا ئەینوسن و تۆماری ئەکەن لەسەریان لەنامەی کرداریان.

قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا أَوَّلُ
ٱلْعَٰبِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ
عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ

ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ
إِلَٰهٌ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ
﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن
شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ
لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾

﴿ قل إن كان للرحمن ولد فأنا أول العابدين ﴾ تۆ بلێ بەو بت پەرستانە فریشتەکان ئەپەرستن گومانیان وایە کچی خودان و، بەو گاورانەیش بلێ کە مەسیح ئەپەرستن و گومانیان وایە کوری خوایە: ئەگەر خودای خاوەن بەخشندە منالی هەبوایە، دوایی من یەکەمین کەس ئەبووم ریزی ئەو منالە بگرم. بەڵام بێگومان خودا خاوەنی منالّ نەبووە و نایشبێ. کەواتە من خوا ئەپەرستم بەتەنها و ناگونجێ خودا منالی بێ.

﴿ سبحان رب السماوات والأرض رب العرش عما يصفون ﴾ پاکی و دووری بۆ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی‌یە، پەروەردگاری هەموو بوونەوەرانە، لە شتێ بێباوەران باسی ئەکەن و، گومانیان وایە خودا منالی هەیە، خوای مەزن لەو شتە ناشایستەیە دوورە.

﴿ فذرهم يخوضوا ويلعبوا حتى يلاقوا يومهم الذي يوعدون ﴾ دوایی تۆ واز لەو بێباوەرانە بهێنە بادەست بکەن بە گفتوگۆی پروپوچ و بچنە ناوکاری نارەوای خۆیان و، یاری خۆیان بکەن لە جیهاندا بە ئارەزۆی خۆیان، هەتا ئەگەن بەو رۆژەی ئەوتۆی خۆیان بەڵینی پێ دراوە تووشی ئەوان ئەبێ کە رۆژی دواییە، ئەو کاتە چاك و خراپیان بۆ ئەکەوێ و پاداشتی خراپەی خۆیان وەرئەگرن.

﴿ وهو الذي في السماء إله وفي الأرض إله وهو الحكيم العليم وتبارك الذي له ملك السماوات والأرض وما بينهما ﴾ وە خودا کەسیکی ئەوتۆیە شایستەی پەرستنە بە تەنها لە ئاسمانەکان و لە زەوی‌دا لە جگەی ئەوانیشدا و، خودایەکی هەموو شتێ لە جیگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، ئەزانێ بەو شتانەی رابوردون و بەوانە لەمەو پاشان دین و، خوایەکی ئەوتۆیە پاك و خاوینە، چاکەی ئەو زۆرە و چاکەکان گەورەن، بۆ ئەو خودایەیە پاشایەتی و خاوەنیەتی ئاسمانەکان و زەوی لە نیوان ئەواندایە.

﴿ وعنده علم الساعة وإليه ترجعون ﴾ وە هەر لە لای خودایە بە تەنها بزانێ رۆژی دوایی چ کاتێ پەیدا ئەبێ و، هەر بۆلای خودا ئیوە ئەگیرینەوە بۆ پرسیار و وولام و پاداشت.

﴿ ولا يملك الذين يدعون من دونه الشفاعة إلا من شهد بالحق وهم يعلمون ﴾ وە ئەو کەسانە ئەوتۆ بت پەرستان ئەیان پەرستن لە جگەی خودا، خاوەنی پارانەوە نین و بۆ هیچ کەسێ مەگەر کەسێ باوەری بە خودا هینابێ بە تەنها و هاوبەشی بۆ خودا دانەنابێ و، ئەوان بروای تەواویان بەخودا هینابێ و شایەتی بەراستی خودا بدەن و بزانن خودا تەنهایە، وەك عیسا و عوزەیر و فریشتەکان.

﴿ ولئن سألتهم من خلقهم ليقولن الله فأنى يؤفكون ﴾ وە ئەگەر تۆ پرسیار بکەی لە بت پەرستان چ کەسێ بونەوەرانی تری دروست کردووە، بەراستی ئەلین خودا هەموومانی دروست کردووە، دوایی ئەوان چۆن وەرگیراون لە پەرستنی خوداوە بۆلای پەرستنی جگەی خودا.

﴿ وقيله يارب إن هؤلاء قوم لا يؤمنون فاصفح عنهم وقل سلام فسوف يعلمون ﴾ وە لەلای خودا یە زانینی گفتوگۆی پیغەمەر، ئەیووت: ئەی پەروەردگاری من: بەراستی ئەو کەسانە تاقمیکن باوەر بەتۆ و بە نامەی تۆ ناهینن، خودا فەرمووی بە پیغەمەر: تۆ واز لەوان بهینە و، تۆ بلێ بەوان: من واز لە ئیوەە ئەهینم و گفتوگۆتان لەگەڵ ناکەم، دوایی ئەوان ئەزانن لە رۆژی دواییدا چ سزایە توشی ئەوان ئەبێ.

# ﴿ سورەتی دوخان ﴾

لە مەکە هاتۆتە خوارەوە ژمارەی ئایەتەکانی (٥٩) ئایەتن.


بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
حمٓ ۝١ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ۝٢ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ
مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ۝٣ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ۝٤
أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ۝٥ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ إِنَّهُۥ هُوَ
ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ۝٦ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ
إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ۝٧ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ رَبُّكُمۡ
وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ۝٨ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ يَلۡعَبُونَ
۝٩

بسم الله الرحمن الرحيم

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ حم ﴾ مانای ئەم پیتانە وەك چەند جاری باسـکرا، ماناکانیـان لـە سـورەتی ئەلبەقـەرە و سورەتەکانی تردا باسیان کراوە، قورئان وەك هەموو نامەیە پێك هاتووە لەم پیتانە کـەچی هیچ کەسێ ناتوانێ وێنەی سێ ئایەت لەم قورئانە دابنێ.

﴿ وَالْكِتَابِ الْمُبِينِ إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴾ سوێندم بە نامەیە کە خۆی لە خۆیا زۆر ئاشکرایە، ڕون کەرەوەی هەموو شتێکە کە ئادەمیزاد پێویستی پێی هەبێ لە هـەردوو جیهاندا لە چاك و لە خـراپ. بەڕاسـتی ئێمـە ئـەو قورئانـەمان ناردووەتـە خـوارەوە بـۆ سـەر موحەمەد لـە شەوێکی پیرۆز و بەرێزدا، خـاوەنی فـەڕ و چاکەیـە. بەڕاسـتی ئێمـە بـەهۆی ئـەو قورئانەوە هەموو بێباوەڕان ئەترسێنین لە سزای ڕۆژی دوایی.

زانایان بیروباوەڕیان جیاوازە لـەبارەی مەبەست بەو شـەوە. ئـەوەی چاکتربێ لای زۆربـەی زۆری زانایان بریتی‌یە لـە شەوێك لـە شەوانی مانگی ڕەمەزان کە پێی ئەوترێ (لیلە القدر) یانێ

شەویکی بەریز و گەورەیە کە بـۆ یەکـەم جـار لـەو شـەوەدا قورئـان و هـەموو نامـەکانی تـر هاتوونەتە خوارەوە، هەندیکی زۆر کەم لـە زانایان لـە ئیبنوعەباسەوە ئەگیرنەوە کـە ئـەو شـەوە شەوی نیوەی مانگی شەعبانە. بەهەر جۆرێ بـێ نیـوەی مـانگی شـەعبانیش شـەویکی پـیرۆزە. لەبارەی پیرۆزی نیوەی مانگی شەعبانەوە تەفسیری تەبەری و تەفسیری (غرائب القران ورغائب الفرقان) باسی شەوی نیوەی مانگی شەعبانیان کردووە لە فەرموودەکانی پیغەمەردا ﴿ﷺ﴾.

﴿ فيها يفرق كل أمر حكيم ﴾ لەو شەوەدا هەموو کارێ لـە کارەکـانی بـەندەکانی خـودا روون ئەکرینەوە و بۆیان ئەنوسرێ، لـە خواردەمەنی و تەمەنیان و بەسەرهاتی تریان بەو جۆرەی زانستی خودا بیەوێ.

﴿ أمرا من عندنا إنا كنا مرسلين ﴾ ئیمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە، لـە لایـەن خۆمانـەوە فـەرمانماننداوە پـەیرەوی یاسـا و دەسـتوورەکانیان بکـرێ. بەراسـتی ئیمـە پیغەمـەرەکانمان رەوانەکردوون.

﴿ رحمة من ربك إنه هو السميع العليم ﴾ بەوەی چاکە و خۆشی بن بۆ هەموو بوونەوەران، نیراون لـە لایەن پەروەردگاری تـۆ و هـەموو بوونـەوەران. بەراستی پـەروەردگاری تـۆ هـەمو گفتوگۆیە ئەبیسێ، هەمو کردەوەی بونەوەران ئەزانێ.

﴿ رب السماوات والأرض وما بينهما إن كنتم موقنين ﴾ پەروەردەکەری ئاسمانەکان و زەوی و شتێ لـە نیوان ئەواندایە، ئەگەر ئیوە باوەرتان بەوە هەیە کە خۆتان ئەلین: ئاسمانەکان و زەوی و شتێ لـە نیوان ئەواندان خودا دروستی کردوون. ئیتر چۆن ئیوە جگەی خودا ئەپەرستن؟

﴿ لا إله إلا هو يحيي ويميت ربكم ورب آبائكم الأولين ﴾ هیچ خودایە نیە شایانی پەرسـتنبێ جگە لـە خودایە تەنهایە، مردووان زیندوو ئەکاتەوە، بەو جۆرەی یەکەم جار دروستی کـردوون و، گیانداران ئەمرینێ لـە جیهاندا، پەروەردگاری ئیوەوە و باوباپیرانی پیشووتانە، ئیتر چۆن ئیـوە جگەی خودا ئەپەرستن؟

﴿ بل هم في شك يلعبون ﴾ بەراستی بێباوەران لـەناو گومـاندا یـاری ئەکـەن بروایـان بـە زیندووبوونەوە و راستی پیغەمەر نیە، لەگـەڵ ئـەو هـەموە بەلگانـەدا، بێئاگـان لـە دوارۆژی خۆیان.

فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ يَغۡشَى
ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ
إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ﴿١٣﴾
ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ

إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ
﴿١٦﴾ ۞ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ
كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوٓاْ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾
وَأَن لَّا تَعْلُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّى عُذْتُ
بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُواْ لِى فَٱعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾

کاتێ قورەیشیی‌یەکان ئازاردانی پیغەمەریان زۆرتر کرد، پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ پارایەوە لە خودا کە وینەی گرانیەکانی سالآنی یوسف بریژێ بەسەریانا، خودای مـەزن نزاکـەی وەرگـرت، توشی گرانی‌یەکی وا بوون لـە برسانا ئیسك و مرداربۆیان ئەخوارد، ئەو برسیتی‌یە ئـەوەندە گرانبـوو، چاویان ئەوەندە لاواز بوبو، دوکەلیکیان لـە نیوان خۆیان و ئاسماندا ئەبینی و گفتوگۆی یەکتریان ئەبیست و یەکتریان ئەبینی، بەو بۆنەوە بت پەرستان داوایان لە پیغەمەر کرد لـە خودا بپاریتـەوە ئەو گرانیە لـەسەریان لابا و، بـەلینیاندا باوەربـهینن، خـودا لـەسـەریانی لابـرد، کـەچی دوایـی باوەریان نەهینا، خودا بۆ روونکردنەوەی ئەو رووداوە ئەفەرموێ.

﴿ فارتقب يوم تأتي السـماء بدخـان مبـين . يغشـى النـاس هـذا عـذاب أليـم ﴾ دوایـی تـۆ چاوەروانی رۆژێ بکە ئاسمان دوکەلێ بهینێ زۆر ئاشکرابێ لە ئاستی چاوی ئـەوان، جگـە لـە دووکەلێ لـە نیوان خۆیان و ئاسماندا هیچی تر نەبینن، ئەوەندە چاویان لاوازە و، تۆزێ ووشـکە سالی جیهانی لی‌پرکردوون چاویان نابینێ، ئەو دوکەلـە ئـەم لاولای ئـادەمیزاد دابگـرێ، ئـەو دوکەلە سزایەکی ئازاردار بو بۆیان.

﴿ ربنا اكشف عنا العذاب إنا مؤمنون أنى لهم الذكرى وقد جاءهم رسول مبين ثم تولوا عنه وقالوا معلم مجنون ﴾ بت پەرستان ووتیـان: ئـەی پـەروەردگاری ئیمـە: تـۆ ئـەم سـزایە لابـە لەسەرمان. بەراستی ئیمە باوەر ئەهینین و، چۆن ئەوان ئامۆژگاری وەرئەگرن و بـەلینی خۆیـان جێ‌بەجێ ئەکەن و، لەمەوبەر پیغەمەر چوە بۆلای ئەوان، لـەسەر دەستی ئەو کارە پـەك خـەری گەورەتر لـەم دووکەلە پەیدابوەوە و، زۆر شتی تریشی بۆ روون کردنەوە. لە پاشا روویان لـەو پیغەمەرە وەرگیرا و بەدرۆیان خستەوەوە و، ووتیان: ئەو قورئانە لـە لایـەن جگـەی عەرەبـەوە فیری ئەو کراوە و، شیتە و ئەقلی نەماوە.

﴿ إنا كاشفو العذاب قليلا إنكم عائدون ﴾ بەراستی ئیمـە ئـەو سزایەمان لـەسـەر ئیوە بـۆ ماوەیەکی کەم لابرد، بەراستی ئیوە گەرانەوە بۆلای بێ‌باوەری خۆتان بەدرۆخستنەوەی پیغەمەر.

زۆربەی زانایان لایان وایە مەبەست لە (دخان) لەو ئایەتەی پیشوودا: دوکەلیکـە نیشـانەی نزیکبوونەوەی رۆژی دواییە کە جیهان پرئەبێ لە دوکەڵ. بێباوەران لووتیـان لـەو دووکەلـە پرئەبێ و، وەك سەرخۆشیان لێدێ و، باوەرداران تووشی هەلامەت ئـەبن، هـەندێ لـە زانایـان ئەلین: ئەو دووکەلـە دوای زیندووبوونەوە پەیدا ئەبێ. خودا هەموو شتێ ئەزانێ.

﴿ یوم نبطش البطشة الكبرى إنا منتقمون ﴾ تۆ بیری رۆژێ بکەرەوە ئیمە یاریدەی تۆ ئەدەین بەم ژمارە کەمەوە، بێباوەران بە گرفتیکی گەورە و سزای زۆر سـەختیان ئـەدەین لـە هـەردوو جیهاندا. بەراستی ئیمە تۆلەیان لێئەکەینەوە. بە تایبەتی لە جیهاندا لە رۆژی بـەدردا، بیگومـان سزای رۆژی دوایی گرانترە.

﴿ ولقد فتنا قبلهم قوم فرعون وجاءهم رسول كريم ﴾ وە خودا دلخۆشی پیغەمەر ئەداتـەوە و ئەفەرموێ: ئیمە لە پیش قورەیشیەکانەوە تاقمی فیرعەونمان گیرۆدە کرد و تاقیمان کردنـەوە و، پیغەمەریکی ریزدارمان نارد بۆلایان بە فیرعەون و تاقمی فیرعەونی ووت:

﴿ أن أدوا إلي عباد الله إني لكم رسول أمين ﴾ کە ئیوە ئیسرائیلیەکانی بەندەی خودا بدەن بە من و وازیان لی بهینن بە خوایشتی خۆیان بۆ چ لایە ئەرۆن بابرۆن. بەراستی من پیغەمـەریکی نیاز پاك و گومان لێنەکراوم لە هینانی فەرمانی خودادا، ئازاریان مەدەن.

﴿ وأن لا تعلوا على الله إني آتيكم بسلطان مبين ﴾ وە کە ئیوە خۆتان بەرز مەکەنەوە بەسەر خودادا و، گالتە بە فەرمانی خـودا مەکـەن. بەراسـتی مـن هـاتووم بـۆلای ئیـوە بـە بەلگـە و دەستەلاتیکی ئاشکراو و لەسەرداوای خۆم، کاتێ موسـا داواکـەی خـۆی دەربـری لـە جیـاتی ئەوەی باوەری پێبهینن، هەرەشەی کوشتن و ئازاردانیان لیکرد و موسا ووتی: کە ئیوە هەرەشە لە من مەکەن.

﴿ وإني عذت بربي وربكم أن ترجمون ﴾ وە بەراستی من پەنائەگرم لە پەروەردگاری خـۆم و لە پەروەردگاری ئیوە کە ئیوە ئەتانەوێ من بکوژن بەبەردەباران کردن.

﴿ وإن لم تؤمنوا لي فاعتزلون ﴾ وە ئەگەر ئیوە باوەر بەمن نایەرن، دوایی ئیوە واز لـە مـن بهینن ز لیم دور بکەونەوە. نە لەگەڵ من بن و نە ئازارم بدەن.

فَدَعَا
رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمٞ مُّجۡرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسۡرِ بِعِبَادِي لَيۡلًا إِنَّكُم
مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ رَهۡوًاۖ إِنَّهُمۡ جُندٞ مُّغۡرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمۡ
تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٖ وَمَقَامٖ كَرِيمٖ ﴿٢٦﴾ وَنَعۡمَةٖ

كَانُواْ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَۖ وَأَوۡرَثۡنَٰهَا قَوۡمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾
فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدۡ
نَجَّيۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرۡعَوۡنَۚ إِنَّهُۥ
كَانَ عَالِيٗا مِّنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱخۡتَرۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ عِلۡمٍ عَلَى
ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُم مِّنَ ٱلۡأٓيَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٞاْ مُّبِينٌ
﴿٣٣﴾

﴿ فدعا ربه أن هؤلاء قوم مجرمون ﴾ دوایی موسا پارایەوە لە پەروەردگاری خۆی و ووتی: خودایە بە گورجی ئەم کۆمەڵە لەناو بدە. بەراستی ئەوانە تـاقمیکی تاوانبـارن. خـودای مـەزن نزاکەی لیٚوەرگرت و فەرمووی:

﴿ فأسر بعبادي ليلا إنكم متبعون ﴾ دوایی تـۆ بـرۆ و راکـە بـە بەنوئیسـرائیلیەکانەوە لـەو شەودا بە هاوڕییەتی بەندەکانی من. بەراستی ئیوە فیرعەون و تاقمەکەی دواتان ئەکەون و دیـن بە شوینتانا. کاتیٚ ئیوە گەیشتنە لای دەریا، تۆ داردەستەکەی خۆت بدە لـو دەریایـە، لـە یـەك ئەپچریٚ و ریگە بۆ ئیوە ئەکریتەوە و ئیوە بپەڕنەوە.

﴿ واترك البحر رهوا إنهم جند مغرقـون ﴾ وە دوایـی پەرینـەوەتان واز لـە دەریاکـە بـهینن بەکراوەیی و راوەستان، بۆ ئەوەی ئەو تاقمە دوایی ئیوە کەوتوون بچنە ناو دەریاکەوە. بەراستی ئەوانە سوپایەکن ئەخنکینرین.

بەکورتی: کاتیٚ فیرعەون زانی موسا و تاقمەکەی چوونەتـە دەرەوە و هەڵـهاتوون، خـۆی و سوپاکەی دووایان کـەوتن هـەتا بیانگیرنـەوە، کاتـیٚ چاویـان بـە موسـا و تاقمەکـەی کـەوت پەریبوونەوە بۆ ئەوبەری دەریاکە و ریگەی دەریا کراوەتەوە و ووشکە، چونە ناو دەریاکـەوە و کە ویستیان بپەرنەوە، خوای مەزن دەریاکەی بەردابە سەریانا و هەموویان خنکان.

﴿ كم تركوا من جنات وعيون وزروع ومقام كريم ونعمة كانوا فيها فاكـهين ﴾ فیرعـەون و تاقمەکەی چەندین باخ و بەهەشت و کانی و سەرچاوەی ئاو و شینایی و کشت و کاڵ جیگەی چاك و بەریز و رابواردن و خواردنی زۆریان لە دوای خۆیان بـەجیٚ هیشـت کـە لـەناویانا بـە خۆشی رایان ئەبوارد.

﴿ كذلك وأورثناها قوما آخرين فما بكت عليهم السماء والأرض وما كانوا منظريـن ﴾ هـەر بەو جۆرەی ئیمە ئەوانمان خنکان، ئیمە ئەو جۆرە کارانـە ئەکـەین بـە تاقمـیٚ بیٚفـەرمانی ئیمـە

بکەن، تاقمی فیرعەون ئەوانەیان بەجیٚ هیشت و، ئیمە ئەوانەمان بەخشی بە تاقمیٚ تر و کردمان بە میرات بۆ بەنوئیسرائیلیەکان، دوایی ئاسمان و زەوی بـۆ لـەناوبردنی فیرعـەون و تاقمەکـەی نەگریان بەسەریانا، مۆڵەتیان نەدرا و بنەبرکردنیان دوانەخرا بۆ کاتیٚ تر.

﴿ ولقد نجينا بني إسرائيل من العذاب المهين من فرعون إنه كان عاليا مـن المسرفين ﴾ وە بەراستی ئیمە بەنوئیسرائیلیەکانمان رزگارکرد لـە سزای سەخت بەوینەی سەربرینی پیاوەکانیـان و هیشتنەوەی ژنەکانیان بۆ کارەکەری و، لـە ئازاردانی فیرعەون، بەراستی فیرعـەون خـۆی بـە گەورە و بەرز دائەنا لـە سنووری خودا لایدابوو، وەك بیٚباوەرانی تر.

﴿ ولقد اخترناهم على علم على العالمين ﴾ وە بەراسـتی بەنوئیسـرائیلیەکانمان هـەلبژارد و چاکەمان لـەگەڵ کردن و ریزماندان بەسەر بونەوەرانی ئەو کاتەی خۆیان ئـەمانزانی شایستەی ئەو چاکەیەن، بۆیە پیغەمەری زۆرمان لـەواندا پەیداکردن.

﴿ وآتينـاهم مـن الآيـات مـا فيـه بلـاء مبـين ﴾ وە ئیمـە بەخشـیبوومان بـە موسـا و بەنوئیسرائیلیەکان چەن کاری پەکخەر لـە پچراندنی دەریا لـە یەکتر و، کردنی هەور بە سـیبەر بۆیان. ناردنە خوارەوەی شیلاقە و گەزۆ. هەڵقوڵاّنی ئاو لـەبەرد. ئەو کارە پەك خـەر و نیشـانە ئاشکرایانە تاقی‌کردنەوەیەکی ئاشکرابو بۆ ئەوان. ئایا سوپاسی خودا ئەکەن و بیٚفەرمانی خـودا ناکەن؟

إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ أَهْلَكْنَٰهُمْ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾

﴿ إن هؤلاء ليقولون إن هي إلا موتتنا الأولى وما نحن بمنشـرين ﴾ بەراستی بـت پەرستانی قورەیش ئەڵین: زیندووبوونەوە لـە دوای مردن نیە جگە لـە یەکەم مردنی ئیمە، ئیمە جـاریٚ تـر زیندوو ناکریینەوە لـە دوای مردن.

﴿ فأتوا بآبائنا إن كنتم صادقين ﴾ ئەگەر موحەمەد و ئەوانـەی دوای ئـەو کـەوتوون ئەگـە راست ئەکەن زیندووبوونەوەی دوای مردن هەیە، دوایی باوباپیرەکانمان زیندووبکەنەوە و، بیـان هینن بۆلای ئیمە ئیمە پرسیاریان لیبکەین دەربارەی زیندووبوونەوەی دوای مردن.

﴿ أهم خير أم قوم تبع والذين من قبلهم أهلكناهم إنهم كانوا مجرمين ﴾ ئایا بـت پەرستـانی قورەیش چاکتربوون یا تاقمی توبەع و کەسانیکی ئەوتۆ لە پیش ئەوانەوە بـوون لـە تاقمـەکانی نوح و عاد و سەمود و ئیمە ئەوانمان لـەناوبردن و، لـەبەر ئەوەی ئەوان هەموویان تاوانبـاربوون، هیز و توانایان لـە هیز و توانای قورەیش زۆرترە و هیز و تواناییان سوودی بەوان نەگـەیاند، بـت پەرستانی قورەیش بروایان وابێ ئەوەی توشی ئەوان بووە تووشی ئەمانیش ئەبێ.

بۆ زانین: تاقمی توبەع، کۆمەلێ بوون دانیشتووی یەمەن، پاشاکانیان نازناویان توبـەع بـوو، یەکێ لـە پاشاکانیان ناوی (ئەسەد) بـوو، پاشـاکانی ئـەو سـەردەمە زۆری لیئەترسـان، چونکـە خاوەنی سوپایەکی زۆر ئازا و بەهەلـمەتبوون، دەستەلاتی خـۆی بەسـەر چینـدا سـەپاندبوو، لـە بیرمان نەچێ نازناوی پاشاکانی تـورك خاقـان بـوە، دەیلـەم کاسـبان. فارسـەکان کیسـرا. رۆم قەیسەر. ئەنبات نەمرود. عەرەب توبەع. قیبت فیرعەون. چین بەغبەر. حەبەشە نەجاشی. یەمەن مەئرەب. ئیسلام خەلیفە. زانایان ئەلین: توبەع خۆی موسلمان بووە و باوەرداربووە، تاقمەکەی بێباوەربوون.

﴿ وما خلقنا السماوات والأرض وما بينهما لاعبين ما خلقناهما إلا بـالحق ولكـن أكـثرهم لـا يعلمون ﴾ وە ئیمە ئاسمانەکان و زەوی و شتێ لــە نیـوان ئەواندایـە دروسـتمان نـەکردوون بـۆ گالتەکردن و بەبێ سوود، زیندوبونەوە و پرسیار و پاداشت نەبێ، دروستمان نەکردوون مەگەر بۆ مەبەستیکی راست لـە باوەرهینان و پەرستن و زیندووبوونــەوە و پرسـیار و پاداشـت و، بـەلام زۆرتر لـە ئادەمیزاد نازانن بەو راستییانە و باوەریـان پێناکـەن و، وا ئـەزانن بێسـوودە دروسـت کردنیان.

﴿ إن يوم الفصل ميقاتهم أجمعين يوم لا يغنـي مولـى عـن مولـى شـيئا ولـا هـم ينصـرون ﴾ بەراستی رۆژی دوایی رۆژیکە راست و پوچ جوێ ئەکاتەوە لە کاتێ پرسیاری ئـادەمیزادە بـە گشتی بۆ وەرگرتنی پاداشتی کردەوەکانیان، رۆژیکـە هیـچ دۆسـتێ سـود بـە هیـچ دۆسـتیکی ناگەیەنێ، سامان و پلەوپایە بێ سوودە و، ئەوان یارمەتیان نادرێ بۆ لابردنی سزا لـەسەریان.

﴿ إلا من رحم الله إنه هو العزيز الرحيم ﴾ یارمەتی نادرێ مەگەر کەسـێ خـودا لـەو رازی بێ، ئەو کەسە یارمەتی ئەدرێ و پارانەوەی لیوەرئەگیرێ. بەراستی خودا زۆر بەدەستەلاتە تۆلـە لـە دوژمنی خۆی ئەکاتەوە، میهرەبان و بە بەزەییە بۆ هەر کەسێ ئارەزۆی بکا.

إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾
طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْيِ
ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ

صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ
أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ
﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ
﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾
كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ
فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ
إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا
مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ
لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾

﴿ إن شجرة الزقوم طعام الأثيم كالمهل يغلي في البطون كغلي الحميم ﴾ بەراستی بەری درەختی زەقوم کە درەختیکە خودا رواندوویەتی لەناو دۆزەخدا، خواردەمەنی گوناهبارانە، بەوینەی مسی تواوە ئەکولێ و هەڵئەچێ لەناو سکیانا، وەك ئاویکی زۆر گەرم ریخۆڵەیان پارچەپارچە ئەکا.

﴿ خذوه فاعتلوه إلى سواء الجحيم ثم صبوا فوق رأسه من عذاب الحميم ﴾ ئەبیژرێ بە فریشتەکان: ئیوە ئەو گوناهبارە بگرن، لە پاشا ئیوە بریژن بەسەریانا هەندێ لە سزای ئاوی گەرم، هەتا دەرەوەیشی وەك ناوەوەی سزا بچیژێ.

ئەو فەرموودانەی خودا ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن لەناو دۆزەخدا خواردەمەنی و گەرما و بەرگ و پۆشاك هەن، هەموویان لە ئاگری زۆر گەرم درووستکراون.

﴿ ذق إنك أنت العزيز الكريم إن هذا ما كنتم به تمترون ﴾ ئیوە بە گاڵتەوە بەو گوناهبارە بڵین: تۆ ئەو سزایە بچیژن. بەراستی تۆ لە جیهاندا خۆشت بە پیاویکی زۆر بەدەستەڵات و زۆر بەریز ئەزانی. بەراستی ئەمە ئەو سزایەیە ئیوە گومانتان لە بوونیدا هەبوو.

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی گوناهباران و جۆری خواردەمەنی و سزادانیانی کرد لەو ئایەتانەی پیشوودا. باسی لە خودا ترسان و جۆری خواردنیان و رابواردنیان ئەکا و ئەفەرمووێ:

﴿ إن المتقين في مقام أمين في جنات وعيون يلبسون من سندس وإستبرق متقابلين ﴾ بەراستی ئەو کەسانەی لە خودا ترساون و خۆیانیان لە بێفەرمانی خودا پاراستووە لە

جیگەیەکی بێترس و بێئازارن لەناو چەند شوینی بەهەشت و باخ و چیمـەن و سـەرچاوەکانی ئاودان، ئەوریشمی تەنك و قـایم ئەپۆشـن، بەرانبـەری یـەکتری دائەنیشـن لەسـەر کورسـی و رائەبویرن و گفتوگۆی خۆش ئەکەن.

﴿ كذلك وزوجناهم بحور عين يدعون فيها بكل فاكهة آمنين ﴾ هەر بەو جـۆرەی ئەوانـەی پیشوومان بەخشی بەو کەسانەی لـە خوا ترساون، ئیمە ئەکەین بە هاوسەری ئەوان چـەند ژنـی سپی و چاوگەورە، لەناو بەهەشتدا داوای هەموو جۆرە میوەیە ئەکەن ئارەزۆی ئەکەن، ناترسـن و ئاسودە و بێ ئازارن.

﴿ لا يذوقون فيها الموت إلا الموتة الأولى ووقاهم عـذاب الجحيـم ﴾ ئـەو کەسـانە لـەناو بەهەشتان مردن ناچیژن دوای ئەوەی مردوون لـە جیهاندا مەگەر ئەو مردنەی یەکـەم جـار لـە جیهاندا تووشیان بووە و، خودا ئەوان ئەپاریزێ لە سزای دۆزەخ.

﴿ فضلا من ربك ذلك هو الفوز العظيم ﴾ خودا ریزی ئەو کەسانەی گرتووە بە ریزگرتنیکی گەورە لـە لایەن پەروەردگاری تۆ و، ئەو ریزگرتنە سەرکەوتنیکی زۆر گەورەیە بۆ ئەو کەسانە.

﴿ فإنما يسـرناه بلسـانك لعلـهم يتذكـرون فـارتقب إنـهم مرتقبـون ﴾ بەراستی قورئانمـان رەوانەکردووە بۆلای تۆ، ئامادەمان کردووە بە زمانی عەرەبی خۆت، لـەبەر ئەوەی عەرەبـەکان ئامۆژگاری وەربگرن و سـودی لێوەربگـرن و باوەربـهینن. بـەلام ئـەوان پیغەمـەر و قورئانیـان بەدرۆخستەوە، دوایی تۆ چاوەروانی بەسەرهات و پاشەرۆژی نالـەباری ئـەوان بکـە. بەراسـتی ئەوان چاوەروانی ئەوەیان ئەکرد تۆ بمری و ئەوان بە ئاسوودەیی دانیشن، یا دەسـتەلاتی خۆیـان بدەن بەسەر تۆدا بە گومانی پوچی خۆیان. بەلام ئەوان بە ئاواتی خۆیان ئەگەن.

**به یاریدەی خودا کۆتایی پێهات**

**(٢٣)ی رەبیعی دووهەم سالی (١٤٢١)ی کۆچی بەرانبەر بە ٢٠٠٠/٧/٢٤ی زایینی**

# ﴿ سورەتی ئەلجاسیە ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. لای هەندێ لە زانایان جگەی ئایەتی (١٤) لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣٧) ئایەتن.



بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

حم ﴿١﴾ تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ آيَاتٌ
لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ
مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ
يَعْقِلُونَ ﴿٥﴾ تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَ
اللَّهِ وَآيَاتِهِ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ حم ﴾ مانای ئەم پیتانە لە سورەتی ئەلبەقەر و سورەتەکانی تردا، مانای وێنەکانیان باسکراوە.

﴿ تَنزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾ ئەو قورئانە کە پێك هاتووە لەو پیتانە نامەیەکە هاتوەتە خوارەوە لە لایەن خودایێکەوە زۆر گەورە و بەتوانایە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیدا دائەنێ.

﴿ إِنَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾ بەڕاستی لەناو دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا چەن بەڵگەی ئاشکرا هەن لە سەر توانای خودا، بەو جۆرە سەرسوڕێنەرە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە خودا هەیە.

﴿ وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ وە بە ڕاستی لە دروستکردنی ئێوەی ئادەمیزاد لە دڵۆپێ ئاو و گۆڕانتان پلە بە پلە هەتا ئەبن بە مرۆڤێکی ژیر و، لە بڵاوبوونەوەی

هەمو گیانداریٚ ئەڕۆن بەسەر زەوی‌دا هەیە چەندین بەڵگە ئاشکرا بۆ تاقمیٚ بڕوای بیٚگومانیان بە تەنهایی خودا و بە زیندووبوونەوە و بەرۆژی دوایی هەیە.

﴿ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ آيَاتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ وە بەڕاستی لە گۆڕرانیٚ شەو و ڕۆژ بە درێژبوون و کورتبوونی کاتەکانیان و، بە هاتنیان بە دوای یەکتریدا بەو پەیڕەوە نەگۆڕاوە، بەهۆی ئەو شتەی خودا ناردوویەتیە خوارەوە، لە هەوری ئاسمانەوە، لەو هەمووە شتانەی ئەبنە هۆی پەیدابوونی خواردەمەنی و ژیانی ئێوە لە ئاوو ئاگر، شتیٚ تر دوایی بەهۆی ئەو شتەوە زەوی زیندوئەکاتەوە، دوای ووشکبوونی و مردنی، بە هەموو جۆرە شینایی و ڕوەکەوە، لە هاتوچۆی بایەکان لە باکورەوە بۆ باشور، لە خۆرئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات و بە پێچەوانەیشەوە، لە سەرما و گەرمای ئەو بایانە، چەند بەڵگەی ئاشکرا هەن لەسەر توانای خودا بۆ کەسانیٚ خاوەنی ئەقڵبن و بیربکەنەوە لە بونەوەران چۆن خراونەتە کار بۆ سوودی گیانداران.

هەرشتیٚ بێژراوە و ئەبێژریٚ لەهۆی گەڕانی زەوی بەدەوری خۆردا و، گەڕانی بەدەوری خۆیا و، ئەو شتانەیش باسکران لەو ئایەتەدا، هەموویان ئەگەڕێنەوە بۆلای ویست و زانستی خودا، ناگونجیٚ لە خۆیانەوە یابەهۆی ئامێرێکی کوێری بیٚ‌گیانەوە یا بە ڕێکەوت بکەونە کارەوە بەو جۆرە سەرسوڕێنەرانە.

﴿ تِلْكَ آيَاتُ اللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِالْحَقِّ فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَ اللَّهِ وَآيَاتِهِ يُؤْمِنُونَ ﴾ ئەوانەی باسکران چەندین بەڵگەی ئاشکران لەسەرتوانای خودا، ئێمە ئەیخوێنینەوە بەسەر تۆدا و ڕاستی و ڕانومایی لەخۆی گرتوە و، بەچاو و بە هەموو شتیٚ ئەزانرێن، دوایی بە چ گفتوگۆیە دوای نامەی خودا و دوای ئایەتەکانی قورئان باوەڕئەهێنن؟ ئەو کەسانەی سوود لە ڕوونکردنەوەی خودا وەرنەگرن، هیچ بەڵگەیە سوود بەوان نابەخشیٚ.

وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ يَسْمَعُ آيَاتِ
اللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ
﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ آيَاتِنَا شَيْئًا اتَّخَذَهَا هُزُوًا أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ
مُّهِينٌ ﴿٩﴾ مِّن وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَسَبُوا شَيْئًا
وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا
هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾
۞ اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن

فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى
ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾
قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ
قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ
وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾

﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ يَسْمَعُ آيَاتِ اللَّهِ تُتْلَى عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ سزای سەخت بۆ هەموو کەسێکی زۆر درۆزن، زۆر گوناهباری وایە دانیشتووان لا ئەدا لە ڕێگەی ڕاست و باوەڕهێنان، ئایەتەکانی نامەی خوا ئەخوێنرێتەوە بەسەریا ئەی بیسێ، لەپاشانا بەردەوام ئەبێ لەسەر بێباوەڕی و داوای گەورەیی ئەکا و ناگەڕێتەوە بۆلای ڕاستی، وەك ئەوەی ئەو ئایەتانەی نامەی خودای نەبیستێ، دوای تۆ موژدە بەو کەسە بدە بە سزایەکی زۆر خاوەن ئازار.

﴿ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ آيَاتِنَا شَيْئًا اتَّخَذَهَا هُزُوًا أُولَئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾ وە هەرکاتێ ئەو کەسە درۆزنە شتێکی لە ئایەتەکانی نامەی ئێمەی پێگەیشتبێ و زانیبێتی گاڵتەی بەو ئایەتەکردووە، بۆ ئەو کەسانە هەیە سزایە ڕسوایان ئەکا و ئابڕوویان ئەبا.

﴿ مِن وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَسَبُوا شَيْئًا وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ دۆزەخ لە پێش ئەو کەسانەوەیە شتێ ئەوان پەیدایان کردووە لە جیهاندا لە سامان و پلە و پایە و، شتێ ئەوان کردوویانە بەخودا و یاریدەر بۆخۆیان سود بەوان نابەخشێ و، بۆ ئەو کەسانە هەیە سزایەکی زۆر گەورە.

﴿ هَذَا هُدًى وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾ ئەو قورئانە ئادەمیزاد ئەخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و لایان ئەدا لە ڕێگەی چەوت و ناڕاست و، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بە ئایەتەکانی پەروەردگاری خۆیان بۆیان هەیە سزایە لە سەختترین سزای خاوەن ئازار.

﴿ اللَّهُ الَّذِي سخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە دەریای ڕام کردووە بۆ ئێوە؛ لەبەر ئەوەی کەشتی هاتوچۆ بکا بە ناویا، بەهۆی فەرمانی خوداوە و، بۆ ئەوەیش پەیدابکەن ڕۆزی و خواردەمەنی بۆخۆتان و نێچیری ئاوی ڕاو بکەن و خۆتان بکەن بە قوتا بۆ ناو ئاوی دەریا بۆ دەرهێنانی مرواری و شتی تری بەنرخ، بۆ ئەوەیش ئێوە سوپاسی خودا بکەن لەسەر ئەو هەموو چاکانەدا.

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ ﴾ وە خودا ڕامی کردووە بۆ ئێوە شتێ لە ئاسمانەماندایە، لە هەوا و هەور و باران و شتی تر، بۆ درێژەپێدان بە ژیان و گوزەرانتان، ئەگەر ئەوانە نەبن، ئێوە ناژین و ئەمرن و، لە تیشکی ڕوناکی خۆر و مانگ و، ڕازاندنەوەی ئاسمانەکان بە ئەستێرە کە ئەبنە هۆی شارەزایی کردنتان بۆ هەرجێگەیە بتانەوێ.

﴿ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ وەخودا ڕامی کردووە بۆ ئێوە شتێ لە زەوی‌دایە هەموویان لەلایەن خوداوە، لە کێو و ئاو و درەخت و کانگاکان و، لە کۆشك و پیشەسازی و شتی تر، بەڕاستی لەو شتانەدا هەن چەندین بەڵگەی ئاشکرا لەسەر توانای خودا بۆ تاقمێ بیربکەنەوە لەو کارانەی خودا.

جارێك موسڵمانان چونە دەرەوە لە خزمەت پێغەمەردا، ئەبوبەکر و عومەریشی لە خزمەتا بو، لە نێو ئەو موسڵمانانەدا عەبدولای کوڕی ئوبەی ئامادە بوو لە غەزای (بەنولموستەلیقدا)، لەسەر بیری (ئەلمورەیسە ع) دابەزین بۆ پشودان، عەبدولای کوڕی ئوبەی پیاوێکی خۆی نارد بۆ ئاوهێنان لەو بیرەدا درەنگ هاتەوە، کاتێ درەنگ هاتەوە عەبدولا ووتی بۆچی درەنگ هاتیەتەوە، ووتی: پیاوێکی عومەری کوڕی خەتاب لەسەر بیرەکە دانیشتبوو، ئەیووت: هەتا جەونەکانی پێغەمەر و ئەبوبەکر پڕ نەکرێن، نابێ هیچ کەسێ ئاو ببا، دوایی عەبدولای کوڕی ئوبەی گفتوگۆی زۆر خراپی بە موسڵمانان ووت. عومەری کوڕی خەتاب ویستی بڕوا عەبدولا بکوژێ. لەو بارەوە خوای مەزن ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە:

﴿ قُل لِّلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ اللَّهِ لِيَجْزِيَ قَوْمًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ تۆ بڵێ بە کەسانەی باوەڕیان هێناوە خۆشبن و ببورن لەو کەسانە بە ئومێدی ڕۆژانی سزای خوادانین و لە سزای خودا ناترسن، لەبەر ئەوەی خودا پاداشتی ئەو باوەڕدارانە بداتەوە بە باشترین پاداشت، بەهۆی ئەو کردەوە چاکانە لە جیهاندا کردوویانە.

﴿ مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴾ هەرکەسێ کردەوەی چاکی کردووە، دوایی سودەکەی هەر بۆ خۆیەتی، هەرکەسێ خراپەی کردبێ، دوایی زیانەکەی لەسەر خۆیەتی، لە پاشاندا ئێوە بۆلای پەروەردگاری خۆتان ئەگێڕرێنەوە لە ڕۆژی دوایدا بۆ وەرگرتنی پاداشت و تۆڵە و پرسیار.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا
بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ
وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ
فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ إِنَّ
رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ

﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾

﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە نامەکانی تەورات و ئینجیل و زانینی یاساکانی تەورات و ئینجیل و پێغەمەرانمان بەخشیبو بە بەنوئیسرائیلیەکان.

﴿ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴾ وە ئێمە بەخشیبومان بە بەنوئیسرائیلیەکان خواردەمەنیە پاکەکان، بەوێنەی گەزۆ شێلاقە و، ڕێزی ئەوانمان دابو بەسەر بونەوەرانی ئەو سەردەمەی خۆیانا.

﴿ وَآتَيْنَاهُم بَيِّنَاتٍ مِّنَ الْأَمْرِ ﴾ وە ئێمە چەندین بەڵگەی ئاشکرای یاسا لە فەرمانەکانی ئاییندا پەخشیبومان بەوان بۆ ئەوەی کاریان پێبکەن، بەجۆرێ بیانویان نەمێنێ و، نەیانگۆڕن و جیاوازی نەخەنە ناو فەرمانەکانی خودا.

﴿ فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِن بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ﴾ دوایی هیچ جۆرە جیاوازییە پەیدانەبووە لە نێوانیانا لەبارەی فەرمانی ئایینەکەیان مەگەر لە دوای چونی زانیاریان بە ناوەڕۆکی ئەو نامەیە هاتبو بۆلای موسا و، ئەیانزانی ڕاستە. بەڵام لەبەر دوژمنایەتی و دڵپیسی نێوان خۆیان دەستکاری تەوراتیان کرد بەگوێرەی سودی تایبەتی خۆیان، هەر لەبەر مانەوەی سەرۆکایەتییەکەیان، دەستیان کرد بە پێغەمەر کوشتن.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لە ڕۆژی دواییدا فەرمان ئەدا لە نێوانیانا، لەو شتەی بیروڕایان دژی یەکترین، ئەو کاتە دەرئەکەوێ چ لایەکیان ڕاستە.

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا ﴾ لە پاش ناکۆکی نێوان بەنوئیسرائیلیەکان لە یاسای تەوراتا ئێمە تۆمان دانا لەسەر ڕێگەیە لەبارەی فەرمان و ئایینی ڕاستی ئێمە وە ئایینێکە گیانی ئادەمیزاد ئاو ئەدا بە ئایینی ڕاست و، زۆر ئاسانە و دوورە لە هاوبەشدانان بۆ خودا، دوایی تۆ دوای ئەو ڕێگە و دەستوورە بکەوە و، وازی لێمەهێنە.

﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ وە تۆ دوای ئارەزۆی کەسانێکی ئەوتۆ مەکەوە، نازانن بە یاسای ئایینی ڕاست و، داوا لە تۆ ئەکەن بگەڕێتەوە بۆلای ئایینی پڕوپوچی؛ باوباپیرانیان لەبت پەرستی.

﴿ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانە هیچ شتێ لە سزای خودا لە تۆ ناگێڕنەوە، چونکە ئەوان توانای ئەوەیان نیە سزای خودا لە خۆیان لابدەن، ئیتر چاکتر ناتوانن سزا لە کەسێ تر لادەن و، بە ڕاستی ستەمکاران دۆست و یارمەتی دەری هەندێ تریانن لە جیهاندا بەڵام لە پاشەڕۆژدا یارمەتی دەریان نیە و، خودا دۆست و بەڕێوەبەری ئەو کەسانەیە لە خوا ئەترسن و خۆیان لەبێفەرمانی خودا ئەپارێزن.

﴿ هَذَا بَصَائِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ بەڕاستی ئەم قورئانە چەندین بەڵگەی ئاشکران بۆ ئادەمیزاد، ڕێگەی ڕاست نیشان ئەدا و ڕایان ئەکێشێ بۆلای بەهەشت و، خۆشی بۆ ئەوانەی دوای یاسای ئەو قورئانە ئەکەون و لایان ئەدا لە سزای پاشەڕۆژ.

أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِ غِشَاوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ اللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾

﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ﴾ ئایا کەسانێکی ئەوتۆ چەندین کاری خراپیان کردووە گومانیان وایە کە ئێمە وەك کەسانێکی ئەوتۆیان دائەنێن باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە؟ بێگومان ئێمە وەك یەکیان دانانێن.

﴿ سَوَاء مَّحْيَاهُم وَمَمَاتُهُمْ سَاء مَا يَحْكُمُونَ ﴾ گومانیان وایە کە ئێمە ژیان و مردنی بێباوەڕان و، باوەڕداران وەك یەك دائەنێن، ئەو شتەی ئەوان فەرمانی پێئەدەنخراپە و بۆیان ناچێتە سەر، چونکە باوەڕداران لەناو بەختیاری و ڕەزامەندی خوادان لە هەردوو جیهاندا، بێباوەڕان لەناو خەشمی خودان لە کاتی ژیان و، لەکاتی مردنیاندا، ئیتر چۆن ئەبێ وێنەی یەك بن؟

﴿ وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَى كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ وە خودا ئاسمانەکان و زەوی درووستکردوون بەڕاستی و بە داد پەروەری؛ لەبەر ئەوەی بەڵگەبن لەسەر توانای خۆی و، لەبەر ئەوەیش پاداشتی هەموو کەسێ بدرێتەوە بەهۆی شتێ کردوویەتی و، ئەو کەسانە ستەمیان لێناکرێ بەکەم کردنەوەی پاداشتی چاکەکانیان. بێگومان هەموو کارێکی خودا دادپەروەرانەیە بۆ هەموو کەسێ.

﴿ أَفَرَأَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَهَهُ هَوَاهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَى عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَى سَمْعِهِ وَقَلْبِهِ وَجَعَلَ عَلَى بَصَرِهِ غِشَاوَةً ﴾ ئایا تۆ تەماشای کەسێ چۆن ئەکەیی و چۆنی ئەبینی، ئارەزۆ و هەوەسی خۆی کردبێ بە خودا بۆخۆی، وازی لە فەرموودەی خودا هێنابێ و، ئەو کەسە خودا لایدابێ لە ڕێگەی ڕاست، بەجۆرێ بزانێ ئەو کەسە بە ئارەزۆی لە ڕێگەی ڕاست لائەدا و ئەزانێ پاشەڕۆژی چۆن ئەبێ و، خودا مۆری دابێ بەسەر گوێچکەیا ڕانومایی وەرنەگرێ و، بەسەر دڵیا چاکە فێر نەبێ و، پەردەی دابێ بەسەر چاویا هیچ چاکەیە نەبینێ؟

﴿ فَمَن يَهْدِيهِ مِن بَعْدِ اللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴾ ئایا دوای ئەوەی خودا ئەو شتانەی لەگەڵ کردبێ، چ کەسێکە لە دوای خودا شارەزایی ئەو کەسە بکا بۆلای ڕێگەی ڕاست و ئایینی خودا، ئایا دوایی بۆ ئێوە ئامۆژگاری وەرناگرن، هەرکەسێ ئامۆژگاری سوودی پێنابەخشێ.دوایی ئامۆژگاری تر سوودی پێ نابەخشێ.

بۆ ئاگاداری: هەندێ لە ئادەمیزاد هەن، بڕوایان بە جگە خۆیان و بە جگەی سودی تایبەتی خۆیان نیە، ئەگەر نوێژ و ڕۆژ و بەسترەکانی تر، دژی مەبەست و هەڵوێستی ئەوان بێ نایان کەن، هەرشتێ خۆیان ئارەزۆی بکەن لایان چاکە، ئەو کەسانە بێبەشن لەبەزەیی و میهرەبانی خودا.

﴿ وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ ﴾ وە بێباوەڕانی مەکە ئەڵێن بەدەمارەوە هیچ ژیانێ تر نیە جگە ژیانی ئێمە لەم جیهانەدا، ئێمە مردوبوین و دڵۆپێ ئاو بووین و زیندووکراوین، وەك باوباپیرانی پێشوومان و دواتر ئێمە منالمان ئەبێ و ئەوانیش مردبوون و زیندووئەکرێنەوە و، هیچ شتێ ئێمە لە ناونابا مەگەر هاتن و ڕۆیشتنی کات و هاتوچۆی شەو و ڕۆژ.

﴿ وَمَا لَهُم بِذَلِكَ مِنْ عِلْمٍ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴾ وە ئەو بێباوەڕانە هیچ جۆرە زانین و بەڵگەیەکیان بۆ ئەو شتانە نیە کە ئەیلێن: ئەوەی ئەوان ئەیلێن لە ڕاستی دوورە، هیچ شتێ نیە مەگەر ئەوان گومانیان وایە و، دوای بیر و بۆچونی پوچی باوباپیرانیان کەوتوون، خودای گەورە درووستی کردوون و چاکیان ئەناسێ، جگە لە خەو و خواردن، بیر لە شتێ تر ناکەنەوە.

﴿ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتُوا بِآبَائِنَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ وە هەرکاتێ بخوێنرێتەوە بەسەر بێباوەڕان و بت پەرستاندا چەندین بەڵگەی ئاشکرا لە ئایەتەکانی نامەی ئێمەدا کە لەسەر ڕاستی زیندووبوونەوەی دوای مردن، هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نامێنێ جگە لەوەی کە ئەوان ئەیان ووت: ئێوە باوباپیرەکانی ئێمە زیندووبکەنەوە و بیانهێنن بۆلای ئێمە،ئەگەر ئێوەی موسڵمان ڕاست ئەکەن کە زیندووبوونەوە هەیە، ئەوەی ئەوان ئەیکەن بە بەڵگە بۆخۆیان، وێنەی ئەوەیە ئەبێژرێ: ئەو منالە گەورە ببێ و، ڕیشی لێبڕوێ هەتا ببینم.

﴿ قُلِ اللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَا رَيبَ فِيهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾ تۆ بڵێ: خودا ئێوەی زیندووکردوەتەوە یەکەم جار لەنەبوونەوە ئێوەی هێناوەتە بوونەوە لە پاشا ئێوە ئەمرێنێ دوای لە دایکبوونتان، لە پاشا ئێوە زیندوو ئەکاتەوە و، کۆتان ئەکاتەوە بۆلای ڕۆژی دوایی، ئەو ڕۆژە گومانی تێدا نیە و، بەڵام زۆر لە ئادەمیزاد نازانن خودا توانای هەیە بەسەر زیندووکردنەوەی بونەوەراندا؛ چونکە ئەوان ئەقڵی خۆیان ناخەنەکار و، بیر لە توانای خودا ناکەنەوە. بێگومان ئەو خودایە کە ئادەمیزادی لە نەبوونەوە دروست کردووە لە دڵۆپێ ئاو، ئەتوانی بۆ جارێ تر ئێوە زیندوو بکاتەوە.

وَلِلَّهِ مُلْكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ
﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ
تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ
مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا
ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا
مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾

﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرضِ ﴾ وە بۆ خودایە پاشایەتی و خاوەنیەتی ئاسمانەکان و زەوی؛ چونکە خودا لە نەبوونەوە دروستی کردوون، هەر بەو جۆرە توانای هەیە ئادەمیزاد ئەمرێنێ و لە پاشەڕۆژدا زیندویان ئەکاتەوە.

﴿ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ الْمُبْطِلُونَ ﴾ وە ئەو کەسانەی خاوەنی کاری پڕو پوچن، باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نەبوە، لە کاتی بەرپابوونی ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکە توشی زیان ئەبن و زیانەکەیان ئاشکرا ئەبێ؛ چونکە لەو ڕۆژەدا جێگەیان دۆزەخە و، بۆ ئەوان هیچ یارمەتی دەرێکیان نیە.

﴿ وَتَرَى كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَى إِلَى كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ وە تۆ لە ڕۆژەدا هەموو خاوەن ئایینێ ئەبینی لە ترسی ئەو ڕۆژە لەسەر ئەژنۆ و پەنجەی پێیاندا دانیشتوون، چاوەڕوانی پرسیار ئەکەن، هەمو خاوەن ئایینێ بانگیان ئەکرێ بۆلای نامەی کرداری خۆیان، لەو ڕۆژەدا ئادەمیزاد پاداشتیان ئەدرێتەوە بەشتێ ئەیکەن لە جیهاندا لە چاك و لەخراپ.

﴿ هَذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ ئەوە ئەو نامەیەی ئێمەیە، ئێمە فەرمانمان دابو بە فریشتەکان کرداری ئێوەی تێدا تۆماربکرێ شایەتی ئەدا لەسەرتان بەڕاستی و بەڕونی لەسەر ئەو شتانەی ئێوە کردووتانە لە جیهاندا. بەڕاستی ئێمە فەرمانمان داوە بە فریشتەکان شتی ئێوە کردوتانە لە جیهاندا تۆماری بکەن لە نامەی کردارتانا، بە جۆرێکی داپەروەری.

﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْمُبِينُ ﴾ دوایی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و، کردەوە چاکەکانیان کردووە، دوایی پەروەردگاری ئەوان ئەو کەسانە ئەخاتە ناو بەهەشت و میهرەبانی خۆی، ئەو چونەی ئەوان بۆ ناو بەهەشت سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە بۆ ئەوان.

﴿ وَأَمَّا الَّذِينَ كَفَرُوا أَفَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَاسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابو، بەوان ئەبێژرێ، ئایا ئایەتەکانی نامەی ئێمە نەخوێنراوەتەوە بەسەر ئێوەدا، دوایی ئێوە داوای گەورەیتان کرد لە ئاستیانا و باوەڕتان پێ نەهێنان و، ئێوە تاوانبارن و بێ باوەڕبون.

وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم
مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾
وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾
وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا
لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ
ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾

فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾

﴿ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَالسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِي مَا السَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴾ وە هەرکاتێ بیێژرایە بە تاوانباران: بەڕاستی بەڵێنی خودا بۆ زیندووبوونەوەی دوارۆژ ڕاستەو، هاتنی ڕۆژی دوایی گومانی تێدا نیە، ئێوەی تاوانبار ئەتان ووت: ئێمە نازانین ڕۆژی دوایی چ شتێکە؛ ئێمە باوەڕی بێگومانمان بە پەیدابوونی ڕۆژی دوایی نیە، مەگەر گومانێکە لە ئێوەۆ ئەبیێژرێ، ئێمە باوەڕی بێگومانمان بە هاتنی ئەو ڕۆژە نیە.

﴿ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُونَ ﴾ وە لە ڕۆژی دواییدا خراپەکانی شتێ ئەو تاوانبارانە کردبوویانَ لە جیهاندا بۆخۆیان دەرکەوت و، هاتە خوارەوەی سزای شتێ ئەوان لە جیهاندا گاڵتەیان بەو شتە ئەکرد، کە هاتنی ڕۆژی دوایی و زیندووبونەوەیە.

﴿ وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَذَا وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴾ وە بە تاوانباران ئەبیێژرێ لە ڕۆژی دواییدا: لەم ڕۆژەی دوایی‌دائێمە واز لە ئێوە ئەهێنین لە دۆزەخدا بن لەبەر ئەوەی فەرمانی ئێمەتان لەبیری خۆتان بردەوە و کارتان پێ‌نەکرد، هەر بەو جۆرە ئێوە وازتان لە بەڵێن بە گەیشتنی ئەم ڕۆژەی خۆتان هێنابو، جێگە ئێوە ئاگری دۆزەخە، بۆ ئێوە نیە لەم ڕۆژەدا هیچ کەسێ یارمەتیتان بدات و ڕزگارتان بکا لە سزا.

﴿ ذَلِكُم بِأَنَّكُمُ اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ﴾ هاتنە خوارەوەی ئەو سزایە بۆ سەر ئێوە، بەڕاستی بەهۆی ئەوەۆ وبوو، ئێوە ئایەتەکانی نامەی خوداتان بە گاڵتە وەرگرتبوو، ژیان و خۆشی جیهان و فریوی ئێوەی دابوو، واتان ئەزانی ژیان هەر ژیانی ئەم جیهانەیە و ژیانی تر نیە.

﴿ فَالْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴾ دوایی ئەمڕۆ ئەو تاوانبارانە لە دۆزەخ دەرناکرێن و، ئەوان داوای ئەوەیان لێ‌ناکرێ خودا لە خۆیان ڕازی بکەن بە گەڕانەوەیان بۆلای جیهان جارێ تر هەتا پەرستنی خودا بکەن.

﴿ فَلِلَّهِ الْحَمْدُ رَبِّ السَّمَاوَاتِ وَرَبِّ الْأَرْضِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴾ دوایی هەموو سوپاس و ستایشێ هەر بۆ خوایە، پەروەردگاری ئاسمانەکان و پەروەردگاری زەوی‌یە، پەروەردگاری هەموو بوونەوەرانە؟

﴿ وَلَهُ الْكِبْرِيَاءُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ وە هەر بۆ خودایە گەورەیی و دەستەڵات لە ناو ئاسمانەکان و زەویدا و، خودا خاوەن هێز و توانایە، هەموو شتێ لە جێگە شیاوی خۆیا دائەنێ و کەس باڵادەستی نی‌یە.

**بە یاریدەی خودا کۆتایی پێ‌هات، ئەی پەروەردگاری هەموو بوونەوەران**
**بگەرە فریام و لێم ببورە،تۆ خۆت ئەزانی من هەر تۆم هەیە**

تەفسیری زمناکۆیی

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. سوپاس و ستایش بۆ پەروەردەکەری هەموو بوونەوەران. درودی خودا لەسەر گیانی پاکی پێشەوای ئادەمیزاد پێغەمەری خودا و، لەسەر یار و یاوەران و پەیڕەوانی بێ.

## ﴿ سورەتی ئەلئەحقاف ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (٤). هەندێ تریان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (٣٥) هەندێ تریان لایان وایە" جگە لە ئایەتی (١٦) لە مەدینە هاتونەتە خوارەوە، ژمارەی ئایەتەکانی (٣٥) ئایەتن.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقْنَا
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن
دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ۖ
ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ
صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن
لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾
وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

﴿ حم ﴾ بۆ ڕوونکردنەوەی مانای ئەم پیتانە تەماشای سەرەتای سورەتی ئەلبەقەرە و سورەتەکانی تر بکەن.

﴿ تَنْزِيلُ الْكِتَابِ مِنَ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾ ناردنی ئەم نامەیە هەندێکی لە دوای هەندێ هاتوەتە خوارەوە لە لایەن خوایەکەوە زۆر بەهێز و بەتوانایە، زۆر زانایە هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿ مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و شتێ لە نێوان ئەواندان دروستمان نەکردوون، مەگەر بە دروستکردنێ هاوکاتە لەگەڵ ڕاستی دادپەروەریدا و، بۆلای کاتێکی دیاریکراو کە لەو کاتەدا کۆتایی بەبونی ئاسمانەکان و زەوییە و شتێ لە نێوانیاندا دێت و نامێنن.

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە واز لە شتێ ئەهێنن ئەوانی پێترسێنراوە کە کۆتایی پێهاتنی ئاسمانەکان و زەوییە لەو کاتە دیاریکراوەدا و، بیری لێناکەنەوە و خۆیان بۆ هاتنی ئەو ڕۆژە ئامادە ناکەن.

﴿ قُلْ أَرَأَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ ﴾ تۆ بڵێ بە بت پەرستان ئایا ئێوەئەتوانن هەواڵ بدەن بە من ئەو شتە ئێوە ئەیپەرستن لە جگەی خودا، ئێوە نیشانی منی بدەن ئەوان چ شتێکیان دروستکرد لەسەر زەوی، ئایا ئەو بتانەی ئێوە ئەیانپەرستن بەشێکیان هەیە لەگەڵ خودادا بۆ دروستکردنی ئاسمانەکان یان هەندێکیانا؟

﴿ ائْتُونِي بِكِتَابٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَا أَوْ أَثَارَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ ئێوە نامەیە بهێنن بۆ من لە پێش قورئانەوە، داوای لە ئادەمیزاد کردبێ بۆلای هاوبەشدانان بۆ خودا یا بە پاشماوەی زانیارێیە گەیشتبێ بە ئێوە بەڵگەبێ لەسەر ڕاستی ئەو شتەی ئێوە ئەڕۆن بۆلای و، وەرتان گرتبێ لە زانایانی پێشووەوە، ئەگەر ئێوە ڕاست ئەکەن کە خودا هاوبەشی هەیە لە بتەکانی ئێوە؟

﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ ﴾ وە چ کەسێ بێ گومڕاتر لە کەسێ بپاڕێتەوە لە کەسێ جگەی خودا، وەڵامی ئەو کەسە نەداتەوە هەتا ڕۆژی دوایی کاتێ بیپەرستێ و لێی بپاڕێتەوە و، ئاگای لە خۆی و لەو پاڕانەوە و پەرستنەی نەبێ، نە ئێستا و نە لەمەودوا؛ چونکە ئەو بتانە بەرد و درەختن تاشراوی دەستی ئادەمیزادن.

وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ۖ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠

إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ
وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ
فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ
إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ
ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾

﴿ وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاء وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ ﴾ وە هەرکاتێ ئادەمیزاد لە ڕۆژی دواییدا زیندووکرانەوە و کۆکرانەوە و نێردران بۆلای دەشتی پرسیار، ئەو بتانە ئەبن بە دوژمنی ئەو کەسانە ئەوانیان پەرستووە و، لە پەرستنی ئەوان بێزارن و بەدرۆیان ئەخەنەوە.

﴿ وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلْحَقِّ لَمَّا جَاءهُمْ هَذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾ وە هەرکاتێ بخوێنرێتەوە بەسەر بێباوەڕاندا چەندین بەڵگەی پەکخەر و ئاشکرا لە ئایەتەکانی قورئان، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە بەو ئایەتانە ئەخوێنرێتەوە بەسەریانا کاتێ چوو بۆلایان ئەڵێن بەبێ بیرکردنەوە ئەوەی هاتوە بۆلای موحەمەد جادوێکی ئاشکرا و پوچە.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ افْتَرَاهُ قُلْ إِنِ افْتَرَيْتُهُ فَلَا تَمْلِكُونَ لِي مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ﴾ وە بەوەیشەوە ناوەستن بڵێن قورئان جادووە بەڵکو ئەڵێن: موحەمەد خۆی لەخۆیەوە بەدرۆ و بوختان لەو قورئانەی هەڵبەستووە و، ئەیداتە پاڵ خودا، تۆ بڵێ: ئەگەر من خۆم ئەو قورئانەم هەڵبەستبێ، بێگومان گوناهێکی گەورەم کردووە، دوایی ئێوە نابنە خاوەنی هیچ شتێ بۆ من و سزای خودا لە من ناگێڕنەوە و، هیچ سودێ بە من نابەخشن.

﴿ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ كَفَى بِهِ شَهِيدًا بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴾ خودا زاناترە بە شتێ ئێوە گفتوگۆی تێدا ئەکەن و ئەیدەنە پاڵ من، بە گومانی ئێوە قورئان جادوە دەست هەڵبەستی منە، بەسە خودا ئاگاداری هەیە لە نێوان من و نێوان ئێوەدا پەیدائەبێ و، شایەتیم بۆ ئەدا کە من ڕاست ئەکەم و ئێو درۆئەکەن و، خودا لێخۆشبوونی زۆرە بۆ گوناهباران، میهرەبان و خاوەنی بەزەییە بۆ ئەو کەسانە پەشیمان ئەبنەوە.

﴿ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنْ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ ﴾ تۆ بڵێ بە دانیشتووانی مەکە: من تازە کەسێ نیم لە پێغەمەران و، یەکەمین پێغەمەرێ نیم کە خودا ناردبێتی بانگی ئادەمیزاد بکا بۆلای یەکێتی خودا، لە پێش منەوە چەندین پێغەمەری تر خودا ڕەوانەی کردوون و، من نازانم لەمەودوا چ شتێ بە من و بە ئێوە ئەکرێ و، بەڵام هەر خودا ئەیزانێ.

﴿ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰ إِلَيَّ وَمَا أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴾ من دوای شتێ ناکەوم مەگەر دوای شتێ ئەکەوم کە سروش نێراوە بۆلای من لەلایەن خوداوە، من هیچ کەسێ نیم مەگەر پێغەمەرێکی ئاشکرام ئێوە ئەترسێنم لە سزای بێ بەرستی و دەستور و پاسای ئایینی خودا بۆ ئادەمیزاد ڕون ئەکەمەوە.

بۆ زانین: بەڵگەو شایەت زۆرن لە لایەن بەنویسرائیلیەکانەوە لە تەوراتا کە موحەمەد پێویستە پەیرەوی بکرێ. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەم سورەتە لە مەکە هاتوەتە خوارەوە جگە لەم ئایەتەی دوایی کە لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە، لەبارەی زانای بەناوبانگی جوەکان عەبدوڵای کوڕی سەلام کە شایەتی دا لەسەر ڕاستی پێغەمەر و نوسینی ناوی لە تەوراتا بەم جۆرەی خوارەوە:

کاتێ عەبدوڵای کوڕی سەلام ویستی موسڵمان بێ ووتی: ئەی فروستادەی خودا: جوەکان خۆیان ئەزانن کە من و باوکم لە زانا بەناوبانگەکانی بەنوئیسرائیلین و من شایەتی ئەدەم کە تۆ فروستادەی خودایی و ناوت لە تەوراتا نووسراوە. کەواتە تۆ بنێرە بۆلای جوەکان چەند زانایەکیان لێ دیاری بکە بێن بۆ خزمەت جەنابت، من خۆمیان لێ ئەشارمەوە، تۆ پرسیاریان لێبکە پلەوپایەی من و باوکم تا چ رادەیەکە؟ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ناردی بە دوایانا و هاتن، پرسیاری عەبدوڵا و باوکی لای ئەوان کرد، لە وەڵامدا ووتیان: خۆی و باوکی چاکترین زانای ئێمەن، لەو کاتەدا عەبدوڵا هاتە دەرەوە و ووتی: من شایەتی ئەدەم موحەمەد پێغەمەری خودایە و ناوی لە تەوراتا نووسراوە، کەچی بێ شەرمانە کتوپڕ ووتیان: خۆت و باوکت خراپترین کەسن لەناو ئێمەدا، بۆ روون کردنەوەی ئەو رووداوە خودا ئەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ اللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِ فَآمَنَ وَاسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ تۆ بڵێ بە بێباوەڕان: ئایا ئێوە هەواڵ بدەن بە من ئێوە چ شتێ ئەڵێن: ئەگەر ڕوون بویەوە ئەو قورئانە لە لایەن خوداوە هاتووە و، من پێغەمەری خودام و، شایەتی بدا شایەتێ لە لایەن بەنوئیسرائیلیەکانەوە لەسەر وێنەی شتێ لە قورئاندایە لە تەوراتا هەیە دوایی ئەو شایەتە باوەڕی هێنابێ و، ئێوە خۆتان بە گەورە دانێن لە ئاستی ڕاستی ئەوەی لە تەوراتایە و باوەڕ نەهێنن، ئەو کاتە بیر و ڕاتان چۆن ئەبێ. بەڕاستی خودا شارەزایی تاقمی ناکا ستەمیان لە خۆیان کرد بۆلای رێگەی ڕاست.

﴿ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَا إِلَيْهِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنا بو ئەیان ووت بە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنابوو لە هەژارانی مەکە: ئەگەر ئەوەی موحەمەد داوای ئەکا چاکتر بوایە لەهەی ئێمە، ئێوەی هەژار و بێ دەسەڵات پێشی ئێمە نەدەکەوتن لە باوەڕهێنان لەو داواکاریەی موحەمەد، بە گومانی پوچی خۆیان هەر کەسێ پلەوپایە و سامانی هەبێ پێویستە هەموو چاکەیە بۆ ئەوبێ، ڕۆژان هاتن و ڕۆیشتن و بەندەیەکی ڕەشی هەژاری وێنەی بیلالی حەبەشی چووەتە سەربانی خانەی خودا و بە دەمی خۆی هاواری کرد و ووتی: هیچ خودایە شایانی پەرستن نیە جگەی خودا، موحەمەد نێراوی خودایە، پێغەمەر هەموو بتەکانی شکاند و خستیە ژێر پێی دالێشتووان.

أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ
عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي
ذُرِّيَّتِيٓ إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ
نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِيٓ أَصْحَٰبِ
ٱلْجَنَّةِ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾

﴿ إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّـهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ ووتویانە: پەروەردگاری ئێمە خودایە، لە پاشانا بەردەوامبوون لەسەر ئایینی خۆیان و لە یاسای ئیسلام لایان نەدابۆ لە جیهاندا بە کردار و بە گوفتار، دوایی هیچ جۆرە ترسێکیان لەسەر نیە بۆ سزادانیان لە ڕۆژی دواییدا و، خەفەت ناخۆن لەبۆ ئەو شتانەی لە کیسیان چوە لە جیهاندا.

﴿ أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَنَّةِ خَالِدِينَ فِيهَا جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ ئەو کەسانە دانیشتووی بەهەشتن لە ناویدان بەبەردەوامی، لەبەر پاداشت دا نەوەیان بەهۆی شتێکەوە ئەیکەن لە کردەوەی چاك لە جیهاندا.

﴿ وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ﴾ وە ئێمە فەرمانماندا وە بە ئادەمیزاد و بەوانمان سپاردووە چاکە بکەن لەگەڵ باوك و دایکی خۆیانا، بە تایبەتی دایکیان ئادەمیزاد هەڵئەگرێ لە منالّدانی خۆیا بە ئازارەوە، هەتا گەورەتر بێ ئازاری زۆرتر ئەبێ و، دایشی ئەنێ بە ئازاراوە لە کاتی لە دایکبوونی منالّەکەیا. بەو فەرمودەی خودایە ڕون ئەبێتەوە مافی دایك زۆرترە لە مافی باوك؛ چونکە ئەو منالّە هەڵئەگری و دای ئەنێ و خۆی برسی و تینوو تاڵ ئەکا و بەخێوی ئەکا و ئەیپارێزێ لە ئازار. بە داخەوە منالّ چاکەیان ئەکرد لەگەڵ باوك و دایکیانا و گوێ ڕایەڵی ئەوانبوون. بەلاّم ئێستا ئەبێ باوك و دایك بە گوێرەی ئارەزۆی منالّەکانی هەڵسێ و پابەندی فەرمانی ئەوان بێ.

﴿ وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا ﴾ وە ماوەی هەڵگرتن و دانانی برینەوە لە شیر سی (٣٠) مانگە یانێ دوو ساڵ و نیو. ئەو ڕستەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەمترین ماوە بۆ هەڵگرتنی منالّ لە منالّدانی دایکیانا بێ کەمتربێ لە شەش مانگ و، ماوەی شیرپێدانی (٢٤) مانگە، دوایی ئەبێ لە شیرخواردنەوە ببڕێتەوە، چونکە لە دوای (٢٤) مانگ شیر بۆ گەشە کردنی مندالّ بێ سوودە.

﴿ حَتَّى إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً ﴾ هەرەوها ئادەمیزاد دوای برینەوە لە شیر تەمەنی درێژە ئەکێشێ هەتا ئەگاتە هێز پەیدا ئەکا و ئەقڵی تەواو ئەبێ، تەمەنی ئەگاتە چل ساڵ کە کاتێ کۆتایی گەشەکردنی لەشی ئادەمیزادە. ماوەی تەمەنی ئادەمیزاد ئەم پلانە بەخۆیەوە ئەبینێ: لەشی ئادەمیزاد لە دوای لەدایکبوون گەشە ئەکا و پەرە ئەستێنێ، هەتا تەمەنی سی ساڵی، لەو تەمەنەدا گەشەکردنی لەشی مرۆڤ ئەوەستێ هەتا ئەگاتە چل ساڵ، دوای چل ساڵ نەخنە نەخنە لەشی مرۆڤ گەشەکردنی کەم ئەبێتەوە هەتا کاتی مردنی، ئەوانەیش باسکران پابەندە بەوەی لەشی مرۆڤ توشی نەخۆشی لاوەکی نەبێت.

بۆ زانین: لای شافیعیەکان و حەنبەلیەکان پیاو و ژن لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا باڵغ ئەبێ. لای مالیکیەکان لە تەمەنی (١٧) ساڵیدا. لای حەنەفیەکان پیاو لەتەمەنی (١٨) ساڵیدا و ژن لە تەمەنی (١٧) ساڵیدا باڵغ ئەبن، بەلای هەموویانەوە پیاو بە ئیمتیلام و ژن بە حەیز پێداهاتن باڵغ ئەبن. هەرچۆنێ بێ تەمەنی ئادەمیزاد نابێتە هۆی هۆشیاری و بیرکردنەوەی تەواو، هەتا تێنەپەڕێ بەسەریا چەندین تاقیکردنەوە بۆ ڕونبوونەوەی ڕوداو و کارەسات و، کردنەوەی چەندین گرێکوێرەی ژیان.

﴿ قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِي أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ الَّتِي أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَى وَالِدَيَّ ﴾ ئەو ئادەمیزادەی کە هەستی کردووە بە مافی دایك و باوك بەسەریەوە ئەڵێ: ئەی پەروەردگاری من: تۆ یارمەتی من بدە و بیخەرە دڵمەوە کە من سوپاسی ئەو چاکەیەی ئەوتۆ بکەم تۆ بە میهرەبانی خۆت ڕژاندووتە بەسەر من و باوك و دایکما کە هەموومان پەیوەندیمان بە ئایینی ئیسلامەوە هەیە و باوەڕمان بە یەکێتی تۆ هەیە.

﴿ وَأَنْ أَعْمَلَ صَالِحًا تَرْضَاهُ وَأَصْلِحْ لِي فِي ذُرِّيَّتِي إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ وە یارمەتیم بدە کە من کردەوەیەکی چاکی وا بکەم تۆ لەو کارە ڕازی بی و، تۆ لەبەر سودی من منداڵەکانم بکە بە جێگەی چاکەیەکی وا پەیوەندییان بەتۆوە پتەوبێ و، چاکە لەگەڵ باوك و دایکیانا و لەگەڵ هەموو ئادەمیزاد بکەن.

منداڵانی ئادەمیزاد بارێکی قورس و بەخێوکردنێکی گرانن بەسەر باوکەوە، بەختیاری خۆی لەو بارە گرانەدا ئەبینێ کاتێ خودا منداڵێکی چاکی پێ‌ببەخشی و، ئەگەر چاك نەبێ ڕووداوی نالەباری زۆر کۆئەبێتەوە بەسەریا، بەڕاستی من ئەگەڕێمەوە بۆلای تۆ بەهەرشتێ تۆ پێت خۆشبێ و، بەڕاستی من لەو کەسانە ئەبم مل کەچی پەرستنی تۆن.

﴿ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّئَاتِهِمْ فِي أَصْحَابِ الْجَنَّةِ ﴾ ئەو تاقمانە چاکە لەگەڵ دایك و باوکی خۆیانا ئەکەن و سوپاسی چاکەی خودا ئەکەن کەسانێکی ئەوتۆن ئێمە چاکترین شتێ ئەوان کردوویانە لەوانی وەرئەگرین و، لە سزای ئەو خراپانەیان ئەبورین لە جیهاندا کردوویانە، لەگەڵ دانیشتووانی بەهەشتان ولەڕیزی ئەواندا ئەژمێرڕێن.

﴿ وَعْدَ الصِّدْقِ الَّذِي كَانُوا يُوعَدُونَ ﴾ بەڵێنێکی ڕاستی ئەوتۆیە لە لایەن خوداوە، بەڵێن دراوە بەوان، کە خودا چاکەکانیان وەرئەگرێ و لە سزای خراپەکانیان ئەبورێ و ئەچنە ناو بەهەشتەوە.

وَالَّذِي قَالَ
لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَا أَتَعِدَانِنِي أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ الْقُرُونُ مِن
قَبْلِي وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ اللَّهَ وَيْلَكَ آمِنْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ
مَا هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ
الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا
خَاسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَالَهُمْ وَهُمْ
لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ
فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ
بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾

﴿ وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ افٍّ لَّكُمَا أَتَعِدَانِنِي أَنْ أُخْرَجَ ﴾ وە کەسێکی ئەوتۆ بە باوك و دایکی خۆی ئەووت: بێزاری منە ئێوە، کاتێ داوایان لێ ئەکرد، باوەڕ بە ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە بهێنە، ئایا ئێوە بەڵێن بەمن ئەدەن بەوەی من لە گۆڕ دەرئەهێنرێم و زیندووئەکرێمەوە دوای مردنم، شتێ وانابێ کە ئێوە ئەیڵێن.

﴿ وَقَدْ خَلَتْ الْقُرُونُ مِن قَبْلِي﴾ وە بە ڕاستی دانیشتووانی چەند خولەك لە پێش منەوە ڕۆیشتوون و مردون و زیندوونەکراونەتەوە، ئیتر من چۆن زیندوو ئەکرێمەوە... مەبەست لە هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە بە گوێرەی ڕووالەت هەموو منالێکی بێباوەڕە، باوك و دایکی خۆیانماندوو ئەکەن و هەوڵ ئەدەن باوەڕبهێنێ و ترسی بێفەرمانی خودایان بۆ ڕوون ئەکەنەوە و، منالەکانیان وولامیان نادەنەوە، منالی ئەم سەردەمەی ئێمە ناوەرۆکی ئەو ئایەتە ئەیان گرێتەوە.

﴿ وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ اللَّهَ وَيْلَكَ آمِنْ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَـذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْـأَوَّلِينَ ﴾ وە باوك و دایکی ئەو منالە بێباوەڕە پڕ بە دەمی خۆیان هاوار ئەکەن و پەنائەگرن بەخوا لە

خراپەی کاری ئەو منالە ئەڵێن: هاوار و لەناوچون و بۆتۆیە، تۆ باوەڕبهێنە بە زیندووبوونەوە، بەڕاستی بەڵێنی خودا ڕاستە و، زیندووبوونەوە بێگومانە، دوایی ئەو منالە ئەڵێ بەباوك و دایکی: ئەو گفتوگۆیەی ئێوە لەبارەی زیندووبوونەوەوە هیچ شتێ نیە، مەگەر نوسراوی پڕوپوچی پێشووانە.

﴿ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ الْقَوْلُ فِي أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُوا خَاسِرِينَ ﴾ ئەو کەسانەی ئەوتۆ واز لە ئامۆژگاری دایك و باوك و پیاوچاکانی تر ئەهێنن، فەرمودەی خودا بۆ سزادانیان پێویست کراوە لە سەریان لەناو ڕیزی ئەو نەتەوانەدا ڕۆیشتوون، باوەڕیان نەهێناوە و لەسەر بێباوەڕی مردوون لە پێش ئەوانەوە لە جنۆکە و ئادەمیزاد. بەڕاستی ئەو کەسانە زیانۆمەندن، ناگەڕێنەوە بۆلای جیهان.

﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَاتٌ مِّمَّا عَمِلُوا وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَالَهُمْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾ وە بۆ هەموو کەسێ لە باوەڕداران و لە بێباوەڕان و لە جنۆکە و لە ئادەمیزاد چەندین جێگە و پلەوپایەی جیاوازیان هەیە لە ڕۆژی دواییدا تایبەتن بەخۆیانەوە لە پاداشت و لە تۆڵەی شتێ کردوویانە لە جیهاندا لە کاری چاك و خراپ، ئێمە زیندوویان ئەکەینەوە لەبەر ئەوەی خودا پاداشتی کردەوەکانیان بداتی بە تەواوی و ئەوان ستەمیان لێناکرێ.

﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابو نومایش ئەکرێن بەسەر ئاگری دۆزەخدا، بەوان ئەبێژرێ: ئێوە لە ناو لە ژیانی جیهانی خۆتاندا جۆرەهاشتێ چاك و نایاب لە سامان و کۆشك و خواردەمەنی پاك و بەتام و، هیچ شتێکتان پاشەکەوت نەکرد بۆ دوارۆژی خۆتان و، بەو شتانە ڕاتان ئەبوارد و، بە تەواوی بەشی خۆتانتان وەرگرت.

﴿ فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴾ دوایی ئەمڕۆ ئێوە پاداشتتان ئەدرێتەوە بە سزایەکی وا ڕسواتان ئەکا و ئابڕووتان ئەبا، بەهۆی شتێکە ئێوە داوای گەورەیتان ئەکرد لە زەوی جیهاندا بەهۆی ئەو شتەوە بە جۆرێکی ناڕەوا و ناشایستە و، بەهۆی بێفەرمانی خوداوە و، لادانتان لە سنووری پەرستنی خودا.

۞ وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ
مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ
عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٢١﴾ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا فَأۡتِنَا
بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ
وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٣﴾

فَلَمَّا رَأَوۡهُ عَارِضٗا مُّسۡتَقۡبِلَ أَوۡدِيَتِهِمۡ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٞ مُّمۡطِرُنَاۚ
بَلۡ هُوَ مَا ٱسۡتَعۡجَلۡتُم بِهِۦۖ رِيحٞ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ
شَيۡءِۭ بِأَمۡرِ رَبِّهَا فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي
ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰهُمۡ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمۡ فِيهِ
وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ سَمۡعٗا وَأَبۡصَٰرٗا وَأَفۡـِٔدَةٗ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُمۡ سَمۡعُهُمۡ
وَلَآ أَبۡصَٰرُهُمۡ وَلَآ أَفۡـِٔدَتُهُم مِّن شَيۡءٍ إِذۡ كَانُواْ يَجۡحَدُونَ
بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدۡ
أَهۡلَكۡنَا مَا حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡقُرَىٰ وَصَرَّفۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ
﴿٢٧﴾ فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢۖ
بَلۡ ضَلُّواْ عَنۡهُمۡۚ وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٢٨﴾

﴿ وَاذْكُرْ أخَا عَادٍ إِذْ أنذَرَ قَوْمَهُ بِالْأَحْقَافِ ﴾ وەتۆ بیری هودی برای ڕەگەزی و پشتی هۆزی عاد بکەرەوە کە دانیشتوی ئەحقافبون، کاتێ خودا هودی ڕەوانەکرد بۆلایان و، ئەو تاقمەی خۆیان ترسان لە سزای خوداو، وای لێ کردن بە تەنها هەر خودا بپەرستن و واز لە پەرستنی جگەی خودا بهێنن، ئەو تاقمەی هود وەك ئەم تاقمەی تۆ عەرەب بوون و خاوەنی هێزو دارایی زۆرتر بوون. ووشەی (الأحقاف) بە مانایەکی درێژو بەرزو پێچاو پێچە.

جێگەیە کەوتۆتە نێوان عومان و مەهرە لە باشوری نیوە دورگەی عەرەب، لکاوە بە حیجازەوە.

﴿ وَقَدْ خَلَتْ النُّذُرُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ ألَّا تَعْبُدُوا إلَّا اللَّهَ إِنِّي أخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾ وە بەڕاستی ڕابوردوە چەندین پێغەمەر لە پێش تاقمی هود دوای تاقمی پێغەمەرەکانیان ئەترسان لە سزای خودا، بەوانیان ئەووت: کە ئێوە لە جێگەی خودا کەسێ تر مەپەرستن. بەڕاستی من ئەترسم بێتە خوار بەسەر ئێوەدا سزایەکی زۆر گەورە، ئەگەر ئێوە باوەڕ نەهێنن بە خوایێکی تەنها.

﴿ قَالُوا أجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ آلِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ ﴾ هۆزی عاد بە هودیان ووت: ئایا تۆ هاتوی بۆلای ئێمە لەبەرئەوەی تۆ ئێمە لابدەی لە پەرستنی خواکانی

خۆمان و تاکە خودایە بیپەرستن؟ ئێمە پەیڕەوی تۆ ناکەین، دوای تۆ ئەگەر لەو کەسانەی ڕاست بکەن، تۆ ئەو سزایە بهێنە بۆلای ئێمە ئەو سزایە تۆ بەڵێنی ئەدەی بە ئێمە .

﴿ قَالَ إِنَّمَا الْعِلْمُ عِندَ اللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّا أُرْسِلْتُ بِهِ وَلَكِنِّي أَرَاكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴾ هود ووتی بە هۆزی عاد: بەڕاستی کاتی هاتنی ئەو سزایە زانینەکەی هەر لای خودایەو، من هەر ئەوەم لەسەرە بە ئێوە ڕابگەیەنم ئەو شتەی من پێیەوە نێرراوم و، بەڵام من هەر ئێوە وا ئەبینم تاقمێکی نەزانن، چونکە ئێوە داوا ئەکەن ئەو سزایە بێت بۆ سەرتان و، نازانن پیشەی پێغەمەران هەر ڕاگەیاندنە.

﴿ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ﴾ دوایی ئەو تاقمە توشی گرانی بوون بەهۆی بێ بارانییەوەو، چاویان بەو سزایە کەوت خۆیان داوایان کردبوو بڵاوبوبوە بە کەناری ئاسماندا و ڕوی پێ کرابوو بۆلای ئەو شێوەی ئەوان، شادمانی ڕوی تێ کردن و، ووتیان: ئەوەی پەیدا بووە هەورێکە بارانمان بۆ ئەبارێنێ و، تینویەتی ئێمە ئەشکێنێ و کشتوکاڵ و باخەکانمان ئاو ئەداو تووشی هەرزانی و خۆشی ئەبین .

﴿ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ هود بەوانی ووت: ئەو هەورە ئێوە ئەیبینن، ئەو سزایەیە ئێوە خۆتان داواتان کرد بە گورجی بێت، بۆتان ئەو شتە بایەکە لەناویدایە سزایەکی خاوەن ئازار بۆ ئێوە.

﴿ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَى إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ كَذَلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴾ ئەو بایە بەهۆی فەرمانی پەروەردگاری خۆیەوە هەموو شتێکی لەناو بردن، بە خۆیان بە ئاژەڵ و دارایی و سامانیانەوە، دوایی هیچ شتێ نەئەبینرا جگە لە کەلاوە ڕوخاوەکەی جێگەکانیان، هەر بەو جۆرە ئێمە ئەوانمان لەناوبرد، هەروایش ئێمە پاداشتی هەموو تاقمێکی تاوانبار ئەدەینەوەو لەناویان ئەبەین ئەگەر باوەڕ نەهێنن.

﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِن مَّكَّنَّاكُمْ فِيهِ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە هۆزی عادمان لەناوبردن کاتێ بێ فەرمانی خودایان کردو، بەڕاستی ئێمە دارایی وامان بەخشیبوو بەوان، وێنەی ئەوەی بەخشرابو بەوان، ئێمە بە ئێوەی بت پەرستانی قوڕەیش نەبەخشیوە، ئایا ئێوە ناترسن ئەوەی توشی هۆزی عادو جگەی ئەوانبو، توشی ئێوەیش بێ؟.

﴿ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَى عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم مِّن شَيْءٍ ﴾ وە ئێمە گوێچکەو چاودڵمان بەخشی بوو بە هۆزی عاد، بۆ ئەوەی شتێ چاکبێ ببیسن و ببینن و بیری لێ بکەنەوە دوایی کوێچکەو چاو دڵی ئەوان هیچ سودێکی بەوان نەبەخشێ، چونکە بەکاریان نەهێنان بۆ ئەو مەبەستانەی بۆیان دروست کراون.

﴿ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُون ﴾ سودیان بەوان نەبەخشی، لەبەر ئەوەی ئەوان بڕوایان بە ئایەتەکانی نامەی ئێمە نەهێنا و، توشی ئەوان بو سزای ئەو شتەی ئەوان گاڵتەیان پێئەکرد لە بوونی ڕۆژی دوایی و زیندووبوونەوە، ئەو سزایە ئەملاو لای لێ گرتن.

﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ الْقُرَى وَصَرَّفْنَا الْآيَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە ئەو گوندانەی لەم لاولای ئێوەوەبوون و دراوسێی ئێوەبوون، وەك حیجر و سەمود و جگەی ئەوان هەموویانمان لەناوبردن؛ لەبەرئەوەی بێفەرمانی خودایان کردبوو، ئێمە چەندین بەڵگەی ئاشکرامان تێدا دووپات کردبووەوە بۆیان، لەبەر ئەوەی ئەوان بگەڕێنەوە بۆلای فەرمودەی خودا، بەڵام ئەوان پەشیمان نەبونەوە و لەناومان بردن.

﴿ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ الَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ قُرْبَانًا آلِهَةً ﴾ دوایی بۆ کەسانێکیئەوتۆ جگەی خودایان ئەکرد بەخودا بۆخۆیان یارمەتی ئەوانی نەدا، ئەیانکردن بە خودا هەتا نزیکیان بخەنەوە لە خودا و بۆیان بپاڕێنەوە.

﴿ بَلْ ضَلُّوا عَنْهُمْ وَذَلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴾ بەڵکو ئەو شتانەی ئەوان ئەیان کردن بەخودا بۆخۆیان. لەوان ونبوون و یارمەتییان نەدان و، ئەو یارمەتی نەدانەی ئەوان نیشانەی بوختان و هاوبەشدانانی ئەوانبوبو خودا و، بەروبومی ئەو درۆکردنەوەی ئەوانبو کە ئەو بتانە بۆ ئەوان ئەپاڕێنەوە لای خودا.

وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾

بۆ زانین: بەر لەئەوەی دەست بکەن بە ماناکردنی ئەو ئایەتانە پێویستە بزانین: پیشە و کاری ئەقڵ ئەوەیە. فەرمانبدا بە بوونی شتێ یا نەبوونی. بەهۆی بەڵگەیەکەوە بگونجێ لەگەڵ سروشتی ئەو شتە، بەهۆی هەستەوە یا بەهۆی تاقیکردنەوەوە، بێگومان ئەوەی هەستی پێنەکرێ ئەقڵ ناتوانێ فەرمان بدا بەبوونی، جگەی خوای مەزن کە ئەقڵ بەهۆی چەندین بەڵگەی ئاشکراو فەرمان ئەدا بە بوونی خودا، هەرچەندە هەستی پێ ناکرێ، نەبەچاو، نە بەهۆی ئامێری ترەوە،

هەندێ لە بونەوەران هەن هەستیان پێ ناکرێ، بە وێنەی جنۆکە و فریشتەکان، جگە لە سروش و فەرموودەکانی خودا و پێغەمەر، ڕێگەیە تر نیە نیە بۆ ئێمە لەسەر بوونیان. کەواتە ئەگەر سروش هاتە خوارەوەلەسەر بوونیان پێویستە ئێمە ئەو کاتە بڕوامان بە بوونیان هەبێ و ، یەکێ لەو بوونەوەرانە جنۆکەیەکە خودای مەزن لەو ئایەتانەدا باسیان ئەفەرموێ؛ بۆیە پێویستە ئێمە بڕوامان بە بوونی هەبێ.

زانایان ئەڵێن: جنۆکەکان چەن تاقمێکن و چەن نەتەوەیەکن، هەروەك ئادەمیزادی سەرزەوی: هەیانە جون و هەیانە گاور، هەیانە موسڵمان، هەیانە سونین و هەیانە شیعەن، هەروەرها چەند بیر و باوەڕی تریان هەیە، ئەتوانن خۆیان بنە وێنەی هەموو گیانداریێ، خوای مەزن پاداشتی هەموو کردەوەیەکی چاك و خراپیان ئەداتەوە، جنۆکە داوای بەجێهێنانی فەرمانی خودایان لێ ئەکرێ، جا بۆیە پێویستە بزانن جنۆکە چۆن موسڵمان بوون.

زانایان ئەڵێن: جنۆکەکان بەرلە ئایینی ئیسلام بەرز ئەبوونەوە بۆلای ئاسمان گوێیان ئەگرت لە گفتوگۆی فریشتەکان، بە گوێرەی ئارەزۆی خۆیان، مەبەستی خۆیانیان بڵاو ئەکردەوە، کاتی دەرگای ئاسمانیان لێ داخرا و، پاسەوانیان بۆ دانرا لە لای خودای مەزنەوە و، قەدەغە کرا لەوان گوێ بگرن لە گفتوگۆی فریشتەکان سەریان سوڕما، بۆیان دەرگەوت ڕووداوێکی گەورە ڕووی داوە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕووداوە حەوت کەسیان یان نۆ کەسیان لە زانا گەورەکانی خۆیانیان ڕەوانەی جێگەکانی زەوی کرد، ڕۆیشتن گەیشتنە (توهامە) لە پاشان چوونە (وادی نخلە)، کاتێ پێغەمەری خودا لە (تائیفەوە) ئەگەڕایەوە بۆ مەکە، لە شەوێکدا نوێژی ئەکرد، لەو شیوەدا، جنۆکەکان گوێیان ئەگرت لە پێغەمەر کە قورئانی ئەخوێند، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ جنۆکەکانی نەبینی و هەستی پێ نەکردن، دوایی جنۆکەکان گەڕانەوە بۆلای تاقمەکەی خۆیان، ئەو ڕووداوەیان بۆ گێڕانەوە بەوانیان ووت: پێویستە ئێوەی جنۆکە باوەڕ بەو پێغەمەرە بهێنن، خوای مەزن ئەو ئایەتەی ناردەخوارەوە و پێغەمەری ئاگادار فەرموو.

هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن: پێغەمەری خودا فەرمانی پێدرابوو کە جنۆکەکان بترسێنێ لە باوەڕنەهێنان و، قورئانیان بەسەردا بخوێنێتەوە، هەندێ لە هاوەڕێکانی پێغەمەر ئامادەبون پێغەمەر فەرمووی: من فەرمانم پێدراوە ئەم شەو قورئان بخوێنمەوە بەسەر جنۆکەکاندا، چ کەسێ لە ئێوە لەگەڵ مندا دێت، دووسێ جار ئەو فورمووودەیە دووپات کردەوە، هەموو دانیشتووان لە هاوڕێکانی پێغەمەر سەریان داخست جگە لە عەبدوڵای کوڕی مەسعود ووتی: لەو شەوەدا کەس ئامادەی چون نەبوو لە خزمەت پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ جگە لە من، عەبدوڵا ووتی: ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە لای سەرەوەی مەکە لە (شعب الحجون) دوایی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بازنەیەکی بۆ کێشا و فەرمووی لەم بازنەیە دەرنەچی هەتا من دێمەوە بۆلای تۆ، پێغەمەری خودا دەستی کرد بە قورئان خوێندن، قاڵە قاڵ و دەنگێکم ئەبیست، پێغەمەر فەرمووی کە هاتەوە بۆلای من: هیچ شتێکت بینی، ووتم: بەڵێ چەند پیاوێکی ڕەشم بینی، پێغەمەر فەرمووی: ئەوانە جنۆکەی (نەسیبن) بوون ژمارەیان (١٢) هەزار کەسبوون، ئەو سوورەتەی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ خوێندیەوە

بەسەر جنۆکەکاندا سورەتی (العلق) بوو، ئیتر بەهەرجۆری بێ،پێویستە ئێمە بڕوامان بە بوونی جنۆکە هەبێ، بڕوامان وابێ خودا فەرمانی داوە بەهەندێ جنۆکە کە گوێ بگرن لە خوێندنی قورئانی پیرۆز، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مەبەستە خوای مەزن ئەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئێمە چەن کەسێکمان لە جنۆکەکان نارد بۆلای تۆ گوێ بگرن لەو قورئانە تۆ ئەیخوێنی.

زانایان بیروبۆچوونیان جیاوازە لەبارەی ژمارەی ئەو جنۆکانە هەندێکیان ئەڵێن: ژمارەیان حەوت یا نۆ نەفەربوون، هەندێ تریان ئەڵێن: (١٠-١٢) نەفەربوون، هەندێ تریان لایان وایە حەفتا نەفەربوون، هەرچەندە بن لە مەبەستەکە ناگۆڕن. خاوەنی تەفسیری حوسەینی بە زمانی فارسی ئەفەرموێ: خاوەنی نامەی (عين المعاني) ئەڵێ: ئەگەر حەوت کەس بن ناوەکانیان ئەمانەن: شاحر، ناصر، رش، مش، ازدا، بيان، أجم. خۆ ئەگەر نۆ نەفەربن، ئەمەیش ناوی دووانەکانی ترە: دوو، ولیمە.

﴿ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَى قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴾ دوایی کاتێ جنۆکەکان ئامادەی خوێندنی قورئان بوون، هەندێکیان بەهەندێ تریان ووت: ئێوە بێ دەنگبن، بۆ ئەوەی بتوانین گوێ بگرین لە خوێندنی قورئان، دوایی کاتێ کۆتایی بە خوێندنی قورئانەکە هات لە لایەن پێغەمەرەوە،جنۆکەکان گەڕانەوە بۆلای تاقمەکانی خۆیان، ئەوانیان ترسان لە شتێ بیستبویان لەو قورئانە.

﴿ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَى مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَى طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ جنۆکەکان ووتیان: ئەی تاقم و کۆمەڵی ئێمە: بەڕاستی ئێمە ناوەرۆکی نامەیەکمان بیستووە هاتووەتە خوارەوە لە دوای موسا، بەڕاستی گێڕاوە ناوەرۆکی ئەو شتانەی لە نامەکانی تردا هاتووەتە خوارەوە، جنۆکە و ئادەمیزاد شارەزای بیروباوەڕی و ڕاست ئەکا، بۆلای ڕێگەی ڕاست لە دەستوور و یاسای ئایین.

﴿ يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾ ئەی تاقمی ئێمە: پێویستە ئێوە وەڵامی ئەو کەسە بدەنەوە بانگی ئێوە ئەکا بۆلای ئایینی خودا و، باوەڕی پێ بهێنن، ئەو کەسەیش ناوی موحەممەدە، خودا لە گوناهی ئێوە خۆش ئەبێ و ئێوە ئەپارێزێ لە سزای خاوەن ئازار.

﴿ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَولِيَاء أُوْلَئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴾ وە هەرکەسێ وەڵامی ئەو کەسە نەداتەوە بانگی ئێوە ئەکا بۆلای ئایینی خودا، دوایی ئەو کەسە ڕزگاری نابێ لە سزای خودا و، بۆ ئەو کەسە نابێ هیچ کەسێ بارمەتی بدا و بیان پارێزی لە سزای خودا، ئەو کەسانەی باوەڕ نەهێنن بە خودا و بەو کەسە لە ناو گومڕاییەکی ئاشکرادان.

أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْۦِىَ ٱلْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰٓ
إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ
أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا
كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٤﴾ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ
وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا
سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ ۚ بَلَٰغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾

﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَى أَنْ يُحْيِيَ الْمَوْتَى بَلَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ ئایا بێباوەڕان نەیانزانیوە کە بە ڕاستی ئەو خودایەی ئەوتۆ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە لە نەبوونەوە هاورد نیەتە بوونەوە، دروست کردنەکەیان ئەو خودایەی ماندو نەکردووە، توانای هەیە بەسەر ئەوەدا کە مردووەکـان زینـدوو بکاتـەوە دوای مردنیان؟ بەڵی. بەڕاستی خودا توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکا و ماندونابێ.

﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَلَيْسَ هَذَا بِالْحَقِّ قَالُوا بَلَى وَرَبِّنَا قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنا نومایش ئەکرێن بەسەر ئاگری دۆزەخدا، بەوان ئەبێژرێ: ئایا ئەم سزایە ڕاست نیـە؟ ئێـوە بڕواتـان پێـی نـەبوو، بێباوەڕان لـە وولامدا ئەڵێن: بەڵێ سوێندمان بە پەروەردگاری خۆمان ئـەو سـزایە زۆر ڕاسـتە، دوایی خودا ئەفەرموێ: ئێوە ئەو سزایە بچێژن بەهۆی ئەو شتەی ئێوە باوەڕتان پێ نەهێناوە کـە زیندووبوونەوەی ڕۆژی دواییە.

﴿ فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ ﴾ دوایـی تـۆ ئـارام بگـرە لـەسـەر ئـازار و باوەڕنـەهێنانی تاقمەکـەی خـۆت، هـەروەك ئـەو پێغەمەرانـەی خـاوەنی نیـاز و کۆشـش و خۆڕاگرتوبون کە هەندێ لە پێغەمەران ئارامیان گرتبوولەسەر ئازاری سەخت و گران.

زۆربەی زۆری زانایان لایان وایە ئەو پێغەمەرە خۆڕاگرانە پێنج پێغەمـەرن: نـوح، ئیـبراهیم، موسا، عیسا، موحەمەد. هەریەکە لەو پێنج پێغەمەرانە یاسـاو دەسـتوورێکی تایبـەتیان هـەبووە خودا پێویستی کرد کار بە هەموو دەستوورەکانیان بکرێ، هەتا پێغەمەرێ تر بە دوایانا ئەنێررێ. بەڵام موحەمەد کۆتایی بە ناردنی پێغەمەری تر هێناوە، دەستور و یاساکەیشـی بەردەوامـە هـەتا

ڕۆژی دوایی و ناگۆڕی. بەڵام پێغەمەرەکانی تر جگەی ئەو پێنج پێغەمەرە هەریەکەیان کاریان بە یاسای پێغەمەری پێش خۆیان کردووە، ئەوەی باسکرا لەبارەی مەبەست لە (أولو العزم) بیروبۆچوونی زۆربەی زانایانە.

بەڵام زانایانی تر بیروبۆچوونیان جیاوازە لە دیاریکردنی ئەو پێغەمەرانە خاوەنی کۆشش و خۆڕاگرتنن، هەندێکیان ئەڵێن: بریتین لە هەموو پێغەمەران جگەی یونوس. هەندێ تریان ئەڵێن: بریتین لەو (١٨) پێغەمەرانە لە سورەتی (ئەلئەنعامدا) ناویان براوە و، خودا لەبارەی ئەوانەوە ئەفەرموێ:

﴿ فبهذه هم أقتده ﴾ هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن بریتین لە شەش پێغەمەر: نوح کە ماوەیەکی زۆر ئارامی گرت لە سەر ئازاری تاقمەکەی، ئیبراهیم ئارامی گرت لەسەر فڕێدانی بۆناو ئاگر. ئەو کوڕەی ئیبراهیم ئارامی گرت لەسەر سەربڕینی خۆی، یەعقوب ئارامی گرت لەسەر کوێربوونی چاوی و وونبوونی یوسوف. یوسوف ئارامی گرت لەسەر فڕێدرانی بۆلای چاڵێکی زەوی لە لایەن براکانیەوە، ئەیوب ئارامی گرت لەسەر ئازاری لەشی و لەناوچوونی سامان و خێزانەکەی. هەندێ تریان ئەڵێن بریتین لە نوح و هود و ساڵح و شوعەیب و موسا، هەریەکە لە زانایانە خاوەنی بەڵگەی خۆیانن، خراپەیش ڕوویان تێ ناکا.

﴿ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ ﴾ تۆ پەلە مەکە بۆ هاتنە خوارەوەی سزا بۆ سەر بت پەرستان، بێگومان سزا دێتە خوار بۆ سەریان لە ڕۆژی دواییدا. بەڵام مانەوەیان هەرچەندە درێژبێ لە جیهاندا، ئەو بێ باوەڕانە ئەو ڕۆژە ئەو سزایە بەڵێنی پێ دراوە توشی ئەوان ببێ وای ئەبینن لە جیهاندا نەماونەتەوە مەگەر ماوەیەکی کەم لە ڕۆژێ.

﴿ بَلَاغٌ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ ﴾ ئەو قورئانە ڕاگەیاندنی پەیامەکانی خودایە و، ئامۆژگاری تەواوە بۆ ئەو کەسانەی داوای ڕانموویی بکەن و پێویستیان بە شتێ تر نیە، دوایی ئایا جگەی ئەو کەسانەی لایانداوە لە سنووری دیاریکراوی خودا لەناو ئەچن و سزایان ئەدرێ؟ بێگومان جگەی ئەوان سزایان نادرێ و، بەڕاستی ئەو کەسانە خۆیانیان پاراستووە لە بێفەرمانی خودا لە جێگەیەکی بێ ترسان و، لەناو بەهەشت لەسەر کانیاوی شیریندان.

# ﴿ سورەتی موحەمەد ﴾

لەمەدینە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان جگە لە ئایەتی (١٣) بە ڕێگەوە کاتێ پێغەمەر کۆچی کردووە بۆ مەدینە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٣٨) ئایەتن.


بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿١﴾ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۙ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا اتَّبَعُوا الْبَاطِلَ وَأَنَّ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّبَعُوا الْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَالَهُمْ ﴿٣﴾ فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴿٦﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە، وازیان لە ئیسلام و لە ڕێگەی ئایینی خودا هێناوە و، ئادەمیزاد ئەگێڕنەوەوە لەوەی موسڵمان بن، خودا پاداشتی کارەکانیانی پوچ کردووەتەوە، وەك ئەبوجەهل و هاوڕێکانی، نانیان ئەدا بە دانیشتووان و سەردانیان لە خزمەکانیان و چاکەکردنیان لەگەڵ خزمان و دراوسێ‌کانیان.

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَى مُحَمَّدٍ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان

کردووە و، باوەڕیان بەشتێ هێناوە و نێرراوەتە خوار بۆ سەر موحەمەد و، ئەوەی نێراوەتە خوارەوە ڕاستە لە لایەن پەروەردگاری خۆیانەوە دەرچووە، خودا بەهۆی کردەوەی چاکەوە خراپەکانیان ئەپۆشێ و لەوان خۆش ئەبێ و، کاروفرمانی هەردوو جیهانیان بە چاك ئەگێڕێ و یارمەتیان ئەدا.

﴿ ذَلِكَ بِأَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا اتَّبَعُوا الْبَاطِلَ وَأَنَّ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّبَعُوا الْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾ پوچ کردنەوەی پاداشتی چاکەی بێباوەڕان و لابوردن لە خراپەی باوەڕداران، بەهۆی ئەوەیەوە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە، دوای کاری پوچ کەوتوون وەك بت پەرستی و، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە دوای ڕاستیە کەوتوون لە لایەن پەروەردگاری خۆیانەوە دەرچووە، بە وێنەی فەرموودەکانی قورئانی پیرۆز.

﴿ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَالَهُمْ ﴾ هەر بە جۆرەی ڕونکرایەوە خودا ڕوونی ئەکاتەوە بۆ ئادەمیزاد وێنەکانی خۆیان، ڕوونی ئەکاتەوە بۆ پیاوی چاك پاداشتی چاکەی خۆی لە ڕیزی وێنەی خۆیا لە پیاوەکان، هەتا لەسەر چاکەی خۆی بەردەوامبێ، سزای تاوانباران ئەدا بەوێنەی خۆی لەڕیزی تاوانباراندا هەتا واز لە خراپە بهێنێ و باوەڕبهێنێ. کاتێ خودای مەزن ئەوانەی پێشەوەی ڕوون کردەوە ئەفەرموێ:

﴿ فَإِذا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّى إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ ﴾ دوایی کاتێ ئێوەی باوەڕدار گەیشتن بە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە، ڕوبەڕوویان بوونەوە لە جەنگدا و لە کوشتاردا ئەبوایە جەنگتان لەگەڵیانا بکردایە، دوایی ئێوە بدەن لەگەردنیان و بیان کوژن هەتا ئێوە زۆریان لێ ئەکوژن و دەست ئەگرن بەسەریانا و توشی لاوازی و بێتوانایی ئەبن.

﴿ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ﴾ دوای ئەوەی زۆرتان لێ کوشتن ئێوە بەندیان بکەن و پێونەکانیان توند بکەنەوە هەتا ڕانەکەن لە دەستتان و جارێ تر پەلامارتان بدەنەوە، دوایی یا ئێوە چاکەیان لەگەڵ ئەکەن و بەرەڵایان ئەکەن بەخۆڕایی و، یا بریتی و پارەیان لێوەرئەگرن و بەرەڵایان ئەکەن، هەروەها ئێوە لەسەر ئەو کارانە بڕۆن هەتا جەنگاوەری بێباوەڕان قورسایی و چەکەکانی خۆیان دائەنێن و هێزیان نامێنێ و خۆیان ئەدەن بە دەستتانەوە، دوای ئەوەی چەکیان فڕێدا و جەنگ کۆتایی پێهات پێویستە نەکوژرێن و دیل نەکرێن و جەنگ بەرپا نەکرێ.

بۆ زانین: شافیعی ئەفەرموێ: پێشەوای گەورەی موسڵمانان بۆی هەیە چوارشت بکا لەگەڵ گیراوانی بێباوەڕان لە جەنگدا، کوشتنیان، کردنیان بەبەندە. بەرەڵا کردنیان بەبێ بریتی. گۆڕینەوەی دیلەکانیان بە گۆڕینەوەی دیلی موسڵمانان، یا پارەیان لێوەربگیرێ. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەم ئایەتە بە هاتنەخوارەوەی ﴿ اقتلوا المشركين ﴾ کارپێکردنی گۆڕاوە، پێشەوای ئیسلام جگە لە کوشتن و دیل کردن هیچ شتێ تری بۆ نیە. موجاهید ئەفەرموێ: ئەمڕۆ گیروانی بێباوەڕ یا ئەبێ موسڵمان بن یا ئەبێ بکوژرێن.

﴿ ذَلِكَ وَلَوْ يَشَاء اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ﴾ ئەوەی ڕوون کرایەوە لە کوشتنی دوژمن و دیل کردنیان یا بەرەڵاکردنیان بەو جۆرەی باسکران فەرمانی خودایە و، ئەگەر خودا ئارەزۆ بکا تۆڵە لە بێباوەڕان ئەسێنی و بەبێ جەنگ کردنی ئێوە لەگەڵیان بنە بڕیان ئەکا و، بەڵام بۆ ئەوەیە هەندێ لە ئێوە بەهەندێ ترتان تاقی بکاتەوە، هەتا بێباوەڕان هێزیان نەمێنێ و پەرش و بڵاوبن.

﴿ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ کوژراون لە ڕێگەی ئایینی خودادا، دوایی خودا پاداشتی کردەوە چاکەکانی وون ناکا و، بەهەشتی پێ ئەبەخشێ.

﴿ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴾ خودا ڕانومویان ئەکا بۆلای چاکترین کاری جیهانیان و، لە پاشەڕۆژدا بۆلای پلەی بەرز و، هەموو کارەکانیان بە چاك ئەگێڕێ لە هەردوو جیهاندا و، ئەیان خاتە ناو بەهەشت و، جێگەکانی خۆیانیان لە بەهەشتا پێ ئەناسێنی و دەستیان ئەکەوێ بەو جۆرەی قورئان بۆی باسکردوون لە جیهاندا.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ
فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٩﴾ ۞ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ
كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلِلْكَٰفِرِينَ أَمْثَٰلُهَا ﴿١٠﴾
ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿١١﴾
إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن
تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ
وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ
ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ
مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُم ﴿١٤﴾

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ، ئێوە باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە یارمەتی ئایینی خودا بدەن خودا ئێوە سەرئەخا بەسەر بێباوەڕانا و

یارمەتیتان ئەدا و، دڵی ئێوە ڕائەگری لەسەر باوەڕ و چاکەکردن و، پێی ئێو نالەخشێنێ لە جەنگ و لە ئاشتیدا.

یارمەتی دانی خودا بەچەند جۆرێکە: بەسەرکەوتنیان بەسەر بێباوەڕاندا بەهۆی چەکەوە و بەرزبوونەوەی هورەی باوەڕداران. بە سزایەکی ئاسمانی بە وێنەی ڕوچوونی نیشتمانی بێباوەڕان بەلافاوی ناهەموار و بەزاڵبوون بەسەریانا بە گفتوگۆی پەکخەر.

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە، دوایی ڕسوایی و لەناوچوون بۆ ئەوانە و، خودا پوچ ئەکاتەوە پاداشتی کردەوەکانیان، ئەگەر خراپ بن نەگبەتییە بۆیان، ئەگەر چاکبن سودی نیە بۆیان.

﴿ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ ﴾ ئەو ڕسوایی و بێئومێدییە، بەهۆی ئەوەوەبوە کە بەڕاستی شتێ خودا ناردبووی بۆ سەر پێغەمەر ئەوان ناخۆشیان لێی ئەهات، دوایی خودا هەموو کارەکانی ئەوانی پوچ کردەوە، خراپەکانیان ئەبی بەهۆی سزای گران، چاکەکانیان سودیان پێ نابەخشێ.

بۆ زانین: زۆر ئاشکرایە خودا یارمەتی باوەڕداران ئەدا. بەڵام ئەبێ ئێمە بیر لە چۆنیەتی موسڵمانانی ئەمڕۆ بکەینەوە، بەو بۆنەوە ئەمەی خوارەوە باس ئەکەین:

هەندی تاقم ئەیانەوەێ دەوڵەتێکی ئیسلامی بەوێنەی دەوڵەتی سەردەمی پێغەمەر و جێگەدارەکانی پێك بهێنن، ئەوپەڕی ڕێزم بۆیان، ئەو کەسەی خۆی بە موسڵمان دابنێ ئەو بیر و بۆچوونەی لا پیرۆزە کە هەمو یاسای ئیسلام جێبەجێبکرێ. بەڵام ئەم پرسیارە دێتە کایەوە:

ئایا ئەو دەوڵەتە بە بەرزکردنەوەی درۆشم و ڕاگەیاندنی بیروباوەڕی ئیسلام لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆدا و، بە مێزەری گەورەی سەری پیاوانی نەزانی بەناو زانا و بەڕیشی پان و درێژ و دوو بەرەکی پەیداکردن پەیدا ئەبێ؟ ئایا ئەگونجێ ئەو دەوڵەتە دروست بێ لە نزیکەی ملیارێ موسڵمان بڵاوبوونەتەوە بەخۆرهەڵات و خۆرئاواوە، چەندین نەتەوەی جیاوازبن، خاوەنی چەن بیر و باوەڕی ئایینی و ڕامیاری بن، هەندێکیان سەر بە ڕژێمەکانی خۆرئاواوە، هەندێ تریان سەر بە ڕژێمەکانی خۆرهەڵاتبن، ئایا ئەو دەوڵەتە سونی ئەبێ یا شیعە یا هەردوولایان؟ ئایا ئەتوانرێ گیروگرفتی نێوان ڕەگەزەکان جێبەجێ بکرێ؟ وەڵامی ئەو پرسیارانە بەجێ ئەهێڵم بۆ زانایانی نیازپاکی خاوەن ئایین و نیشتمانپەروەر.

﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلِلْكَافِرِينَ أَمْثَالُهَا ﴾ ئایا بێباوەڕان نەڕۆیشتوون بەناو زەوی گەلانی ڕابوردوودا، دوایی تەماشایان بکردایە چۆن بوە کۆتایی و دوارۆژی کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش بت پەرستانی مەکەوە بوون و، خودا ئەوان و منداڵ و دارایی ئەوانەی پێشووی لەناوبردن و، بۆ ئەو کەسانە هەیە باوەڕ بە موحەمەد نایەرن وێنەی ئەو لەناوبردنەی پێشووەکان ئەگەر باوەڕی پێ نەهێنن.

﴿ ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ مَوْلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَأَنَّ الْكَافِرِينَ لَا مَوْلَى لَهُمْ ﴾ ئەوەی باسکرا لە سزدانی دوژمنانی خودا و پاداشتی دۆستانی خودا و یاریدانیان بەهۆی ئەوەوەیە خودا دۆست و یاردەدەری کەسانێکی ئەوتۆیە باوەڕیان هێناوە و، بەڕاستی بێباوەڕان هیچ دۆست و یارمەتیدەریان نیە.

﴿ إِنَّ اللَّهَ يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ الْأَنْعَامُ وَالنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان کردووە خودا ئەیانخاتە ناو چەند بەهەشتێ ئەڕوا بەژێر درەختەکانیا و بەم لاولای کۆشکەکانیا چەندین ڕووباری ئاوی شیرین و، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لە جیهاندا ڕائەبوێرن و بەرخوردارن ئەخۆن هەر بەو جۆرەی چوار پێکان ئەخۆن و، ئاگری دۆزەخ لە پاشەڕۆژدا جێگەی ئەوانە.

﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ الَّتِي أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَاهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴾ وە زۆر لە دانیشتووانی چەند گوندێ، ئەو دانیشتووانەی زۆر بەهێزتربوون لە دانیشتووانی ئەم گوندەی کە تۆیان دەرکردووە، ئێمە ئەوانمان لەناوبردن، دوایی هیچ یارمەتی دەرێ بۆ ئەوان نەبوو ڕزگاریان بکا.

﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَى بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِ كَمَن زُيِّنَ لَهُ سُوءُ عَمَلِهِ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ ﴾ ئایا دوایی کەسێ لە لایەن پەروەردگاری خۆیەوە لەسەر بەڵگەیەکی گەورە وئاشکرابێ لەسەر توانای خودا، وەك کەسێ وایە کردەوەی خراپی خۆی بۆ ڕازانرابێتەوە، وەك بت پەرستی و، دوای ئارەزۆی پووچی خۆی کەوتبێ؟ بێگومان ئەو دوو کەسە وێنەی یەك نین.

مَّثَلُ الْجَنَّةِ
الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاءٍ غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ
يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى
وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ
وَسُقُوا مَاءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ (١٥) وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ
حَتَّىٰ إِذَا خَرَجُوا مِنْ عِندِكَ قَالُوا لِلَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مَاذَا قَالَ آنِفًا
أُولَٰئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ (١٦) وَالَّذِينَ
اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ (١٧) فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا

ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَاۚ فَأَنَّىٰ لَهُمۡ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ
ذِكۡرَىٰهُمۡ ١٨ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ
وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ١٩

﴿ مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ فِيهَا أَنْهَارٌ مِّن مَّاء غَيْرِ آسِنٍ وَأَنْهَارٌ مِن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُ ﴾ وێنەی بەهەشتێ بەڵێنی پێدراوە بدرێ بەو کەسانە لە خودا ترساون و خۆیانیان پاراستووە لە بێفەرمانی خودا، لەناو ئەو بەهەشتەدا هەبێ چەن ڕوباری ئاوێ نە تام و نە بۆن و نە ڕەنگی نەگۆڕابێ و، چەن ڕوبارێ لە شیر تامەکەی نەگۆڕابێ بە درێژی مانەوەیی و نەکرابێ بە ماس و بەدۆ.

﴿ وَأَنْهَارٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّارِبِينَ وَأَنْهَارٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ﴾ وە لە ناویا هەبێ چەن ڕووبارێ لە مەی، تامی لەناو دەمدا خۆشبێ و ئەقڵ و هۆشی ئەو کەسانە تێك نەدا ئەی خواتەوە، چەند ڕووبارێ لە هەنگوینی پاڵفتەکراو، مۆم و شتی تری تێدا نەمابێ.

﴿ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ﴾ وە لەناو ئەو بەهەشتەدایە لە هەموو میوەیە ئارەزۆی بکەن و، بۆیان هەیە لێخۆشبوونێکی زۆر لەگوناهەکانیان لە لایەن پەروەردگاری خۆیانەوە.

﴿ كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ وَسُقُوا مَاء حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَاءهُمْ ﴾ وێنەی کەسێکە بەردەوامبێ لە ناو ئاگردا و، دەرخواردی بدرێ ئاوێکی زۆر گەرم، دوای خواردنەوەی ڕیخۆڵەکانیان پارچە پارچە ئەکەن. بێگومان ئەو دوو کەسانە وێنەی یەك نین. چۆن ئەبێ ئەو کەسانە لە بەهەشتا بن و ئەو شتانەیان دەرخوارد بدرێ، وێنەی ئەو کەسانە بن لەناو ئاگردابن و ئاوی گەرم دەرخواردیان بدرێ و ڕیخۆڵەیان پارچە پارچە ببێ.

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّى إِذَا خَرَجُوا مِنْ عِندِكَ قَالُوا لِلَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ مَاذَا قَالَ آنِفًا ﴾ وە هەندێ هەن لە ئادەمیزادی بێباوەڕ کەسێ گوێ ئەگرێ بۆلای گفتوگۆی تۆ، هەتا کاتێ ئەچنە دەرەوە لەلای تۆ، ئەڵێن بەو کەسانە زانستیان پێبەخشراوە لە زانا خاوەن نامەکانیان: موحەمەد چ شتێکی ووت، ئێستا، ئێمە تێی نەگەیشتین؟

﴿ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قُلُوبِهِمْ وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءهُمْ ﴾ ئەو بێباوەڕانە کەسانێکی ئەوتۆن خودا مۆری داوە بەسەر دڵیانا سود لەو شتە وەرناگرن ئەیبیسن لە تۆ و، دوای ئارەزۆی پوچی خۆیان کەوتوون.

﴿وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْواهُمْ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ ڕانومویان وەرگرتووە، خودا شارەزایان بۆ زۆر ئەکا و، یارمەتیان ئەدا و، بەوانی بەخشیوە خۆپاراستنیان لە بێفەرمانی خودا و، هۆی ترسانی بۆ ئامادەکردوون و، پاداشتیان ئەداتەوە.

﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا فَأَنَّى لَهُمْ إِذَا جَاءَتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ ﴾ دوایی بێباوەڕان کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕ ناهێنن و چاوەڕوانی ئەوە ئەکەن ڕۆژی دوایی کوتوپڕ بێت بۆلایان ئەو کاتە باوەڕ بهێنن، دوایی بەڕاستی نیشانەکانی ڕۆژی دوایی چو بۆلایان کە بریتین لە بەڵگەی بێگومان لەسەر زیندووبوونەوە و هاتنی ڕۆژی دوایی، ئیتر بۆ سستی ئەکەن لە باوەڕهێنان بەڕۆژی دوایی کە لە نامەی خودادا و لەسەر زمانی پێغەمەر بەبەڵگەی جۆراوجۆر باسی هاتنی ڕۆژی دوایی کراوە بەبێ گومان، ئیتر بیانووی بێباوەڕان نەماوەتەوە کە باوەڕ نەهێنن، دوایی ئەوان کە ئێستا باوەڕ نەهێنن لە چ جێگەیەکی ترەوە و، لە چ کاتێ تردا بیر ئەکەنەوە و ئامۆژگاری وەرئەگرن و پەشیمان ئەبنەوە، کاتێ لەناکاودا ڕۆژی پەیدابوو چوو بۆلایان، ئەو کاتە بیرکردنەوە و پەشیمان بوونەوە سود بەوان نابەخشێ، چونکە نیشانەکانی پەیدابوونی ڕۆژی دوایی چووە بۆلایان و باوەڕیان نەهێنا.

﴿ فاعلم أنه لا إلـه إلـا اللـه واسـتغفر لذنبـك وللمؤمنـين والمؤمنـات واللـه يعلـم متقلبكـم ومثواكم﴾ دوایی تۆ بزانە هیچ خودایە نیە شایەنی پەرستنبێ جگەی خودا و، تۆ داوای لیبوردنی گوناهەکانی خۆت و پیاوانی باوەڕدار و ژنانی باوەڕدار بکە لە خودا و، خودا ئەزانێ بەرۆیشتن و هاتنتان لە کاری جیهانتانا و، بەجیگەی خەوتنتان و بەجیگەی دانیشتنتان لە پاشەڕۆژدا.

فەرماندانی خودا بە پیغەمەر بۆ داواکردنی لێخۆشبوون لە گوناهی، بۆ ئەوەیە پەیرەوانی پیغەمەر چاو لەو بکەن و داوای لیبوردن لە خوا بکەن، ئەگینا پیغەمەری خودا دوورە لەوەو گوناه بکات، داوای لیبوردنی گوناه شتیکی زۆر پەسەندە لای خوای مەزن، ئیتر ئەو کەسە گوناهی کردبێ یا نە. بۆ ئەوەیشە پیغەمەر بەردەوامبێ لەسەریادی خودا و، بێ ئاگا نەبێ هەموو کاتێ لە خوای مەزن.

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ ۖ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ
مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ ۙ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ
يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ
(٢٠) طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ ۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ
لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ (٢١) فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟
فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ (٢٢) أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ
فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَـٰرَهُمْ (٢٣)

﴿ ویقول الذین آمنوا لولا نزلت سورة فإذا أنزلت سورة محكمة وذكر فیها القتال ﴾ وە کەسانیکی ئەوتۆ باوەڕیان هیناوە بەنیازی پاکەوە ئەلین: بۆ نایەتە خوارەوە و سورەتێ فەرمانبدا بە جەنگ کردن لەگەڵ بێباوەڕان لەبەر بەرزکردنەوەی ئالآی ئیسلام وپەرەسەندنی ئایینی ئیسلام، دوایی کاتێ هاتە خوارەوە سورەتێ ماناکەی رون کرابیتەوە و هیچ شتیکی لەخۆی نەگرتبێ جگەی پیویست کردنی جەنگ و باسی فەرماندان بە پیویست کردنی جەنگی تیدا کرابێ.

﴿ رأیت الذین في قلوبهم مرض ینظرون إلیك نظر المغشي علیه من الموت فأولی لهم ﴾ تۆ کەسانیکی ئەوتۆ ئەبینی لە ناو دلیاندایە نەخۆشی بێباوەڕی و دووڕوویی ئەڕوانن بۆلای تۆ بەوینەی ڕوانینی کەسێ بیهۆشی هاتبێ بەسەریا لەترسی مردن و خەفەتبار و سەرگەردانبێ. بەلام باوەڕدارانی نیازپاك دلخۆش ئەبن و موژدە ئەدەن بە یەکتری کە پاداشتی خودا وەرئەگرن، دوایی هاوار و دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەیە نەخۆشی لە دلیانایە، یاخوا خودا لەناویان ببا.

﴿ طاعة وقول معروف فإذا عزم الأمر فلو صدقوا الله لكان خیرا لهم ﴾ پەرستێ خودا و گفتوگۆیە پیغەمەر وەری گرتایە لە (دووڕووەکان) چاکترە بۆ ئەوان لە پڕبوونی دلیان لە ڕق و دووڕوویی و لە تەماشاکردنی پیغەمەر بەترسەوە، دوایی کاتێ فەرماندان بە جەنگ کردن پیویست کرا و هاوریکانی پیغەمەر خۆیانیان ئامادەکرد بۆ جەنگ، دووڕووەکان لە دژی ئەواندا ڕاپەڕین و لەگەڵ ژنەکانیانا مانەوە، دوایی ئەگەر ئەو دووڕووانە ڕاستیان بکردایە لە گفتوگۆی خۆیان لەگەڵ خودادا لە دەربرینی ئاواتی جەنگکردندا، ئەو ئاواتەی ئەوان چاکتر ئەبوو بۆ ئەوان.

﴿ فهل عسیتم إن تولیتم أن تفسدوا في الأرض وتقطعوا أرحامكم ﴾ دوایی چاوەڕوان ئەکرێ لە ئیوە ئەگەر واز لە ئایینی ئیسلام و یاساکانی ئیسلام بهینن خراپە بلاو ئەکەنەوە لە زەویدا بەبێفەرمانی خودا و، پەیوەندی نیوان خزمایەتێ خۆتان ئەپچڕینن و، ئەگەڕینەوە بۆ دوژمنایەتیە کۆنەکەی پیش ئیسلامتان.

﴿ أولئك الذین لعنهم الله فأصمهم وأعمی أبصارهم ﴾ ئەو دووڕووانە کەسانیکی ئەوتۆن خودا دووری خستوونەتەوە لە بەزەیی و میهرەبانی خۆی، دوایی خودا ئەوانی گەرکردووە ڕاستی نابیسن و چاویانی کویرکردووە چاکە نابینن.

أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ وَأَمۡلَىٰ

لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ
ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ ۖ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ
﴿٢٦﴾ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ
وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ
وَكَرِهُوا۟ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ أَمْ حَسِبَ
ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾
وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى
لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ
ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾

**﴿ أفلا يتدبرون القرآن أم على قلوب أقفالها ﴾** ئایا دوایی ئەو بێباوەڕ و دووڕووانە بۆ بیرناکەنەوە لە قورئان و مانای ناوەڕۆکەکەی بزانن و لە مەبەستەکەی بگەن، یا دڵیان پێوە دراوە و لێی تێناگەن، بەو وێنەیە کلیل درابێ بەسەر دڵیانا و نەیەڵێ قورئان بڕوا بۆلای دڵیان؟

**﴿ إن الذين ارتدوا على أدبارهم من بعد ما تبين لهم الهدى ﴾** بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ گەڕاونەتەوە بۆلای شتێ لەسەری بوون لە بێباوەڕی و ئایینی باوباپیریان، لە دوای ئەوەی ڕێگەی ڕاست و شارەزای ڕاستی فەرموودەی قورئان بوون و بۆیان ڕوون بوونەوە.

**﴿ الشيطان سول لهم وأملى لهم ﴾** شەیتان تاوانەکانیانی بۆ ڕازاندوونەتەوە و، خودا مۆڵەتی داون پەلەی لە سزادانیان نەکردووە. ئەو دووڕووانە شەیتان بە دووڕووی و گەڕانەوەیان لە ڕاستی فریوی داون و، بەڵێنی درۆی زۆری پێداون ئاواتیان لە جیهاندا بۆ بێتە دی.

**﴿ ذلك بأنهم قالوا للذين كرهوا ما نزل الله سنطيعكم في بعض الأمر والله يعلم إسرارهم ﴾** ئەو گەڕانەوەیان لە ئایینی ئیسلام و ئەو مۆڵەت دانەیان بەهۆی ئەوەوەبوو، دووڕووەکان بەو کەسانەی ئەوتۆیان ئەووت شتێ خودا ڕەوانەی کردبوو بۆ سەر پێغەمەر خۆشیان لێی نەئەهات کە بریتیبوون لە جوەکان: ئێمە پەیڕەوی ئێوە ئەکەین لە کاردا، لەژێرەوە دوژمنایەتی موحەممەد ئەکەین و، یارمەتی ئێوە ئەدەین و، ناچین و بۆ جەنگ کردن لەگەڵیان و، خودا ئەزانێ بەشاراوەیی کاری هەردوولای جوەکان و دووڕووەکان، هیچ شتێ لە خودا پەنهان نیە.

**﴿ فكيف إذا توفتهم الملائكة يضربون وجوههم وأدبارهم ﴾** دوایی ئەوەی ئەو دوو ڕووانە کە ئێستا ئەتوانن جەنگ نەکەن لەگەڵ پێغەمەردا و خۆیان بپارێزن بەسەرهاتیان چۆنبێ کاتی

فریشتەکان گیانیان ئەکیشن، ئەدەن لە روومەتیان و لە پشتیان بە چەکوشی ئاسن، ئایا ئەو کاتە ئەتوانن راکەن لە دەست مردن و لەو لیدانە؟

﴿ ذلك بأنهم اتبعوا ما أسخط الله وكرهوا رضوانه فأحبط أعمالهم ﴾ گرتن و لیدانی فریشتەکان لەو دووروانە بەهۆی ئەوەوەبوو، دوای شتێ کەوتبوون خودای خەشم دار کردبوو، رەزامەندی خوایان پێ ناخۆشبوو، دوژمنی پیغەمەربوون دوایی خودا پاداشتی کردەوەی ئەوانی پوچ کردەوە.

﴿ أم حسب الذين في قلوبهم مرض أن لن يخرج الله أضغانهم ﴾ ئایا کەسانیکی ئەوتۆ نەخۆشی بێباوەری و دووروویی لە دلیانایە گومان ئەبەن کە خودا رق و کینەیان لە شتێ هاتوە خوارەوە بۆ سەر پیغەمەر و موسلمانان دەری ئەخا، بیگومان خودا بۆیان دەرئەخا.

﴿ ولو نشاء لأريناكهم فلعرفتهم بسيماهم ولتعرفنهم في لحن القول والله يعلم أعمالكم ﴾ وە ئەگەر ئیمە ئارەزۆ بکەین بەراستیئیمە ئەو دوورووانە نیشانی تۆ ئەدەین و، نیشانەیە بۆ تۆ دائەنیین، دوایی بەهۆی ئەو نیشانەوە ئەوان بناسی و، بەراستی ئەوان لە ناوەرۆکی گفتوگۆی ئەوان و جۆری گفتوگۆ و بیانوهینانەوەیان تۆ ئەوان ئەناسی، خودا بە کردەوەکان ئیوە ئەزانێ، پاداشتی ئیوە ئەداتەوە بە گویرەی کردەوەکانتان چاکبن یا خراپ.

﴿ ولنبلونكم حتى نعلم المجاهدين منكم والصابرين ونبلو أخباركم ﴾ وە بە راستی ئیمە ئیوە تاقی ئەکەینەوە بە هۆی فەرماندانمان بە جەنگ لەگەڵ بێباوەران بە جەنگ، هەتا ئیمە جەنگاوەرانی ئیوە و ئەو کەسانەی ئارام ئەگرن لەسەر ئازاری جەنگ بیانزانین و، ئیمە ئاگاداری نهینی و هەوالی ئیوەین. خوای مەزن پیویستی بە تاقی کردنەوە نیە هەموو شتێ ئەزانێ کە لەمەودوا بکرێ، بەلام فەرمان ئەدا بە جەنگ کردن و جگەی جەنگ، هەتا پیاوچاك و خراپەکاران بناسرین لای ئادەمیزاد و بە گویرەی گویرەی کردەوەکانیان پاداشتیان بداتەوە.

إِنَّ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّوا۟ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ
لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٣٢﴾
۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓا۟
أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا۟
وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ
وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا
ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ

وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ
تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ
لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ
فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن
تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾

﴿ إن الذين كفروا وصدوا عن سبيل الله وشاقوا الرسول من بعد ما تبين لهم الهدى ﴾ بەراستی کەسانیکی ئەوتۆ باوەریان نەهیناوە و، ریگە لە ئادەمیزاد ئەگرن و ئەیانگیرنەوە و، نایەلن بینە ناو ریگەی ئایینی خودا و، دژایەتی پیغەمەر ئەکەن، لە دوای ئەوەی بۆیان روون بوەتەوە و رانومایی و پیغەمەرایەتی موحەمەد. کەچی بەخۆیان و بە دارایی و پروپاگەندەی درۆ نایەلن ئادەمیزاد باوەر بە موحەمەد بهینن.

﴿ لن يضروا الله شيئا وسيحبط أعمالهم ﴾ ئەوانە ناتوانن زیان لە خودا بدەن، هەر زیان لە خۆیان ئەدەن و، خودا پاداشتی کردەوەکانیان پوچ ئەکاتەوە.

﴿ يا أيها الذين آمنوا أطيعوا الله وأطيعوا الرسول ولا تبطلوا أعمالكم ﴾ ئەی کەسانیکی ئەوتۆ باوەرتان هیناوە، ئیوە بەردەوامبن لەسەر پەرستنی خودا و، ئیوە پەیرەوی فەرموودەکانی فروستادەی خودا بکەن و، ئیوە پاداشتی کردەوە چاکەکانی خۆتان پوچ مەکەنەوە، بەهۆی بیفەرمانی خودا و پیغەمەری خودا.

﴿ إن الذين كفروا وصدوا عن سبيل الله ثم ماتوا وهم كفار فلن يغفر الله لهم ﴾ بەراستی کەسانیکی ئەوتۆ باوەریان نەهیناوە و، ئادەمیزاد ئەگەرینیتەوە لەوەی بچنە ناو ریگەی ئایینی خودا و، لە پاشان ئەو کەسانە ئەمرن و، ئەوان بیباوەربوون، دوایی خودا لەو کەسانە خۆشنابی.

﴿ فلا تهنوا وتدعوا إلى السلم وأنتم الأعلون والله معكم ولن يتركم أعمالكم ﴾ دوایی ئیوە باوەردار ئیوە بەرانبەر بە دوژمن لاواز مەبن لە کاتی جەنگدا و، داوا ئاشتەواییان لیمەکەن و، ئیوە سەرکەوتوو ئەبن و زاڵ ئەبن بەسەریانا و، خودا لەگەل ئیوەیەو یارمەتیتان ئەدا و، کەم ناکاتەوە هیچ شتی لە پاداشتی کردەوەکانتان و، هیچ شتیکی ئیوە بەفیرۆ ناچی. کەواتە ئیوە لە بیباوەران مەترسن.

﴿ إنما الحياة الدنيا لعب ولهو وإن تؤمنوا وتتقوا يؤتكم أجوركم ولا يسألكم أموالكم ﴾ بەراستی ژیانی جیهان گالتەو خۆ خەریك کردن بیسوودە بەزوی نامینی و، ئەگەر ئیوە باوەر

بهینن و لە خودا بترسن و خۆتان لە بێفەرمانی خودا بپاریزن، خودا پاداشتی باوەر و لە خودا ترسانەکەتان بێئەبەخشێ و، داوای بەخشینی هەموو داراییەکانتان یا ئەندازەیە تووشی زیان بین ناکا بیبەخشن بە هەژاران و، ئەندازەیەکی دیاریکراوی بۆ داناون بیبەخشن بە هەژاران یا بۆ شتێ تر.

﴿ إن يسألكموها فيحفكم تبخلوا ويخرج أضغانكم ﴾ و ئەگەر خودا داوای بەخشینی هەموو داراییەکانتان لێبکات، دوایی ئیوە ماندوو ئەکا و خۆتانتان پێناگیرێ و، رق و کینەی ئیوە بەرانبەر بە پیغەمەر و ئایینی ئیسلام ئاشکرا ئەکا. بەلام خودای مەزن سودی ئیوەی ئەوێ ئەندازەیەکتان لێداوا ئەکات لاتان گران نەبێ و لاتان ئاسانبێ.

﴿ هاأنتم هؤلاء تدعون لتـنفقوا في سبيل الله فمنكم من يبخل ومن يبخل ﴾ ئاگاداربن ئیوە ئەو کەسانەن داوا لە ئیوە ئەکرێ دارایی خۆتان ببەخشن لە ریگەی ئایینی خودادا لە بۆ جەنگ و لە زەکاتا، دوایی هەندێ لە ئیوە دارایی خۆی نابەخشێ و بێفەرمانی خودا ئەکا و چرۆك ئەبێ.

﴿ فإنما يبخل عن نفسه والله الغني وأنتم الفقراء ﴾ وە هەرکەسێ رژدی بکا و دارایی خۆی نەبەخشێ لە ریگەی ئایینی خوادا، دوایی بەراستی رژدی کردووە بۆ خۆیەتی و بێبەش ئەبی لە پاداشتی خودا، خودا پیویستی بە هیچ شتی نیە و، ئیوە هەژارن و پیویستیتان بە میهرەبانی خودا هەیە، فەرمانی ئەو بۆ سوودی ئیوەیە.

﴿ وإن تتولوا يستبدل قوما غيركم ثم لا يكونوا أمثالكم ﴾ وە ئەگەر ئیوەی عەرەب واز لە پەرستنی خودا و پەیرەوی پیغەمەر و بەخشینی دارایی بهینن و خزمەتی ئایین نەکەن، خودا ئیوە ئەگۆری بەتاقمێ تری جگەی ئیوە چاکە و فەرمانی خودایان خۆشتر ئەوێ لە ئیوە و، لە پاشانا وینەی ئیوە نابن لە رژدی و خزمەتی ئایینی خودادا.

بۆ زانین: ئەو تاقمەی تر هەر نەتەوەیە بن گرنگ نیە، زانایان بیریان جیاوازە: هەندێ لە زانایان ئەلین: ئەو تاقمە بریتین لە عەرەبەکانی یەمەن، هەندێ تر لایان وایە فارسەکانی خزمی سەلمانن. زۆربەی زۆری زانایان ئەلین: ئەو تاقمە بریتین لە کوردەکان، بە بیروبۆچوونی من زۆر نزیکە کوردەکانبن؛ چونکە پالەوانانی کورد بە سەرۆکایەتی سەلاحەدینی ئەیوبی چاکترین بەلگەن لەسەر ئەو مەبەستە.هەموو شتیکیش هەر خودا ئەیزانێ.

# ﴿ سورەتی ئەلفەتح ﴾

لە ڕێگەدا پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە حودەیبیەوە ئەگەڕایەوە بۆ مەدینەئەو سورەتە هاتە خوارەوە، ژمارەی ئایەتەکانی (٢٩) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴿١﴾ لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ
وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٢﴾
وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ
الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ
وَالْأَرْضِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٤﴾ لِّيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ
جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ
سَيِّئَاتِهِمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٥﴾

بەر لەوەی دەست بکەین بە ماناکردنی ئایەتەکان. باسی ڕووداوێکی مێژوویی ئەکەین، پێی ئەوتری ، ئاشتەوای حودەیبیە، (حودەیبیە) ناوی گوندێکە چواردە کیلۆمەتر و نیو لە مەکەوە دوورە، ناوی نراوە بەناوی بیرێکەوە پێی ئەوترا (حودەیبیە).

بە کورتی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە ساڵی (٦)ی کۆچی‌دا کەوتە ڕێ لەگەڵ (١٥٠٠) کەس لە هاوڕێکانی بۆ ئەوەی عەمرە بکەن، هوشتریان بەدیاری بردبوو بۆ ئەوەی لە مەکە سەریان ببڕن، قورەیشی‌یەکان بە هاتنی پێغەمەریان زانی، خۆیانیان ئامادەکرد، بەهەموو توانای خۆیانەوە نەیەڵن پێغەمەر بچێتە ناو مەکە، بۆ ئەو مەبەستە پێغەمەر ڕێگەی گۆڕی هەتا گەیشتە حودەیبیە. پێغەمەر ڕێکەوتن و ئاشتەوایی لاپەسەند بو، بۆیە کەوتە گفتوگۆ لەگەڵ قورەیشی‌یەکان بە دوور و درێژی. پێغەمەر یەکەمین جار (خەراشی) کوڕی ئومەیەی نار دبۆلای قورەیشی‌یەکان لە مەکە، بەوانی ڕابگەیەنێ کە بۆ جەنگ نەهاتوون، بەبێ ئەنجام هاتەوە بۆ خزمەت پێغەمەر، وەك لەمەودوا باسی ئەکرێ، دواجار عوسمانی کوڕی عەفانی نارد بۆلایان، عوسمانیان گرت، هەواڵ بڵاوبوویەوە عوسمانیان کوشتووە، ڕۆیشتنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆ عەمرە کۆتایی پێ هات بە پەیمانی

(بیعة الرضوان) کە لەمەودوا بە درێژی باسی (بیعة الرضوان) ئەکرێ، ئەو پەیمانە بوو بەهۆی بەستنی پەیمانی حودەیبیە لە نێوان پێغەمەر و قورەیشی‌یەکاندا، ئەو پەیمانەی حودەیبیە لە نێوان پێغەمەر و قورەیشی‌یەکاندا، ئەو پەیمانەی حودەیبیە ئەم بەندانەی تێدا نووسرا و مۆرکرا: (١) هەموو هۆزەکان سەربەستن، ئەگەر ویستیان مۆسڵمان بن قەدەغە نەکرێن (٢) چون بۆ زیارەتی کەعبە دوابخرێ بۆ ساڵی داهاتوو، پێغەمەر بەو پەیمانە ڕازی بوو، هاوڕێکانی پێغەمەریش ڕازی بوون، هەرچەندە هەندێکیان ئەو پەیمانەیان پێ خۆش نەبو. لە باسەکانی دواییدا ئەو مەبەستانە دووبارە ئەکرێنەوە.

بەڕاستی ئەو پەیمانە کارێکی ڕامیاری سازاند، کە یەکەم جار قورەیشی‌یەکان بڕیار بە ڕابەرایەتی پێغەمەر دەربڕن و بزانرێ کە ئیسلام خاوەنی هێزە، ئاسایش دوای ئەو پەیمانە بڵاوبوویەوە و ئایینی ئیسلام لە نیو دورگەی عەرەبدا پەرەی سەند. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ژمارەی ئەو کەسانە لەگەڵ پێغەمەردا بوون (١٤٠٠) کەس بوون. لە پاش مۆرکردنی ئەو پەیمانە پێغەمەر فەرمانی‌دا بەسەربڕینی دیاری‌یەکان و تاشینی سەریان یا کورت کردنەوەی مووەکانیان، بڕیاریشی‌دا بگەڕێتەوە بۆ مەدینە.

بۆ ڕوونکردنەوی ئەو ڕووداوانە خوای مەزن ئەو سورەتەی ناردە خوارەوە بۆ سەر پێغەمەر و فەرمووی:

﴿ إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا ﴾ بەڕاستی ئێمە یارمەتی تۆماندا بە یارمەتی‌یەکی زۆر ئاشکرا، بەهۆی مۆرکردنی ئاشتەوایی پەیمانی حودەیبیەوە، بەسەرکەوتنت بەسەر ڕۆم و فارس و جگەی ئەوان.

﴿ لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ ﴾ ئێمە یارمەتی تۆماندا لەبەر ئەوەی خودا لە هەموو شتێ خۆشبێ لەو شتانەی دروستبێ سزای لەسەر بدرێ، لەو شتانەی لەمەوبەر ڕۆیشتوون و لەمەودوا لە تۆ پەیدا ئەبن.

پرسیار: پێغەمەر چ کاتێ گوناهی کردووە و ئەیکا لەمەوپاش و، پێغەمەران پارێزراون لەوەی گوناه بکەن، دوایی مەبەست لەو لێخۆشبوونەی خودا چ شتێکە؟

وەڵام: مەبەست لە لێخۆشبوون و ڕێزگرتن لە پێغەمەر و لێبوردنێکی بەربڵاوە، ئەگینا پێغەمەران دوورن لەوەی گوناهی گەورە و بچووك بکەن، لەوانەیە مەبەست لە گوناه لەبیرچوونی یادی خودا و هەڵەیە لە پێغەمەرەوە پەیدا ببێ.

﴿ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾ وە بۆ ئەوەیش خودا چاکەی خۆی لە یارمەتی‌دان و لێخۆشبوون بە تەواوی بیدا بەسەر تۆدا و، سەربکەوی بەسەر دوژمنانی خودا و دوژمنانی خۆتا و، پلەوپایەی تۆ بەرز بکاتەو لە هەردوو جیهاندا و، ڕێگەی ڕاستی یاسای خوایی کە سودی هەموو ئادەمیزادی تێدایە شارەزای تۆی لە هەمو کات و جێگەیەکا تێدایە.

﴿ وَيَنصُرَكَ اللَّهُ نَصْرًا عَزِيزًا ﴾ وە لەبەر ئەوەیش خودا یارمەتی تۆ بدا بە یارمەتیدانێکی زۆر گەورە و سەرکەوتوو، یاسای ئیسلام بە ئاشتی و بە خۆشی بچەسپێ، نەك بە جەنگ و ئاژاوە و چەوسانەوە.

﴿ هُوَ الَّذِي أَنزَلَ السَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ الْمُؤْمِنِينَ لِيَزْدَادُوا إِيمَانًا مَّعَ إِيمَانِهِمْ ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە ئارام گرتن لەسەر ئازار وەستان و لانەچوونی لەسەر ئایین ناردووەتە خوارەوە بۆ ناودڵی باوەڕداران، بۆ ئەوەی ئەو باوەڕەی ناودڵیان زۆرتربێ لەگەڵ باوەڕهێنانیان بە خودا و بە پێغەمەر، جێگە بگرێ لە دڵیاندا.

﴿ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾ وە بۆ خودایە سوپای ئاسمانەکان و زەوی و فریشتە و ئادەمیزاد و جنۆکە و، هەموویان لە ژێر دەستی ئەودان، کەواتە ئێوە بۆ یاریدانی ئایینی خودا خۆتان ماندوو بکەن، خودا ئەتوانێ بەبێ جەنگ بێباوەڕان بنەبڕبکا. بەڵام بەندەکانی خۆی تاقی ئەکاتەوە هەتا بۆ دانیشتووان دەربکەوێ چ کەسێ باوەڕئەهێنێ، خودا بە چاکەی بەندەکانی خۆی و بە ئامادەبوونیان لەسەر پەرستن ئەزانێ، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿ لِيُدْخِلَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ﴾ خودا ئارام و لەسەرخۆیی و خستە ناو دڵی باوەڕداران لەبەر ئەوەی خودا پیاوانی باوەڕدار و ژنانی باوەڕدار بخاتە ناو چەندین بەهەشت ئەڕوا بەژێر درەختەکانیا و بەم لاو لای کۆشکەکانیا چەندین ڕووباری ئاوی شیرین، بەردەوامن لەناو ئەو بەهەشتانەدا هەتا هەتایە.

﴿ وَيُكَفِّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَكَانَ ذَلِكَ عِندَ اللَّهِ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ وە بۆ ئەوەیش خودا خراپەکانیان داپۆشێ و پاکیان بکاتەوە لە هەموو خراپەیە و، چونیان بۆ بەهەشت و داپۆشینی گوناهەکانیان ڕزگاربوونێکی گەورەیە لە لای خودا و خراپەی تری بەدوادا نایە.

وَيُعَذِّبَ
ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْمُشْرِكِينَ وَٱلْمُشْرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ
بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ
وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ
شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٨﴾ لِّتُؤْمِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ
وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٩﴾

﴿ وَيُعَذِّبَ الْمُنَافِقِينَ وَالْمُنَافِقَاتِ وَالْمُشْرِكِينَ وَالْمُشْرِكَاتِ الظَّانِّينَ بِاللَّهِ ظَنَّ السَّوْءِ ﴾ و بۆ ئەوەیش خودا سزای پیاوانی دوو ڕوو و ژنانی دووڕوو، پیاوانی بت پەرست و ژنانی بت پەرست بدا، گومان ئەبەنە خودا بە گومانێکی خراپ کە خودا مردووان زیندوو ناکاتەوە و، یارمەتی پێغەمەری خۆی نادا. خۆی و هاوڕێکانی ناچنەوە بۆ مەدینە.

﴿ عَلَيْهِمْ دَائِرَةُ السَّوْءِ وَغَضِبَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلَعَنَهُمْ وَأَعَدَّ لَهُمْ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴾ لەسەر ئەو گومانبەرانەیە شتێکی خراپ ئەو لاولایان لێئەگرێ و، خەشم گرتنی خودا لەسەریانە و، دوریان ئەخاتەوە لەبەزەیی و میهرەبانی خۆی و، دۆزەخی بۆ ئەوان ئامادەکردووە، دۆزەخ خراپ جێگەیە بۆ گەڕانەوەی ئەو گومانبەرانە.

﴿ وَلِلَّهِ جُنُودُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ وە بۆ خودایە سوپای ئاسمانەکان و زەوی لە فریشتە و ئادەمیزاد و جنۆکە، خودا زۆر بەدەسەلاتە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، ئیتر ئەو کەسانەی ئەو گومانە خراپە ئەبەن چۆن بۆیان ئەچێتە سەر هەڕەشە لە پێغەمەر بکەن بە فارس و ڕۆم، یا پێغەمەر ناگەڕێنەوە بۆ مەدینە و لەناو ئەبرێن.

﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَاكَ شَاهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴾ بەڕاستی ئێمە تۆمان کردووە شایەتی بدەی لەسەر نەتەوەکەی خۆت، موژدە بدەی بە ئادەمیزاد بە بەهەشت، بیان ترسێنی لە سزای پاشەڕۆژ.

﴿ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُ وَتُسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾ لەبەر ئەوەی ئێوە باوەڕ بە خودا و بە فروستادەی خوا بهێنن و، یارمەتی پەرەپێدانی ئایینی خودا بدەن و، فەرمانەکانی خودا بە گەورە دابنێن و، پاکی بۆ خودا دابنێن و دوری بخەنەوە لە کاری ناشایستە و، نوێژ بکەن بۆ خودا بەیانیان و ئێواران.

بۆ زانین: وەك لەمەوبەر باسمان کرد پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە ساڵی (٦)ی کۆچیدا ڕۆیشت بۆ مەکە بە نیازی ئەوە زیارەتی خانەی خودا بکا، بیری لە جەنگ نەکردبووەوە، کاتێ گەیشتە حودەیبیە، قورەیشییەکان کە بە هاتنی پێغەمەریان زانی، سوپای خۆیانیان کۆکردەوە، ڕێگەیان لێگرتن و نەیان هێشت بچنە مەکە، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ خەڕاشی کوڕی ئومەیەی خوزاعی نارد بۆلای قورەیشییەکان بەسواری هەشتری پێغەمەر کە ناوی (سەعلەبە) بو، بۆ ئەوەی بە گەورە پیاوانی قورەیش ڕابگەیەنێ ئێمە بۆ زیارەتی خانەی خودا هاتووین، نیازی جەنگمان نیە، کەچی زۆر بە نامەردانە هوشترەکەی پێغەمەریان سەربڕی و ویستیان خەڕاشیش بکوژن. بەڵام (أحابيش) کە تاقمێ بوون سەر بە هیچ هۆزێکی عەرەب نەبوون نەیان هێشت بیکوژن، بەرەڵایان کرد و، چویەوە بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەسەرهاتی خۆی گێڕاوە بۆ پێغەمەر ، دوایی جارێ تر پێغەمەر عوسمانی کوڕی عەفانی نارد بۆلای ئەبوسوفیان و گەورەپیاوانی قورەیش هەواڵیان بداتێ کە بۆ جەنگ نەهاتووین، نیازی زیارەتی خانەی خودامان هەیە، عوسمان ڕۆیشت و مەبەستەکەی پێیان ڕاگەیاندن، کەچی عوسمانیان لای خۆیان بەند کرد، هەواڵ بڵاوبوویەوە کە عوسمان کوژراوە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: من ناڕۆم هەتا تۆڵە لە بت پەرستان نەکەمەوە و،

کارەکە یەك لایی نەکەمەوە، بەو بۆنەوە بانگی هاوڕێکانی بۆلای (البیعه) یانێ سەرسپاردن بۆ پێغەمەر و بە ئایینی ئیسلام کرد. پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لەژێر درەختێکا دانیشت، هاوڕێکانی پێغەمەر هەموویان چونە خزمەت پێغەمەر دەستیان نایە ناودەستی پێغەمەر و، بەیعەتیان کرد بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، ئەو بەیعەتە ناوبرا بە (بیعة الرضوان) یانێ پەیمانێ ڕەزامەندی خودا و پێغەمەری خودای تێدایە، وەك لەمەودوا باس ئەکرێ. قورەیشی یەکان کە بەو بەیعەتەیان زانی سوهەیلی کوڕی عەمریان کرد بە سەرکردەی کۆمەڵێ لە قورەیشی یەکان ناردیان بۆلای پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ هەتا بکەونە ڕاوبۆچوون لەگەڵ پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ سوهەیل ووتی: ئەی موحەمەد ئەو هاوڕێیانەی تۆ لای ئێمە بەند کراون، بە گوێرەی بیر و بۆچوونی ئێمە نەبووە. بەڵکو هەندێ لە نەزانانی ئێمە ئەو کارەیان کردووە، کەواتە ئەو (٥٠) کەسەی لە شەودا بەردیان ئاراستەی ئێوەیان کردووە، لای یێوە گیراون بەڕەڵایان بکەن. پێغەمەر فەرمووی: هەتا هاوڕێکانی من بەڕەڵا نەکەن من ئەوانە بەڕەڵا ناکەم، سوهەیل ووتی: ڕاست ئەکەی، لە پاشانا ناردی بۆلای قورەیشی یەکان، عوسمان و (١٠) کەسی تر کە بەندکرابوون لایان بەرەڵایان کردن، پێغەمەریش ئەوکەسانەی ئەوانی بەڕەڵاکرد.

نوێنەرانی قورەیش کەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، چاویان بە هاوڕێکانی پێغەمەر کەوت، خۆیانیان ئەسپارد بە ئایینی ئیسلام و، سەری خۆیانیان ئەسپارد بە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بە جۆرێ کە پێغەمەر دەستنوێژی بشۆردایە نەیان ئەهێشت دڵۆپێ ئاوی برژێتە سەر زەوی و ئەیان قۆزتەوە، لەسەر تەنها مویەکی پێغەمەر خۆیانیان ئەدا بە کوشت هەتا ئەو مووە هەڵئەگرن، بۆ پیرۆزی هەڵیان ئەگرت، بەو بۆنەوە قورەیشی یەکان سەریان شۆڕکرد بۆ ئاشتی و ڕێکەوتن، ڕێکەوتنیان مۆرکرد لە نێوان هەردوولادا بەم جۆرەی دووایی:

هەرچەندە هەندێ لە هاوڕێکانی پێغەمەر ئەو ڕێکەوتنەیان پێ خۆش نەبوو. بەڵام پەیرەوی پێغەمەریان کرد: بڕیاردرا ئەم ساڵ موسڵمانان نەچنە مەکە، دوایی بێن بۆ عەمرە و سێ ڕۆژە لە مەکە بمێننەوە. جگە لە شمشێر چەکی تریان پێ نەبێ و لە کێلان دەری نەیەرن، بەو مەرجەیش هەرکەسێ لە هۆزەکانی عەرەب موسڵمان بێن ڕێگەیان لێنەگیرێ، کاتێ لە لایەن هەردوولاوە پەیمانەکە مۆرکرا، پێغەمەر فەرمانیدا عەمرەکەیان بشکێنن و سەریان بتاشن یا مووی سەریان کورت بکەنەوە و، دیاریەکانیان سەربڕن. دوایی سێ ڕۆژ لە حودەیبیە مانەوە، دوایی چوونەوە بۆ مەدینە.

لە ساڵی دواییدا پێغەمەر هاوڕێکانی بەرەو مەکە ڕوویان کرد، چوونە مەکە بۆ بەسەرگرتنەوەی عەمرەی ساڵی پێشوو، ئەیان ووت: خودای تر نیە جگەی خودا بە تەنها، موحەمەد نێرراوی خودایە، خودا یارمەتی بەندەی خۆی ئەدا و سوپاکەی سەرئەخا، تاقمی بێباوەڕان سەریان شۆڕ ئەکرێ، سێ ڕۆژ لە مەکە مانەوە عەمرەیان کرد و دیاری یەکانیان سەربڕی، ئەم عەمرەیە بەسەرگرتنەوەی عەمرەی ساڵی پێشووە، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو ڕووداوانە، خودا ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە بۆ سەر پێغەمەر و فەرمووی:

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ
فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيْهُ
ٱللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾ سَيَقُولُ لَكَ ٱلْمُخَلَّفُونَ
مِنَ ٱلْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَآ أَمْوَٰلُنَا وَأَهْلُونَا فَٱسْتَغْفِرْ لَنَا يَقُولُونَ
بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِى قُلُوبِهِمْ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ
شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ نَفْعًۢا بَلْ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ
خَبِيرًۢا ﴿١١﴾ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰٓ
أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِى قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُمْ ظَنَّ ٱلسَّوْءِ
وَكُنتُمْ قَوْمًۢا بُورًا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمْ يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ
أَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ سَعِيرًا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ
يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا
رَّحِيمًا ﴿١٤﴾

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ بەیعەتیان بەتۆ کردووە پەیمانیان بە تۆ ئەدەن بە ڕاستی ئەو کەسانە پەیمان بە خودا ئەدەن و بەیعەت بەو ئەکەن، توانا و چاکە و یاریدانی خودا لە ژوری دەستی ئەوانەوەیە، پاداشتیان زۆرترە لە کرداریان، چاکەی خودا بالآترە لە پەرستنیان.

﴿ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾ دوایی هەرکەسێ ئەو پەیمانە بشکێنێ و ئەو بەیعەتەی جێبەجێ نەکردبێ، دوایی بەڕاستی زیانی ئەو شکاندنە هەر لەسەر خۆیەتی و، هەرکەسێ دەستبگری بەشتێ پێویستی کردووە لەسەری خۆی جێبەجێ بکات شتێ پەیمانی داوە بە خودا لەسەری بەتەواوی بەجێ بهێنێ لەو بەیعەتەدا، دوایی خودا ئەبەخشێ بەو کەسە پاداشتێکی زۆر گەورە.

بۆ زانین: ئەو کەسانەی لە خزمەت پێغەمەردابوون هەموویان بەیعەتیان دا بە پێغەمەر جگەی (ئەلجەدی) دووڕوو، خۆی شاردبوو لە ژێر هوشترەکەیا و بەیعەتی بە پێغەمەر نەکرد.

کاتێ پێغەمەری خودا ویستی بڕوا بۆ مەکە لە ساڵی حودەیبییەدا، بۆ عەمرە کردن داوای لە عەرەبەکانی دەرەوەی مەدینە و، دانیشتووانی لادێکانی کرد لەگەڵیا بڕۆن بۆ بەجێهێنا عـەمرە، هەندێ لەو عەرەبانە لە خزمەت پێغەمەردا نەڕۆیشتن خودا لەو بارەیەوە ئەفەرموێ:

﴿ سَيَقُولُ لَكَ الْمُخَلَّفُونَ مِنَ الْأَعْرَابِ شَغَلَتْنَا أَمْوَالُنَا وَأَهْلُونَا فَاسْتَغْفِرْ لَنَـا ﴾ ئـەو عەرەبانـەی دواکەوتوون لـەگەڵ تۆ نەچوونەتە درەوە، بەوێنەی هۆزەکانی ئەسلەم و جوهەینە و موغبـەرە و غەفار ئەڵێن ئێمە بۆیە نەهاتینە دەرەوە: دارایی و خێزانەکانمان ئێمەیان خـەریك کـرد و، نـەیان هێشت لـەگەڵ تۆ بێنە دەرەوە، لـەبەر بەخێوکردن و چـاودێری‌کردنی دارایـی و خێزانـەکانمان، دوای تۆ داوای لێبوردنمان بۆ بکە لە خودا سزامان نەدا.

﴿ يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ ﴾ ئەو عەرەب و دووروووانە شـتێ ئـەڵێن بـە زمـانی خۆیان، لە ناو دڵیانا ئەو شتە نەبوو، ئەو شتە ئەکەن بە بیانوو بۆخۆیان.

﴿ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ لَكُم مِّنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ بِكُمْ ضَرًّا أَوْ أَرَادَ بِكُـمْ نَفْعًـا بَـلْ كَـانَ اللَّـهُ بِمَـا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴾ تۆ بڵێ: دوایی چ کەسێکە توانای ئەوەی هەبێ، بگێڕێتەوە لــە ویسـتی خـودا شتێ، ئەگەر بیەوێ زیانێ توشی ئێوە بکا یا بیەوێ سودێ بە ئێوە ببەخشێ. بیگومان هیچ کەسێ ئەو توانایە نیە، داوای لێخۆشبوونی تۆ بێ‌سوودە بۆ ئەوان. بەڕاستی خودا ئـەزانێ بەشتێ ئێـوە ئەیکەن و ئاگاداری هەمو شتێکە.

﴿ بَلْ ظَنَنتُمْ أَن لَّن يَنقَلِبَ الرَّسُولُ وَالْمُؤْمِنُونَ إِلَىٰ أَهْلِيهِمْ أَبَدًا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمْ وَظَنَنتُـمْ ظَنَّ السَّوْءِ وَكُنتُمْ قَوْمًا بُورًا ﴾ بەڵکو ئێوە بەڕاستی گومانتـان وابـو کـە پێغەمـەر و بـاوەڕداران ناگەڕێنەوە هەرگیز بۆلای خێزانەکانی خۆیان لە مەدینە و، لــە حودەیبییـە ناگەڕێنـەوە و لـەناو ئەچن، ئەو گومانە لـەناو دڵی ئێوەدا ڕازێنرابۆوە لە لایەن شەیتانەوە، ئێـوە گومـانێکی خراپتـان بردووە کە ئایینی ئیسلام بەردەوام نابێ خودا یارمەتی پێغەمەر و باوەڕداران نادا و، لە چوونیـان بۆ حودەیبییە ناگەڕێنەوە، ئێوە تاقمێکی خراپن و لـەناو ئەچن، بەڵگەو بیانووتان لێ وەرناگیرێ.

﴿ وَمَن لَّمْ يُؤْمِن بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ فَإِنَّا أَعْتَدْنَا لِلْكَافِرِينَ سَعِيرًا ﴾ وە هەرکەسێ باوەڕ بـە خـودا و بە پێغەمەری خودا نەیەرێ، دوایی بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردووە بۆ بێ‌باوەڕان ئـاگرێکی زۆر گەرم ئەچڕێتە ناوی.

﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ وە بۆ خودایە پاشایەتی و خاوەنی‌یەتی ئاسمانەکان و زەوی و، بەگوێرەی ویسـتی خـۆی هـەڵیان ئەسووڕێنێ، خودا خۆش ئەبێ لە هەر کەسێ ئارەزۆی هەبێ و، سزای هەرکەسێ ئەدا ئـارەزۆی بکا و، خودا لێخۆشبوونی زۆرە بۆ گوناهبـاران، زۆر خـاوەنی بـەزەیی و میهرەبانی‌یـە بـۆ ئـەو کەسانە پەشیمان ئەبنەوە.

سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انطَلَقْتُمْ إِلَىٰ
مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُوا
كَلَامَ اللَّهِ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِن قَبْلُ

فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥﴾
قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ
تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا
وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦﴾ لَّيْسَ
عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ
وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ
وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٧﴾

﴿ سَيَقُولُ الْمُخَلَّفُونَ إِذَا انطَلَقْتُمْ إِلَى مَغَانِمَ لِتَأْخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعْكُمْ يُرِيدُونَ أن يُبَدِّلُوا كَلَامَ اللَّهِ ﴾ ئەو کەسانەی دواکەوتبوون لە چوون بۆ حودەیبییە ئەڵێن هەرکاتێ ئێوەی باوەڕدار ئەچنە دەرەوە بۆلای دەستکەوتەکان بۆ ئەوەی ئێوە وەریان بگرن: ئێوەی باوەڕدار واز لە ئێمە بهێنن لەگەڵ ئێوەدا بێین و بۆلای خەیبەر هەتا ئێمە بەشداربین لەو دەستکەوتانە، ئەو دواکەوتووانە ئەیانەوێ فەرمودەی خودا بگۆڕن لەبەر سوودی خۆیان، چونکە فەرمووبووی بەو کەسانە چوبون بۆ حودەیبیە من پاداشتی ئێو ئەدەمەوە لەمەوپاش بە دەست کەوت و هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو فەرموودەی خودایە ئەوەبوە: کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە حودەیبییە گەڕایەوە لە مەدینەدا مایەوە هەتا ساڵی حەوتەمی کۆچی، لەو ساڵەدا چووە دەرەوە بۆ جەنگی خەیبەر، بە فەرمانی خودا جگە لەو کەسانەی چووبوون بۆ حودەیبییە، پێغەمەر دەستووری دا کەسێ تر نەیە لە گەڵیا بۆ خەیبەر، لەو کاتەدا ئەو کەسانە نەچووبوون بۆ حودەیبییە دڵیان تەکانی خوارد و ووتیان: ئێمەیش لەگەڵتان دێین بۆ خەیبەر، ئەو دووڕووانە ئەمڕۆ ئەڵێن: ئێمەیش لەگەڵ ئێوەین بۆ جەنگی خەیبەر، لە ساڵی پێشوودا ئەیان ووت ئێمە بۆیە نەچووین بۆ حودەیبیە دارایی و خێزانمان خەریکیان کردین. خوای مەزن ڕوونی نەکردوەتەوە ئەو دەستکەوتانە کامانەن؟ ئایا دەستکەوتی خەیبەر یا جگەی خەیبەریش، زۆربەی زانایان ئەڵێن: دەست کەوتی خەیبەر مەبەستە، بەهەرجۆرێ بێ خودا ئەفەرموێ:

﴿ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَلِكُمْ قَالَ اللَّهُ مِن قَبْلُ ﴾ تۆ بڵێ بەو کەسانەی نەچوون بۆ حودەیبیە: ئێوە مەیەنە دەرەوە لەگەڵ ئێمە بۆلای خەیبەر، هەر بە جۆرە خودا فەرمانی داوە، کاتێ ئێمە لە حودەیبیە گەڕاینەوە بۆ مەدینە کە دەست کەوتی خەیبەر هەر بۆ کەسانێکە چوون بۆ حودەیبییە بۆ جگەی ئەوان نیە.

﴿ فَسَيَقُولُونَ بَلْ تَحْسُدُونَنَا بَلْ كَانُوا لَا يَفْقَهُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ دوایی ئەو دووڕووانە ئەڵێن: بە فەرمانی خودا ئێمە بێبەش نەکراوین لە دەست کەوتی خەیبەر، بەڵکو بەڕاستی ئێوە ئاواتەخوازن دەست کەوتی خەیبەر نەدرێ بە ئێمە، ئەو دووڕووانە کەمێکیان نەبێ لە ڕاستی فەرموودەی خودا ناگەن و، تەماشای شتێ ئەکەن لەوانەوە دەرئەکەوێ لە جیهاندا.

﴿ قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَى قَوْمٍ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ﴾ تۆ بڵێ بەو کەسانە نەچوون بۆلای حودەیبیە لە عەرەبەکان: لەمەودوا بانگی ئەوان ئەکرێ بۆلای جەنگێ تاقمێ خاوەنی هێز و ئازایکی زۆرن و چەکی چاکتریان هەیە، داوای دوو شتیان لێئەکرێ: یا ئەبێ ئەوان جەنگ بکەن لەگەڵ ئەو تاقمەدا یا ئەبێ ئەو تاقمە موسڵمان بن و مل کەچی فەرمودەی خودا و پێغەمەری خودابن.

﴿ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ دوایی ئەگەر ئێوە وولامی ئەو داوایە بدەنەوە و بڕۆن بۆ جەنگی ئەو تاقمە ئازایە خودا پاداشتێکی زۆر چاك ئەبەخشێ بە ئێوە لە هەردووجیهاندا.وە ئەگەر ئێوە واز لە جەنگی ئەو تاقمە بهێنن، وەك لەمەوبەر وازتان لە چوونی حودەیبیە هێنابو، خودا سزایەکی زۆر ئازاردەری ئێوە ئەدا لە ڕۆژی دواییدا.

بۆ زانین: ئەو تاقمەی ئەمانی بۆ بانگ ئەکرێ جەنگ بکەن لەگەڵیان، خوای مەزن ڕوونی نەکردوەتەوە، زانایان بیرو بۆچوونیان جیاوازە: عەرەبەکانی نیوە دورگەی عەرەب بن لە کاتی پێغەمەر و دوای پێغەمەر، وەك جەنگی حونەین یا جەنگی موسەیلەمەی درۆزن، یا فارس و ڕۆم بن لە دوای پێغەمەر جەنگیان لەگەڵ کرا، لە مەبەستەکەی ناگۆڕی، زانینی هەموو شتێکیش لای خودایە.

﴿ لَيْسَ عَلَى الْأَعْمَى حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ لەسەر کوێر و نەخۆش و شەل هیچ گوناهێ نیە لەسەریان نەچن بۆ جەنگ کردن لەگەل بێباوەڕان بۆ پەرەپێدانی ئایینی ئیسلام. بەڵام جەنگ کردن بۆ بەرگری لە خۆیان پێویستە لەسەریان بە گوێرەی توانای خۆیان و، هەرکەسێ فەرمانبەرداری خودا و پێغەمەری خودابێ لە بۆ هەموو فەرمانێکیان خودا ئەیخاتە ناو چەندین بەهەشت ئەڕوا بە ژێریانا چەندین ڕووباری ئاوی شیرین و، هەرکەسێ واز لە پەرستنی خودا و لە فەرموودەی پێغەمەر بهێنێ، خودا سزایەکی زۆر ئازارداری ئەدا بە مەرجێ لەسەر بێباوەڕی مردبێ.

بۆ ئاگاداری: لەمەوبەر باسی خەڕاشی کوڕی ئومەیەی خوزاعی و عوسمانی کوڕی عەفان کرا کە بە بت پەرستانی قورەیش ڕابگەیەنن پێغەمەر و موسڵمانان بۆ زیارەتی خانەی خودا هاتوون نەك بۆ جەنگ کردن، بەڵام ویستیان خەڕاش بکوژن و عوسمانیان بەندکرد و، هەواڵ

بلاّوبوویەوە کە عوسمان کوژراوە، پێغەمەری خودا لەبەر ئەوەی بت پەرستان بۆیان دەرکەوێ باوەڕداران بە پێشەوایی پێغەمەر ئەتوانن ئایینی پیرۆزی ئیسلام بلاّوبکەنەوە، داوای لە باوەڕداران کرد بەیعەتی پێ بکەن. هەموویان بەیعەتیان بە پێغەمەر کرد، جگەی (ئەلجەدی) کوڕی قەیسی ئەنساری خوای مەزن لەو بارەیەوە ڕەزامەندی خۆی بۆ ئەو کەسانە دەرئەبڕێ بەیعەتیان بە پێغەمەر کرد و ئەفەرموێ:

لَّقَدْ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ
ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ
فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾ وَمَغَانِمَ
كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٩﴾ وَعَدَكُمُ ٱللَّهُ
مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِۦ وَكَفَّ أَيْدِىَ
ٱلنَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ ءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَٰطًا
مُّسْتَقِيمًا ﴿٢٠﴾ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ ٱللَّهُ بِهَا ۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَوْ قَٰتَلَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟
لَوَلَّوُا۟ ٱلْأَدْبَٰرَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٢٢﴾ سُنَّةَ
ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾
وَهُوَ ٱلَّذِى كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِنۢ
بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾

﴿ لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ ﴾ بەڕاستی خودا ڕازیە بوە لە باوەڕداران کاتێ بەیعەتیان بەتۆ کردووە سەری خۆیانیان سپارد بە تۆ لە ژێر درەختی سمرەدا، ئەو بە یعەتە ناو ئەبری بە (بیعة رضوان) یانێ پەیمانێ ڕەزامەندی خوا و پێغەمەری تێدایە. ئەو درەختە لەلای موسڵمانان بە پیرۆز دائەنرا، بۆیە ئەیان ویست بچن بۆلایی و تووشی پیرۆزی بن، زانایان ئەڵێن: خودای مەزن ئەو دروختەی لەوان وونکرد و نەیان ئەزانی کام درەختەیە،

هەندێ تر لە زانایان ئەڵێن: عومەری کوڕی خەتاب ئەو درەختەی بڕی و فەرمانیدا ڕیشوەکەیشی دەربهێنن و جگەکەیشی پڕکردەوە؛ چونکە بۆنی بت پەرستی لێوە ئەهات.

﴿ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾ دوایی خودا زانی بە شتێ لەناو دڵی باوەڕدارانا بوو لە ڕاستی و لە نیازی پاك، دوایی خودا ئارام و خۆڕاگرتنی دا بەسەر دڵی باوەڕدارانا هەتا خۆیان ڕاگرن لە حودەیبییەدا و، خودا پاداشتی دانەوە دوای حودەیبیە بەسەرکەوتنێکی نزیك، ساڵی دوایی چوونەوە بۆ مەکە بۆ بەسەرگرتنەوەی ىعەمرە و، هەر لەو ساڵەدا خەیبەریان داگیرکرد و دەستکەوتی زۆریان بۆ بوو.

﴿ وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ وە خودا ئەبەخشێ بە ئێوە دەستکەوتێکی زۆر ئێوە وەری ئەگرن لە خەیبەر، خودا زۆر بە دەستەڵات و گەورەیە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿ وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا ﴾ وە خودا بەڵێنی دەست کەوتی زۆری داوە بە ئێوە وەری بگرن، ئەوەبوو خودای مەزن باخ و بۆلاخ و زەوی کۆشك و چەندین دەست کەوتی تری زۆری لە خەیبەر بەخشی بە باوەڕداران و، بەڵێنی پێداون کە ئامادەکراوە بۆیان دەست کەوتی زۆرتر بۆ ئێوە لە دارایی و سامانی ڕۆم و فارس و جێگەکانی تر و، شتی زۆر لەم دەستکەوتانە لە بەهەشتا ئێوە هەموویان وەرئەگرن.

﴿ فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِ وَكَفَّ أَيْدِيَ النَّاسِ عَنكُمْ ﴾ دوایی خودا ئاشتەوایی و ڕێکەوتنی حودەیبییەی بەخشی بە ئێوە کەبوو بەهۆی پەرەپێدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و بەرزبوونەوەی پلەی ئێوە، دواتر دەستکەوتەکانی خەیبەری پێ بەخشین و، دەست درێژی دانیشتووانی خەیبەر و، هۆزی ئەسەد و غەتفان و قورەیشییەکانی لە ئێوە قەدەغەکرد و، ئێوە بەبێ ئازار ڕزگارتان بووە.

﴿ وَلِتَكُونَ آيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾ وە بۆ ئەوە ئاشتەوایی حودەیبییە ببێ بەڵگەی بەرزی باوەڕداران لەبەردەم بت پەرستاندا کە خودا لەگەڵ باوەڕدارانە و یارمەتییان ئەدا و، بۆ ئەوەیش خودا ڕانمویی و چاویان زۆرتر بە ڕووناکی باوەڕهێنان گەش بکاتەوە و باشتر بەردەوامبن لەسەر ڕێگەی ڕاستی ئایین. هەرشتێ توشی ئێوە ببی ئەبێتە هۆی سودی هەردوو جیهانتان.

﴿ وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ اللَّهُ بِهَا وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا ﴾ وە خودا بەڵێنی داوە بە ئێوە دەست کەوتی تر و چەندین شاری تر کە ئێوە ئێستا توانای ئەوەتان نیە بیان گرن بیان بەخشێ بە ئێوە، بەڕاستی خودا ئەوانەی ئامادەکردوون پێیانی ببەخشێ بێگومان لەمەوپاش ئێوە وەریان ئەگرن و، خودا دەستەڵاتی هەیە بەسەر هەموو شتێکا توانای هەیە زۆرتر لەوەی ئێوە بیری لێبکەنەوە پێتان ببەخشێ.

کورتە باسێ لەبارەی داگیرکردنی خەیبەر. پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ویستی بچێتە دەرەوە بۆ بەجێهێنانی عەمرە و گەیشتنە حودەیبیە و دواتر گەڕانەوە بۆ مەدینە (١٥٠٠) کەس لە هاوڕێکانی لە خزمەتیا بون دوای ئاشتەوایی حودەیبیە لە مانگی سەفەری ساڵی (٧)ی کۆچی، پێغەمەر ویستی بچێ بۆ داگیرکردنی خەیبەر؛ چونکە بۆی دەرکەوتبوو، بەر لە چوونی بۆ حودەیبیە، جوەکان بە نهێنی هەواڵیان ناردووە بۆلای بت پەرستان، بە هەردوولامان موسڵمانان بنەبڕ ئەکەین، کاتێ پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ چووە دەرەوە، ئەو کەسانەی نەچووبوون بۆ حودەیبیە ویستیان لەگەڵ پێغەمەر بچنە دەرەوە بۆلای خەیبەر، پێغەمەر فەمووی: ئێوە لەگەڵ من مەیەنە دەرەوە، ئەبێ هەر بۆ جەنگ کردن بێن و بە شتان لە دەست کەوتا نابێ، ئەوەبوو پێغەمەر فەرمانی‌دا جاڕ بدرێ ئەو کەسانەی نەچوون بۆلای حودەییە بۆ جەنگ کردن ئەبێ نەیەنە دەرەوە بۆلای خەیبەر و، لە دەستکەوتا بەشیان نادرێ.

خەیبەر شاری جوەکان بووە، دانیشتووانی ئەو شارە لە هەموو جوەکان بەهێزتر بوون، چەك و داراییان زۆرتر بووە، گومانیان وابوو پێغەمەر بیر لە جەنگ کردن ناکاتەوە لەگەڵیان، چونکە قەڵاکانیان سەخت بوون و چەك و کەرەسەی جەنگییان زۆر بووە، بەڵام جووەکان هەستیانبەخۆیان نەکرد هەتا کاتێ پێغەمەر سوپاکەی خۆی لەشەودا بردە بەردەم قەڵاکانیان. کاتێ سەرلەبەیانی چوون بەلای ئیش و کاریانەوە، چاویان بە سوپای پێغەمەر کەوت بەرەودواوە گەڕانەوە بۆلای قەلاکانیان، لەو کاتەدا پێغەمەر فەرمووی:

﴿ الله أكبر ﴾ بەڕاستی ئێمە ئێستا لەبەردەم دەشتی ئەم تاقمە جووانەداین، ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر ترسناکە بۆ ئەو جووانە، موسڵمانان دەستیان کرد بە جەنگ کردن قەڵا لە دوای قەڵاکانیان داگیرکردن.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆ یەکەم جار فەرمانی‌دا بە بەرزکردنەوەی چەند بەیداخێ بەسەرۆکایەتی چەن کەسێ لە هاوڕێکانی‌ز بەر لە جەنگی خەیبەر بەیداخ هەڵکرابوو، جەنگی‌زۆر سەخت لەبەردەم قەڵاکانیان دەستی پێ کرد، ئەم لاولایان لێ‌گیراو، جەنگەکە کۆتایی پێ‌هات بەسەرکەوتنی موسڵمانان، دەستکەوتی زۆر و زەبەندەیان بۆ ڕەخسا، لەگەڵ جوەکاندا ئاشتەوای بەسترا لەسەر ئەوەی خوێنیان پارێزراوبێ و لەسەر زەوی و زاری خۆیان دانیشن، نیوەی بەرهەمی خەیبەر بدەن بە موسڵمانان، پێغەمەر فەرمووی: دانیشن هەتا کاتێ ئارەزۆمان هەبوو، بۆ ئاگاداری زۆرتر پەیداکردن تەماشای نامە مێژوکان بکەن، لەبارەی جەنگی خەیبەرەوە.

﴿ وَلَوْ قَاتَلَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوَلَّوُا الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴾ وە ئەگەر کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێنابوو لە دانیشتووانی مەکە جەنگیان لەگەڵ ئێوە بکردایە و ئاشتەوایی حودەیبیە نەبەسترابایە بەڕاستی ئەشکان و ڕایان ئەکرد. لە پاشانا هیچ دۆستێکیان دەست نەکەوت بیانپارێزێ و هیچ کەسیان دەست نەئەکەوت یارمەتییان بدا لە جووەکانی خەیبەر.

﴿ سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ﴾ ئەو سەرکەوتنەی پێغەمەران و دۆستانی خودا بەسەر دوژمنانی خۆیانا یاسا و دەستوورێکە خودا دایناوە بۆ هەموو پێغەمەران کە بە ڕاستی لەمەوبەر ڕۆیشتوون و بە پێغەمەری ئیسلامیشەوە ئەبێ سەربکەون و، بۆ یاسا و دەستووری خودا تۆ هیچ جۆرە گۆڕانێکت دەست ناکەوێت.

﴿ وَهُوَ الَّذِي كَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ عَنْهُم بِبَطْنِ مَكَّةَ مِن بَعْدِ أَنْ أَظْفَرَكُمْ عَلَيْهِمْ وَكَانَ اللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴾ وە خودا کەسێکی ئەوتۆیە بە میهرەبانی خۆی دەست درێژی بێباوەڕانی مەکە بۆ ئێوە توانا و پەلاماردانی ئێوە بۆ ئەوان قەدەغەی کردن لە ناو مەکەدا لە دوای ئەوەی خودا ئێوەی باوەڕداری سەرخست بەسەر بێباوەڕاندا بەهۆی ئاشتەوایی حودەیبیەوە، خودا ئاگادارە و شتێ ئەبینێ ئێوە بیکەن لە جەنگ کردنتان لەبەر فەرمانی خودا و نێراوی خودا و، گەڕانەوەی دەستی خۆتان لە جەنگ لەبەر ڕێزی خانەی خودا و بێتوانایی دانیشتووانی مەکە.

بۆ زانین: ئاشتەوایی حودەیبیە لە ساڵی (٦)ی کۆچیدا بووە، گرتنی خەیبەر و بەسەرگرتنەوەی عەمرە لە ساڵی (٧)ی کۆچیدا بووە، گرتنی مەکە لە ساڵی (٨)ی کۆچیدا بووە.

هُمُ
ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْهَدْىَ
مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُۥ ۚ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَآءٌ مُّؤْمِنَٰتٌ
لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَـُٔوهُمْ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌۢ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ
لِّيُدْخِلَ ٱللَّهُ فِى رَحْمَتِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ لَوْ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبْنَا ٱلَّذِينَ
كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ
فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ
عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ
وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾

﴿ هُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ ﴾ بت پەرستانی مەکە کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕیان نەهێناوە و، ئێوەیان قەدەغەکرد لەوەی بڕۆن زیارەتی ئەو مزگەوتە ڕێزدارە بکەن و کاروباری عەمرە بەجێبهێنن.

﴿ وَالْهَدْيَ مَعْكُوفًا أَن يَبْلُغَ مَحِلَّهُ ﴾ ئەو هوشترانە کرابوون بە دیاری بۆ خانەی خودا، بەسترابوونەوە، قەدەغەیان کردبوون لەوەی بگەنە جێگەی خۆیان لە مەکە و سەر ببڕێن. ژمارەی ئەو هوشترانە کرابوون بە دیاری (٧٠) هوشتر بوون، کاتێ لە ساڵی (٦)ی کۆچیدا چون بۆ عەمرەکردن و لە حودەیبیە ڕاگیران.

﴿ وَلَوْلَا رِجَالٌ مُّؤْمِنُونَ وَنِسَاء مُّؤْمِنَاتٌ لَّمْ تَعْلَمُوهُمْ أَن تَطَؤُوهُمْ ﴾ وە ئەگەر لە مەکەدا چەن پیاوێکی باوەڕدار و چەن ژنێکی باوەڕدار نەبونایە ئێوە نەتان ئاناسین و جیابوونەوە لە جگەی خۆیان؛ چونکە ئەوان لە ترسی بت پەرستان باوەڕهێنانی خۆیانیان ئاشکرا نەکردبوو، ئێوە ئەتان کوشتن، لەبەر ئەوانە نەبووایە خودا فەرمانی ئەدا بە چوونی ئێوە بۆ مەکە.

﴿ فَتُصِيبَكُم مِّنْهُم مَّعَرَّةٌ بِغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ دووایی ئەگەر ئێوە بچوونایە مەکە و، ئەو باوەڕدارا نەتان بکوشتایە بەبێ ئەوەی ئێوە بزانن باوەڕدان ئێوە تووشی ئازار ئەبوون و، پێویستبو خوێنەکانیان بدەن و، بێباوەڕان تانەیان لە ئێوە ئەدا و، ئەیان ووت موسڵمانان لە خۆیان ئەکوژن.

﴿ لِيُدْخِلَ اللَّهُ فِي رَحْمَتِهِ مَن يَشَاء ﴾ خودا قەدەغەی فەرمو ئێوە بە جەنگەوە بچنە مەکە؛ لەبەر ئەوەی هەندێ لە بت پەرستانی خودا بیان خاتە ناو میهرەبانی خۆی کەسێ ئارەزۆی بکا و موسڵمان بێ، هەروایشبو، لە دوای ئاشتەوایی حودەیبیە هەندێکیان باوەڕیان هێنا.

﴿ لَوْ تَزَيَّلُوا لَعَذَّبْنَا الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴾ ئەگەر هەمو یەکێ لە باوەڕداران و بێباوەڕان جوێ بونایەتەوە لە یەکتری، خودا دەستوور ئەدا بە موسڵمانان جەنگ بکەن لەگەڵ بێباوەڕان، بەڕاستی ئێمە ئەوانەی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە لەوان سزامان ئەدان بە سزایەکی خاوەن ئازار، بە کوشتن و بە دیل کردن.

﴿ إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە خودا خستبویە دڵی ئەوانەی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە و نەیان هێشت لە ساڵی ٦٠)ی کۆچیدا پێغەمەر زیارەتی خانەی خودا بکا: ڕەگەز پەرستی و خۆ بە گەورە دانان، ڕەگەزپەرستی پێش ئیسلام، ئەو ڕەگەزپەرستیە بە تەنها شایانی ئەوەبو جەنگیان لەگەڵ بگرێ و بکوژرێن. بەڵام خودا توانای موسڵمانای لەوان گێڕاوە، لەبەر مانەوەی گیانی ئەو کەسانەی باوەڕهێنانیان ئاشکرا نەکردبوو، ئەوانەی لە دوای داگیرکردنی مەکە موسڵمان ئەبن.

﴿ فَأَنزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى وَكَانُوا أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴾ کاتێ پەیماننامەی ئاشتەوایی حودەیبیە ئەنووسرا بۆ ئەوەی مۆر بکرێ، بت پەرستان ووتیان: نابێ لەسەرتای نامەکەدا بنووسرێ(بسم الله الرحمن الرحیم)، نەیشنووسرێ (محمد رسول الله) بێگومان ئەو کارە ئەوپەڕی ڕەگەزپەرستی و بت پەرستی بوو، دوایی خودا ئارامی و خۆڕاگرتنی ناردە سەر دڵی پێغەمەر و باوەڕداران و توڕەنەبوون، ئەوەبو پێغەمەر بە عەلی کوڕی ئەبو تالیبی فەرمو: هەر شتێ ئەوان داوایئەکەین بینووسە و بنووسە (باسمك اللهم)، بینوسە (محمد بن عبدالله) باوەڕدارانیش بە فەرموودەی پێغەمەر ڕازی بون و،

خودا فەرموودەی خۆپاراستنی لە بێ فەرمانی خودا و بەردەوامبوون لەسەر باوەڕ پێویست کرد بۆ باوەڕداران و، هەر ئەوان شایستەی ئەو فەرموودەیەن و، هەر ئەوان خاوەنی ئەو فەرموودەیەن، خوا ئەزانێ بە هەموو شتێ، لە کار و فرمانی باوەڕداران و بێباوەڕان پاداشتیان ئەداتەوە بە گوێرەی کردەوەی خۆیان.

هەندێ لە زانایان ئەڵێن (کلمة التقوى) بریتیە لە (بسم الله الرحمن الرحيم) هەندێ تر ئەڵێن: مەبەست (لا إله الا الله). خودا بە هەموو شتێ ئەزانێ.

لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ ۖ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ
ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ
لَا تَخَافُونَ ۖ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ
فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَرْسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلْهُدَىٰ وَدِينِ
ٱلْحَقِّ لِيُظْهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٢٨﴾
مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ ۖ
تَرَىٰهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا ۖ سِيمَاهُمْ
فِى وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ ٱلسُّجُودِ ۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِى ٱلتَّوْرَىٰةِ ۚ وَمَثَلُهُمْ
فِى ٱلْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسْتَغْلَظَ فَٱسْتَوَىٰ
عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعْجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلْكُفَّارَ ۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًۢا ﴿٢٩﴾

﴿ لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِن شَاء اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُؤُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ ﴾ بە ڕاستی خودا ئەو خەوەی فروستادەی خۆی بەڕاستی بینی بوی بەڕاستی گێڕا کە ئێوە ئەچنە ئەو مزگەوتە ڕێزدارە ئەگەر خودا ئارەزۆی بکا یا سەرتان ئەتاشن یا کورتی ئەکەنەوە موی سەرتان ئاسودەن، لە دوژمن ناترسن. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەبو: پێغەمەر بەر لەوەی بڕواتەوە بۆ حودەیبیە لەخەویا بینی چونە مەکە بەبێ ترس و سەریان تاشی و مویان کورت کردەوە، هاوڕێکانی پێغەمەر خۆشنوور بوون و وایان ئەزانی ئەم

ساڵ ئەچنە مەکە، ووتیان: خەوی پێغەمەر ڕاستە، کاتێ چونیان بۆ مەکە دواکەوت، عەبدوڵای کوڕی ئوبەی ووتی: نە سەرمان تاشی و نە مویشمان کورت کردەوە.

﴿ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴾ دوایی خودا بەشتێ ئەزانێ ئێوە بەو شتەتان نەزانیوە کە چونی ئێوەی بۆ مەکە دواخست بۆ دوای ئاشتەوایی حودەیبیە کە ئێوە تووشی جەنگ نەبون و زۆرکەس لەوانەی ڕێگەیان لە ئێوە ئەگرت موسڵمان بوون، دوایی خودا بەخشی بە ئێوە بەر لە چوونتان بۆ مەکە دوای حودەیبیە سەرکەوتنێکی نزیك، وەك گرتنی خەیبەر، دواتر هەر ئەچنە مەکەیش.

﴿ هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَىٰ وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ شَهِيدًا ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە فروستادەی خۆی ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد شارەزا بکات بۆلای ئەوەی خودا بە تەنها دابنرێ و، بە ئایینێکی ڕاستەوە کە ئایینی ئیسلامە و دوورە لە بت پەرستی و بیرو باوەڕی پروپوچ. لەبەر ئەوە ئەو ئایینە ڕاستە سەربخا بە سەر هەمو ئایینەکانی پێش خۆی و، بە تایبەتی پلەیەکی بەرزی بداتێ، تایبەتمەند نیە بە ڕەگەزێکی تەنهاوە و، بۆ هەموو ڕەگەزەکانی ڕوی زەویە هەتا ڕۆژی دوایی، تەنها بۆ ئادەمیزاد نەهاتووە، بەڵکو بۆ جنۆکەکانیشە، هەر لەبەر ئەوەیشە ئایینی ئیسلام سەرکەوتووە بەسەر ئایینە ئاسمانیەکان و جگەی ئەوانیش و، لەبەرئەوەی ئاسایش و بەختیاری ساختە بهێنێ بۆ هەموو بوونەوەران و، هەموو ئادەمیزاد بکا بە بنەماڵەیەکی تەنها و، بەسە خودا شایەتی بدا لەسەر ڕاستی ئەو ئایینە و، ئاگادارە لەسەر ئەوەی موحەمەد پێغەمەری خودایە. بت پەرستان بڵێن: نابێ لە بەڵێن نامەی حودەیبیەدا بنووسرێ (محمد رسول الله) نەیڵێن: لای خودا هەر پێغەمەرە و ئایینەکەیشی ڕاستە، وەك خودا ئەفەرموێ:

﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ ﴾ موحەمەد نێررا و پێغەمەری خودایە و، کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە لە گەڵیا توند و دڵ ڕەق و بەتوانان بەسەر بێباوەڕاندا، دڵ نەرم و میهرەبان و خاوەن بەزەین لە نێوان خۆیانا، ئەو فەرموودەی خودایە لە باسی باوەڕدارانداا ئەوەمان بۆ ڕون ئەکاتەوە باوەڕهێنانی پێغەمەر و هاوڕێکانی تەنها بۆ ئەوە نەبووە بە ڕواڵەت پەرستن بۆ خودا بکەن، بەڵکو فراوانتر و زۆرتریشە لەوە، ئەوەتە خودا باسی هاوڕێکانی پێغەمەر بەو جۆرە ئاکا کە لە نێویەکا چۆن بوون و لەگەڵ بێباوەڕاندا چۆن بوون و، بەم جۆرەیش باسیان ئەفەرموێ لە پەرستندا کە ئەفەرموێ:

﴿ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا ﴾ تۆ ئەو کەسانە ئەبینی لەگەڵ پێغەمەران لە زۆر کات لە کوڕنوش و لە سوژدەدان، بە تایبەتی لە کاتی نوێژەکان، داوای پاداشت و ڕەزامەندی لە خودا ئەکەن.

﴿ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ﴾ نیشانەی چاکی و لە خوا ترسانیان دەرئەکەوی لە ڕومەتیانا لە پەیدابوونی شتێ بەهۆی سوژدەبردنیانەوە و، بەبۆنەی زۆری سوژدەبردنیان، ئەو جۆرە پیشانەی هاوڕێکانی پێغەمەر بووە بە پیشەی هەمو باوەڕدارانی دوای خۆیان.

زانایان بیریان جیاوازە لە بارەی دیاریکردنی نیشانە و کاریگەری سوژدەبردنیان: هەندێکیان ئەڵێن: ڕوناکیەکی سپیە بە ڕومەتیانەوە لە پاشەڕۆژدا کە لەوانیان پێ ئەناسرێ. هەندێ تریان ئەڵێن: جێگەی سوژدەبردنی ڕومەتیان وەك مانگی چواردە ئەدرەوشێتەوە، هەندێ تریان ئەڵێن/ لە ڕۆژی دواییدا زیندوو ئەکرێنەوە و، تەوێڵ و دەست و قاچیان سپیە. هەندێ تریان ئەڵێن: لە جیهاندا چاکی ئەوان لە ڕومەتیانا دەرئەکەوێ و ئەزانری و خودا پەرست و پیاوچاکن.

﴿ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِ ﴾ هەر بەو جۆرەی خودا باسی شێوەی هاوڕێکانی پێغەمەری فەرموو، هەر بەو جۆرە وێنەیان لە تەوراتا باسی کراوە و تۆمارکراوە... وە وێنەی ئەو کەسانەی لەگەڵ پێغەمەردابوون لە ئینجیلدا وێنەیان تۆمارکراوە بە وێنەی کشت و کاڵێ یەکەم جار لق و پۆپ و بەرهەمی خۆی ئاشکرا بکا و چوزە بکا، دوایی ئەو کشت و کاڵە یارمەتی ئەو لق و پۆپ و چوزەیە ئەدا و، دوایی ئەو کشت و کاڵە هێز پەیدا ئەکا و ڕەق ئەبێ، دوایی ئەو کشتە گەشە ئەکا و لەسەر بنکەکانی خۆی ئەوەستێ و، ئەگا بەوپەڕی هێز و چڕوپڕی بەجۆری ئەو هێز و گەشەکردنە.

﴿ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ ﴾ ئەو هێز و گەشەکردنەی کشت و کاڵە خاوەنەکەی سەرگەردان ئەکا بەهۆی جوانی و هێزی ئەو کشت و کاڵە... دوور نیە مەبەست لە خاوەن کشت و کاڵ پێغەمەر بێ کە هاوڕێکانی خۆی گەیاندە ئەو پلەوپایە بەرزە؛ لەبەر ئەوەی بەهۆی هێز ئەوانەوە ڕق و کینەی بێباوەڕان پەیدا بکەن و توشی خەفەت بن.

﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾ خودا بەڵێنی داوە بە کەسانێ باوەڕیان هێناو و کردەوە چاکەی کانیان کردووە،لە گوناهیان خۆشبێ و، پاداشتێکی گەورەیان بداتێ.

# ﴿ سورەتی ئەلحوجورات ﴾

لـە مەدینە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١٨) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ
إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ
فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ
لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ
قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ
يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلۡحُجُرَٰتِ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٤﴾
وَلَوۡ أَنَّهُمۡ صَبَرُواْ حَتَّىٰ تَخۡرُجَ إِلَيۡهِمۡ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ
رَّحِيمٞ ﴿٥﴾

نوێنەرانی بەنو تەمیم هاتن بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ لە مەدینـە، لـە سـاڵی (٩) کۆچیـدا، ژمارەیان (٧٠) پیاوبوون، بۆ ئەوە هاتبوون بپارێنەوە بۆ بەرەڵاکردنی دیلەکانیان، کاتـێ چوونـە مزگەوت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ خەوی پێش نیوەڕۆی ئەکرد لـە خـانووی عائیشـەدا، نوێنـەرەکان لـە پشتی پەردەوە بانگیان کـرد ئـەی موحەمـەد، وەرە دەرەوە بۆلامـان و، دەنگیـان بـەرزکردەوە عەرەب ئاسایی، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەهۆی دەنگی بەرزیانەوە ئازاری پێ‌گەیشـت، دوایـی پێغەمـەر چووە دەرەوە بۆلایان و لایـان دانیشـت، عوتـاریدی کـوڕی حـاجیب لـە جیـاتی بـەنو تـەمیم خوتبەیەکی خوێندەوە، بە دەستوری پێغەمەر سابیتی کوڕی حەسان وەڵامی دایەوە، شاعیرەکەیان بە ناوی (زەبەرقان) هەندێ هۆنراوەی خوێندەوە، بە دەستووری پێغەمەر حەسانی کوڕی سابیت وەڵامی دایەوە، نوێنەرانی بەنو تەمیم ووتیان بەڕاستی ئەم پیاوە یارمەتی دەدرێ و هەموو شتێکی بۆ ئاسان ئەکرێ، سوێند ئەخۆین بەخوا شاعیرو خوتبە خوێنەکانت لـەوانەی ئێمـە باڵادەسـترن، دەنگ و گفتوگۆی زۆر خۆشە و زۆر بە ئارامترە لە ئێمە، دوایـی هـەموویان موسـڵمانبوون و،

پێغەمەریش دیلەکانی بۆ بەرەڵاکردن و خەڵاتیشی کردن، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە بە جۆرێ ترە، هەرچۆنێبێ هەموویان شایستەن، ئەوەی گرنگبێ بەو ئایەتانە خوای مەزن موسڵمانان فێری ڕێزگرتن و گفتوگۆکردن ئەکا لەگەڵ یەکترێ. بە تایبەتی لە خزمەت پێغەمەردا ﴿ﷺ﴾ بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوانەی پێشوو خودا ئەفەرموێ:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا بَيْنَ يَدَيِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە، ئێوە لە هیچ کارێکی خۆتانا پێش فەرموودەی خودا و پێغەمەر مەکەون، پەلە مەکەن لە گفتوگۆکردندا هەتا خودا و پێغەمەر فەرمانی خۆیان ئەدەن و، مانای فەرموودەی خودا مەکەن هەتا پێغەمەر مانای نەکا بۆتان، بە تایبەتی ئەو شتانەی پەیوەندییان بە سوودی گشتییەوە هەیە و، ئێوە لە خودا بترسن و پێش فەرموودەی خودا و پێغەمەر مەکەون لە هیچ کارێکتانا، بەڕاستی خودا گفتگری ئێوە ئەبیسێ، ئەزانێ بە هەموو شتێ ئێوە ئەیکەن.

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە و ئەم ئایەتەی دوایی ئەوەبوو: پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ویستی کەسێ دابنێ بۆ ئەوەی کاروباری بەنوتەمیم ببا بەڕێوە، ئەبوبەکر ووتی: با ئەو کەسە (قەعقاق) بێ، عومەر ووتی: با ئەو کەسە (ئەقرەعی کوڕی حاریس) بێ، دژایەتی کەوتە نێوانیان و، دەنگیان بەرزبووەوە لە لای پێغەمەر، لەبەر ئەوەی باوەڕداران تووشی ئەو هەڵەیە نەبن توشی بەنو تەمیم و ئەبوبەکر و عومەر بو، خوای مەزن فەرمووی:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَرْفَعُوا أَصْوَاتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ النَّبِيِّ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە، ئێوە دەنگی خۆتان بەرز مەکەنەوە بەسەر دەنگی پێغەمەردا، بەرزکردنەوەی دەنگ خۆی لە خۆیا چاك نیە، بە تایبەتی لە خزمەت پێغەمەردا کە گەورەی هەموو پێغەمەرانە و بەڕێزترینی هەموو بوونەوەرانە.

﴿ وَلَا تَجْهَرُوا لَهُ بِالْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ على بَعْضٍ أن تَحْبَطَ أَعْمَالُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾ وە ئێوە گفتوگۆ مەکەن لەگەڵ پێغەمەر وەك گفتوگۆی هەندێکتان لەگەڵ هەندێ ترتانا، بە ئاشکرایی و بە جۆرێکی ناشایستە کە پاداشتی کردەوەکانتان پوچ ببێتەوە و، ئێوە خۆتان هەستی پێ نەکەن.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ دەنگی خۆیان نزم ئەکەنەوە لە گفتوگۆکردندا لای پێغەمەری خودا، ئەو تاقمە کەسانێکی ئەوتۆن خودا دڵی تاقی کردوونەتەوە و پاکی کردووەتەوە لە هەموو خراپەیە بۆ ئەوەی لە خوا بترسن و خۆیان لە بێفەرمانی خودا بپارێزن، بۆ ئەو کەسانە هەیە لێخۆشبوون لە گوناهەکانیان و پاداشتێکی زۆر گەورە.

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَاءِ الْحُجُرَاتِ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ بانگی تۆ ئەکەن لە دەرەوەی هۆدەکانی ژنانی تۆ و، جێگەی دانیشتنی نهێنی تۆ، زۆرتر لەو کەسانە نازانن چاودێری سروشتی کۆمەڵایەتی بکەن، چونکە دەشتەکی و دڵ ووشکن.

﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ وە ئەگەر ئەو تاقمە ئازاری تۆیان نەدایە بەو جۆرە ناشایستەیە، ئارامیان بگرتایە و، چاوەڕوانیان بکردایە تۆ

ئەچویتە دەرەوە بۆلایان چاکتر بوو بۆ ئەوان لە پەلەکردنە کە دژی سروشتی کۆمەڵایەتی‌یە، خودا لێخۆشبوونی زۆرە بۆ کەسانێ پەشیمان بنەوە و، جاری تر پەلە نەکەن لەلای پێغەمەر، میهرەبانە وە خاوەن بەزەییە بۆ ئەوانە چاودێری کاری ناو کۆمەڵایەتی ئەکەن.

پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ وەلیدی کوڕی عەقەبەی نارد بۆلای هۆزی (بەنولموستەلیق) بۆ وەرگرتنی زەکاتەکانیان دوایی کاتێ بیستیان کە وەلید هاتووە، بەخۆشی‌یەوە بە کۆمەڵ چوون بۆ پێشوازی کردنی، وەلید ترسا و وای زانی بۆ کوشتنی هاتوون، گەڕایەوە بۆ خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ووتی نیازیان وا بوو بم کوژن و زەکاتەکەیان نەدامێ، دوایی پێغەمەر بە تووڕەیی‌یەوە خالیدی کوڕی وەلیدی نارد بۆلایان، خالید تەماشای کرد نوێژ ئەکەن، بە خۆشی‌یەوە زەکاتەکەیان دایە، گەڕایەوە بۆ خزمەت پێغەمەر و ڕووداوەکەی بۆ گێڕایەوە، خوای مەزن فەرمووی:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوْمًۢا بِجَهَٰلَةٍ فَتُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَٰدِمِينَ ﴿٦﴾

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَأٍ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێ لە سنوور دەرچووبوو هات بۆلای ئێوەوە بە هەر هەواڵێکەوەبێ.

﴿ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ ﴾ دوایی ئێوە پەلە مەکەن بۆ چارەسەرکردنی ئەو هەواڵە، هەتا ئێوە بە باشی ئەو هەواڵە ڕوون ئەکەنەوە و، ڕاستیتان بۆ دەرئەکەوێ، لەبەر ئەوەی ئێوە تاقمێ تووشی ئازار و کوشتن و دیل کردن نەکەن بە نابەدڵی و نەزانینەوە.

﴿ فَتُصْبِحُوا عَلَى مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ ﴾ دوایی ئێوە پەشیمان بنەو لەسەر ئەو شتەی ئێوە کردووتانە بەهەڵە.

ووشەی (فاسق) وا ئەگەیەنێ دادوەر بۆی هەی هەواڵی مرۆڤیکی دادپەروەر و چاك وەربگرێ، هەرچەندە وا چاکە هەواڵی ئەویش ڕوون بکرێتەوە دوایی کاری پێ‌بکرێ.

وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ﴿٧﴾
فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٨﴾

﴿ وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِّنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ ﴾ وە ئێوە بزانن کە بە ڕاستی لەناو ئێوەیەدایە پێغەمەری خودا بەڕێزترینی هەموو بوونەوەرانە پێویستە ئێوە بە جگەی

ڕاستی هەواڵی تری نەدەنێ، پەیڕەوی ئێوە بکا لەو کار و هەواڵانەی ئێوە بەوی ئەڵێن و، پەلە بکا و لە ڕوون بوونەوەیان فەرمانی پێبدا ئێوە تووشی ئازار و گوناه ئەبن.

﴿ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ ﴾ وە بەڵام خودا باوەڕهێنانی بە ئایینی ئیسلام لای خۆشەویستر و بەڕێزتر کردووە لە هەموو ئایینەکانی تر و، جوانی کردووە لە دڵی ئێوەدا و، بۆ خۆتانتان هەڵبژاردووە.

﴿ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ أُولَئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ ﴾ وە خودا بێباوەڕی و لە سنوورلادان و بێفەرمانی خودای ناشیرین و قێزەون کردووە لای ئێوە، ئەو باوەڕدارانەی باوەڕهێنانیان لا خۆشەویستە هەر ئەوانەن بەردەوامن لەسەر ڕێگەی ڕاست، یاریدەیان دراوە بۆلای باوەڕ و شارەزای یاسای خودان.

﴿ فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَنِعْمَةً وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ خودا ئەو کارانەی لەگەڵ باوەڕداران کردووە لەبەر گەورەیی خۆی و چاکەی خودا بەسەریانەوە، خودا ئەزانێ بەوان و بە شتێ لە دڵیانایە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی دائەنێ کە یارمەتی باوەڕداران ئەدات.

ژنێکی مەدینەیی کە ناوی ئوموزەید بوو، شوی کردبوو بە پیاوێکی دانیشتووی مەدینە، ناکۆکی و ئاژاوە کەوتە نێوانیان، ژنەکە ویستی بچێتەوە بۆلای خزمانی خۆی، مێردەکەی لە هۆدەکیەی خانووەکەی خۆیدا بەندی کرد و نەیهێشت بچێ بۆلای خزمەکانی، بەهەرچۆنێ بێ هەواڵی نارد بۆلای کەس و کاری، ئەوانیش ویستیان بە زۆر بیبەنەوە بۆلای خۆیان، مێردەکەی هاواری کردە خزمانی خۆی و هاتن بە دەمییەوە و، بوو بە جەنگیان، بە بەردو دار و پێڵاو کەوتنە لەشی یەکتری، خودا لەو بارەیەوە فەرمووی:

وَإِن طَآئِفَتَانِ
مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱقْتَتَلُوا۟ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا ۖ فَإِنۢ بَغَتْ إِحْدَىٰهُمَا
عَلَى ٱلْأُخْرَىٰ فَقَٰتِلُوا۟ ٱلَّتِى تَبْغِى حَتَّىٰ تَفِىٓءَ إِلَىٰٓ أَمْرِ ٱللَّهِ ۚ فَإِن فَآءَتْ
فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَهُمَا بِٱلْعَدْلِ وَأَقْسِطُوٓا۟ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ
﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ
لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾

﴿ وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا ﴾ وە ئەگەر دوو کۆمەڵە باوەڕداران بوو جەنگیان و ئاژاوە لە نێوانیاندا پەیدابوو، دوایی پێویستە ئێوەی جگەی ئەوان ئاشتەوایی بخەنە نێوانیانەوە، ئایینی پیرۆزی ئیسلام چەندین یاسا و دەستووری هەیە بۆ دروستکردنی کۆمەڵایەتی و چاککردنیان:

لەو یاسایانەیە پاراستنی خۆبن و دارایی و سەربەستییان لـە کـارکردن و گفتوگۆیانـا، هیـچ کەسێ نابێ بە نارەوا پەلاماری بدرێ، بەلآم هەرکاتی هەر تاقمـێ دەسـت درێـژی کـردە سـەر تاقمێ تر، ئەو کاتە رێزی خۆیانیان پێشێل کردووە و رێزیان لێناگیرێ. هەندێ تر لـەو یاسـایانە ئەوەیە ئادەمیزاد پاڵ بدەن بە یەکترییەوە و، یەکیان خۆشبوێ هەتا چاکە و خۆشی و ئاشـتەوایی و ئاسوودەیی هەموویان بگرێتەوە. کەواتە ئەگـەر ئـاژاوە و جـەنگ کـردن کەوتـە نێـوان دوو تاقمیان، پێویستە موسڵمانانی تر ئەو جەنگە کۆتایی پـێ بـهێنن، دۆسـتایەتی بخەنـە نێوانیانـەوە، لەسەر بنچینەی دادپەروەری و راستی، بۆ ئەوەی کۆمەڵگای ئیسـلام یـەك بگـرن و پرژوبـلاو نەبن، پێویستە ئەو تاقمەی سێیەم بیلایەن بێ. خوای مەزن فێرمان ئەکا و ئەفەرموێ:

﴿ فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ ﴾ دوایی ئەگـەر یەکێ لەو دوو تاقمە بە ئاشتەوایی ئێوە رازی نەبوو، دەست درێژی کردە سەر تاقمەکـەی تـر، ئیتر ئێوە جەنگ بکەن لەگەڵ ئەو تاقمەی ئەوتۆ ستەم ئەکا و ئەگەڕێتەوە بۆلای فەرمانی خـودا. پێویستە لەسەر ئێوەی موسڵمان لە پێشا هەموو کۆششی خۆتان بخەنەکار بۆ ئاشتەوایی نێوانیان، دوایی پەنا ببەن بۆلای جەنگ.

﴿ فَإِن فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ ﴾ دوایی ئەگەر ئـەو تاقمە ستەمکارە گەڕایەوە بۆلای فەرمانی خودا، ئێوە ئاشتی بخەنـە نێـوان هـەردوو تاقمەکـە بـە گوێرەی ئـەو دادپەروەرییـە خـودا فـەرمانی پـێداوە و، ئێـوە دادپـەروەربن. بەراسـتی خـودا دادپەروەرانی خۆش ئەوێ بۆ زۆرتر هاندانی موسڵمانان بۆ ئاشتەوایی خودا ئەفەرموێ:

﴿ إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾ بەراستی هـەموو باوەڕداران برای یەکترین و پەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە و، بـەرژەوەندییان بەسـتراوە بـە یـەك شتی سەرەکییەوە کە باوەڕهێنانە و، ئەبێتە هۆی ژیانێکی ئاسوودەی بەردەوام و، بلاوبوونەوەی مافی مرۆڤایەتی، دوایی ئێوە ئاشتەوایی بخەنە نێوان براکانتان هەرکاتێ ئاژاوە پەیدابوو لە نێوانیانا و، لە برای پشتی خۆیانتان جوێ مەکەنەوە. بێگومان ئادەمیزاد لەسـەرەتادا بـرای یـەکترین بـە گشتی و، برای ئائینیین بە تایبەتی، سودی گشـتی لـە ئاشتیدایە و، لـە خوابترسـن و دژایـەتی فەرمانی خودا مەکەن، لەبەر ئەوەی ئێوە میهرەبانی و چاکەتان لەگەڵ بکرێ لە لایەن خوداوە.

خودای گەورە لەو ئایەتانەی پێشـوودا باسـی ئاشـتەوایی و دۆسـتایەتی نێـوان بـاوەڕدارانی فەرموولە هەمان کاتدا فەرمانیشی پێداین هەر لەبەر سودی گشتی باوەڕداران مـافی مرۆڤایـەتی پێشێل نەکەین، نەیخەینە پشت گوێ لەبارەی هەموو ئادەمیزادەوە لەسەر زەوی، وەك لـەمـەودوا خودا لە ئایەتی (١٣)ی ئەم سورەتەدا فەرمانمان پـێ ئـەدا و ئەفـەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى ﴾ لە ئایەتی (١٣)ی سورەتی (ئەلئەسراو)دا ئەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ ﴾ پێغەمەر ئەفەرموێ: ﴿ الناس سواسية كإنسان المشط. الا لا فضل العربي على عجمي، ولا عجمي عربي، و لا احمر، علـى أسـود، ولا لأسـود علـى أحمـر الا بـالتقوى ﴾، ئەفـەموێ: ﴿ كلكم من آدم وآدم من تراب ﴾.

خودای مەزن لەو ئایەتانەی پێشوودا فەرمانی پێداوین ئاشتەوایی و دۆستایەتی بخەینە نێوان باوەڕداران، بە جۆرێکی بێلایەنیو دادپەروەر، بێ ڕەگەزپەرستی و، بنەماڵە پەرستی و، بە جۆرێ عومەری کوڕی خەتاب ڕازی نەبوو فەرمانڕەوایی بدرێتە دەست عەبدولای کوڕی. بەڵام بە داخەوە (ئەمەوییەکان و عەباسییەکان و تورکەکان و فارسەکان و سعودیەکان لە خوا نەترساون و ڕاستەوخۆ خۆیانیان کردووە بە جێنشینی باوباپیر و کەس و کاریان، هەر لەبەر مانەوەی دەستەلاتی بنەماڵەی خۆیان و، جگەی خۆیان وەك ئاژاڵ تەماشا ئەکەن، خۆیان بە میراتگری سامانی دانیشتووان ئەزانن، دەستیان دایە ستەم کردن و بێفەرمانی خودا و ڕەگەزپەرستی و بنەماڵە پەرستی و، بە کۆمەڵ کوشتنی جگەی خۆیان بە بێ بەزەیی، جاری وا هەبووە برایە برای خۆی کوشتووە یا چاوی کوێرکردووە هەر لەبەر ئەوەی خۆی فەرمانڕەوا بێت، خزمایەتی و ئایین و مرۆڤایەتییان بەکارنەئەهێنا، فەرموودەی خودایان واز لێهێنابوو کە ئەیفەرموو بە باوەڕداران و، ڕووی فەرموودەی خۆی ئەکرد پێغەمەر و ئەیفەرموو: ﴿ وشاورهم في الأمر ﴾، باسی چاکەی باوەڕداران ئەکا و ئەفەرموێ: ﴿ و أمرهم شورى بينهم ﴾ بۆ ڕوونکردنەوەی ستەمی فەرمانڕەوایانی دوای چوار جێگە دارەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ زۆر بە باشی تەماشای نامە مێژووەکان بکەن، بۆتان ڕوون ئەبێتەوە و، فەرمانڕەوایان بە چ جۆرێکی دڕندانە دەست درێژییان ئەکردە سەر دانیشتووان هەر لەبەرمانەوەی بنەماڵەکەیان، کیمیابارانی شاری هەڵەبجە و بالیسان و جێگەکانی تر چاکترین بەڵگەن لەسەر ستەمی کاربەدەستان.

سابیتی کوڕی قەیسی کوڕیشەماس لەبەر ئەوەی گوێچکەی بە باشی شتی نەئەبیست، لە نزیك پێغەمەرەوە نەبووایە فەرموودەی پێغەمەری نەئەبیست، هەر کاتێ بهاتایە جێگەکان بۆ چۆڵ ئەکرد هەتا نزیك ببوایەتەوەلە پێغەمەرەوە، جارێك بەهۆی نوێژەوە درەنگ هات بۆ خزمەت پێغەمەر، جێگەکان گیرابوون، کە هات ووتی بەدانیشتووان: بڵاوببنەوە هەتا لە پێغەمەر نزیك ببمەوە، پیاوێ لە دانیشتووان ووتی: دانیشە لە جێگەی خۆتا، تەنیشتی پێغەمەری بۆ چۆڵ نەکرد.سابیت ووتی: ئەوە چ کەسێکە؟ ووتیان فلان کەسە، ووتی زۆر باشە، ئەمە کوڕی فلان ژنە، ئەو ژنە بەر لە ئیسلام باسی بە چاکە نەئەکرا. ئەو پیاوەیش زۆری لاگرانبو.

هەروەها جارێ ئومذ سەلەمەی ژنی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ پارچە قوماشێکی دابو بەسەر شانیا و ئەیکێشا بە زەویدا، عائیشە و حەفسەی ژنانی پێغەمەر و ووتیان: سەیرکەن، ئەو پارچە ئەڵێیزمانی سەگە، هەندێ لە ژنانی پێغەمەر بە سەفیەی کچی حوبەییان ووت: جولەکە زادە، خودای گەورە بۆ قەدەغەکردنی ئەو جۆرە کارانە فەرمووی:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ
عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا
مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ
ٱلۡفُسُوقُ بَعۡدَ ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن لَّمۡ يَتُبۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾

﴿ یا أیها الذین آمنوا لا یسخر قوم من قوم عسی أن یکونوا خیرا منهم ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە. هیچ تاقمێ سوکایەتی و گاڵتە بە تاقمێ تر نەکا لە پیاوانتان، لەوانەیە ئەو تاقمە گاڵتەی پێئەکرێ چاکتر بێ لەوان و، بەسوود تربن بۆ دانیشتووان.

﴿ ولا نساء من نساء عسی أن یکن خیرا منهن ﴾ وە هیچ تاقمێ لە ژنان گاڵتە بە هیچ تاقمێ لە ژنان نەکەن، لەوانەیە ئەو تاقمە ژنە گاڵتەیان پێئەکرێ چاکتر و بەسود تربن لەوانە گاڵتە بەمان ئەکەن.

هۆزی بەنوسەلمە، پیاوی وایان تیدا بوو دوو ناوی هەبوو، پیی ناخۆشبوو بە یەکێ لەو ناوانە بانگی بکری. پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ جاریك چوو بۆ ناو ئەو هۆزە، بانگی کردە پیاوێ فەرمووی: ئەی فلان. ووتیان بە پیغەمەر: ئەو پیاوە پیی ناخۆشە بەو ناوە بانگ بکرێ، خوای مەزن بۆ قەدەغەکردنی بانگ کردن بە ناوێ لای ناخۆشبێ فەرمووی:

﴿ ولا تلمزوا أنفسکم ولا تنابزوا بالألقاب بئس الاسم الفسوق بعد الإیمان ﴾ وە ئیوە هەندیکتان هەندێ ترتان لەکەدار مەکەن بە ناویکی خراپ و، ئەویش بەو ناوە لەکەداربێ و، ئیوە یەکیکتان بانگی یەکێ ترتان بکەن بەنازنازێ پیی ناخۆشبێ، دەرچون لە پەرستن و فەرموودەی خودا خراپە کە ناوی پیاوێ ببرێ بە ناوێ لای گرانبێ، دوای ئەوەی ئەو پیاوە باوەری هیناوە و موسلمان بووە، هەرکەسێ بانگی یەکێ بکا بە ناویکی خراپ ئەو کەسە لە سنوور دەرچووە، بۆ نموونە: ئەی بێ ئایین. ئەی زۆڵ. ئەی گەواد. هەروەها.

﴿ ومن لم یتب فأولئك هم الظالمون ﴾ وە هەرکەیێ پەشیمان نەبوویبیتەوە لەو شتانەی خودا قەدەغەی کردوون، دوایی ئەو کەسانە ستەمیان لە خۆیان کردووە.

پیغەمەری خودا هەر کاتێ بچوایەتە دەرەوە، پیاویکی هەژاری ئەکرد بە هاوریی دوو پیاوی ساماندار، بۆ ئەوەی یارمەتیان بدا و بەیەکەوە خواردەمەنی بخۆن.سەلمان جاریك بوو بە هاوریی دوو کەس، بە ریکەوت چوونەوە بۆ جیگەی خۆیان، سەلمان خەوی پیدا کەوت، خواردەمەنی نەسازاندبوو بۆ ئەو دووپیاوە کە هاتنەوە خواردن و پیخۆریان نەبوو، ووتیان بە سەلمان: برۆ بۆ خزمەت پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ داوای خواردەمەنی بکە، چووە خزمەت پیغەمەر فەرمووی، برۆ بۆلای ئوسامەی کوری زەید ئەگەر خواردەمەنی هەیە بداتێ، چووە لای ئوسامە ووتی: هیچ شتیکم لا نیە، دوایی چووەوە بۆلای دوو پیاوە هاوریکانی خۆی ووتیان: خواردەمەنی هەبووە و نەیداوە بە تۆ، وتیشیان: ئەگەر سەلمان بروا بۆ هاوردنی ئاو لە بیری (سەمیحە) بەو ئاوە زۆرەوە، ئەو بیرە ووشك ئەبێ لە سەلمان ; کەوتنە گومانەوە بۆیە چوونە لای ئوسامە بزانن خواردەمەنی لایە یا نە؟ پیغەمەر چاوی بەوان گەوت فەرمووی: سەوزایی گۆشت بە دەمتانەوە دیارە، ووتیان: ئەی پیغەمەری خودا: ئەمرۆ نە گۆشت و نە هیچ شتێ ترمان نەخواردووە. پیغەمەر فەرمووی: گۆشتی سەلمان و ئوسامەتان خواردووە، لەو بارەوە بۆ قەدەغەکردنی ناوبردنی ئادەمیزاد بە خراپە و بە گومانی خراپە بردن و، بۆ سیخۆری نەکردنی یەکتری خودا فەرمووی:

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾

﴿ يا أيها الذين آمنوا اجتنبوا كثيرا من الظن إن بعض الظن إثم ﴾ ئەی کەسانیکی ئەوتۆ ئیوە باوەرتان هیناوە: ئیوە خۆتان لە زۆر گومانی خراپ بۆ یەکتری بپاریزن.بەراستی هەندێ لە گومان بردن گوناهە.

گومان بردن چەن جۆرێ هەیە: گومانکردنی وا هەیە پیویستە پەیرەوی بکرێ، وەك ئەوەی گومان ئەبرێ ئایا کردنی ئەو کارە خراپە یا نە، بەلام بەلگە لەسەر خراپی ئەو کارە نەبێ، کردنی چاکە. هەروەها پیویستە هەموو کاتێ گومانی چاکە ببریت لە هەموو کارەکانی خوای مەزن. ئەگەر گومانت وابێ فلان کەس پیاوی چاکەبەلام لە ناوەرۆکدا چاك نەبێ ئەو گومان بردنە قەدەغە نیە. گومانبردنی وا هەیە قەدەغەیە و پیویستە خۆپاریزی لیبکرێ، وەك گومان بردن بۆ راستی فەرمانەکانی خودا و پیغەمەر، یا گومانبردن لە راستی پیغەمەرایەتی پیغەمەر، مەبەست لە هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەم بەشەی دووایە و چەند گومانێ تری خراپ. ئەگەر بتەوێ بازرگانیە بکەی بۆ ژیانی خۆت و، نەزانی ئایا قازانج ئەکەی یا نە، ئەو بەشەیان ئادەمیزاد خۆی سەربەستە لە کردنیدا.

﴿ ولا تجسسوا ﴾ و ئیوە مەگەرین بە دوای دەرخستنی کاریکا کەسێ تری پێ تووشی ئازار ببێ و، مەبن بە سیخور بۆ یەکتری. بەراستی جاسوسی بە گویرەی فەرموودەی خودا و پیغەمەر و بەلای ئەقلەوە قەدەغەیە. رژیمەکانی ئەمرۆ ئامیری وایان دروستکردووە، ئەتوانرێ بەو ئامیرە هەموو شتیکی نهینی پێ دەربخرێ. پیغەمەر ئەفەرموێ: هەرکەسێ بیەوێ خراپەی یەکێ تر دەربخا، خودا خراپەی ئەو کەسە دەرئەخا با لە ناو خاوخیزانی خۆیا بیکا. بۆیە پیویستە سیخوری نەکرێ بە پیشە هەتا ئابرووی نەچێ.

﴿ ولا يغتب بعضكم بعضا أيحب أحدكم أن يأكل لحم أخيه ميتا فكرهتموه واتقوا الله إن الله تواب رحيم ﴾ وە هەندێ لە ئیوە باسی هەندێ تری واتان مەکەن لە لاتان نەبن بە خراپە، چونکە ئەگەر ئەو باسە راستبێ قەدەغەیە،وە ئەگەر راست نەبێ بوختانت پیداکردووە و خراپتر قەدەغەیە. ئایا یەکێ لە ئیوەی باوەردار پیی خۆشە گۆشتی برایەکی خۆی بخوا بە مردوویی لە کاتی هەرزانیدا، دوایی پیتان ناخۆشە ئەو گۆشتە بە مردوویی بخۆن و ئیوە لە خودا بترسن و، واز لە بێفەرمانی خودا بهینن و، باسی برای خۆتان بە خراپە مەکەن و پەشیمان ببنەوە هەرکاتێ کردتان. بەراستی خودا پەشیمانبوونەوەتان لێوەرئەگری، میهرەبانە بۆ باوەرداران لەو ئایەتەدا خوای مەزن، ئەو کەسەی بە خراپە ناوی ببرێبە مردووی داناو؛ چونکە ئەو کەسە لەوێ نییە،

ناموس و ناوبردنی بە گۆشت داناوە، گفتوگۆی خراپی باس کەرەکەی بە خواردن ژماردووە. کەواتە پێویستە مرۆڤ چۆن لای گرانە گۆشتی مردوو بخوات، هەروایش لای ناخۆشبێ ناوی برای خۆی بە خراپە ببا.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ
شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ
عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ۞ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن
قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ
وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾
إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ
وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ
ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلۡ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمۡ وَٱللَّهُ
يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ
﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ عَلَيۡكَ أَنۡ أَسۡلَمُواْۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسۡلَٰمَكُمۖ بَلِ ٱللَّهُ
يَمُنُّ عَلَيۡكُمۡ أَنۡ هَدَىٰكُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ
يَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾

﴿ يا أيها الناس إنا خلقناكم من ذكر وأنثى وجعلناكم شعوبا وقبائل لتعارفوا ﴾ ئەی ئادەمیزاد: ئێمە ئێوەمان دروست کردووە لە پیاوێك و لە ژنێ کە ئادەم و حەوان، ئیتر چۆن ئەبێ ناوی یەکتری بهێنن بە خراپە و ئێوە برای یەکبن و؟ ئێمە ئێوەمان کردووە بە چەن نەتەوەیەکی سەرەکی و، بە چەند هۆزی لەو نەتەوانە، بۆ ئەوەی ئێوە هەندێکتان ئەوانی تر بناسن و چاکە لەگەڵ یەکتری بکەن و، سود لەناو یەکتریدا ئاڵ و گۆڕ بکەن نەك بۆ ئەوەی خۆتان هەڵکێشن بەو نەتەوە و بەو هۆزانەوە، نەك بۆ ئەوەیش جەنگ لەگەڵ یەکتری بکەن و تاوانج بگرنە یەکتری و ناو یەکتری بن بە خراپە و سیخوری یەکتری بکەن و گومانی خراپە ببەن بە یەکتری.

﴿ إن أكرمكم عند الله أتقاكم إن الله عليم خبير ﴾ بەراستی بەرێزترین و گەورەترینی ئێوە لە خزمەت خوادا کەسێکە زۆرتر لە خودا بترسێ ئێوەی ئادەمیزاد و، بەسودتربێ بۆ

دانیشتووان.بە راستی خودا ئەزانێ کامتان زۆرتر لە خودا ئەترسن و، ئاگای لە دەروونی ئیوە هەیە.

بەراستی ئادەمیزاد لە بنچنەدا برای مرۆڤایەتی یەکترین لە هەموو ماف و پیویستیدا یەکسانن. کەواتە پیویستە ئیوە یەکتری بناسن، جیاوازی رەنگ و هۆز و بنەمالە و نەتەوە و هەریم بخەنە ژیر پیتان بۆ سوودی گشتی، بەبێ جیاوازی یارمەتی یەکتری بدەن، ئەو ئایەتە پیرۆزە داوا لە ئادەمیزاد دەکات، وەك یەك نەتەوەی بەرەبابی یەکتری بن، لەبەر سوودی یەکتری، مرۆڤایەتی و دادپەروەری و خۆشەویستی کۆیان ئەکاتەوە. بەداخەوە لەم سەردەمەی ئیمەدا بریار و بەلیندان بۆ چەسپاندنی مرۆڤایەتی نووسراوی سەرکاغەزە، هەرچەندە خودا (١٤٢١)ساڵ لەمەوبەر داوا لە ئادەمیزاد ئەکا مافی یەکتری بپاریزن کەچی تازە رژیمەکان یاسا و پەیرە و پرۆگرامی بۆ دائەنین.

ئەو ئایەتانەی پیشوو لەوەوە هاتونەتە خوارەوە کاتێ پیغەمەری خودا چوە مەکە و لە بت پەرستی پاك کرایەوە. فەرمانیدا بە بیلال بچیتە سەربانی کەعبە و بانگ بدا، دانیشتووانی مەکە کە دەنگی بیلالیان بیست لەو کارە تورەبوون، دەستیان کرد بە گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکتری،عەتابی کوری ئیبنو ئەسید ووتی: سوپاس بۆ خودا باوکم ئەم رۆژەی نەدی بە چاوی خۆی، حاریسی کوری هیشام ووتی: جگەی ئەم قالاوە رەشە کەسی تر نەبو ئەم بانگە بدا، سوهەیلی کوری عەمر ووتی: خودا بیەوێ شتێ بکا بە بارێ تردا ئەیگۆری، ئەبوسوفیان ووتی: من هیچ شتێ نالیم، ئەترسم خودای ئاسمان هەوالی پێبدا و بلاوی بکاتەوە، جبرەئیل هاتە خوارەوە ئەوەی ئەوان ووتبویان گیرایەوە بۆ پیغەمەر ﴿ﷺ﴾، پیغەمەری بانگی کردن و پرسیاری لیکردن، ووتیان: بەلێ،ووتوومانە. خوای مەزن لەو بارەوە ئەو ئایەتانەی ناردە خوارەوە، پیغەمەر سەرزەنشتی کردن و، قەدەغەی کرد کە ئادەمیزاد خۆیان بە بنەمالە و سامانەوە هەڵ نەکیشن، گالتە بە هەژاران نەکەن، خودا داوای لە ئادەمیزاد کردووە، بەراستی لای خودا هەموویان یەکسانن، جیاوازی لە نیوان سور و سپی و رەش و زەردا نیە، جیاوازی لە نیوان سارمی و حامی و عەرەب و جگەی عەرەبدا نیە، هەموویان لە یەك باوك و لە یەك دایکن، لە رۆژی دواییدا ریز بۆ هیچ کەسێ دانانرێ بە جگەی لە خودا ترسان.

عەرەبەکانی هۆزی بەنو ئەسەد لە سالیکی گرانیدا هاتنە خزمەت پیغەمەر و، بە رووالەت لەبەردەم پیغەمەردا شایەتیمانیان هینا و، لە دلیانا بێباوەڕییان پەنهان دابوو، لە مەدینەدا دانیشتن، ئەو تاقمە لەو عەرەبانە بوون دڵ رەق و دەرون ووشك، هەوای مەدینە بەهۆی پیسی ئەوانە و گۆرابو، نرخی شت و کەل و پەل بەرزبوبوەوە، منەتیان ئەنایە سەر پیغەمەر بەوەی موسلمان بوون، ئەهاتنە لای پیغەمەر ئەیان ووت: بە خۆمان و خیزان و هەموو قورسایمانەوە هاتووین بۆلات و، وەك عەرەبەکانی تر جەنگمان لەگەڵ نەکردووی. کەواتە بەشمان لە زەکات بدە. خوای مەزن لەو بارەیەوە فەرمووی:

﴿ قالت الأعراب آمنا قل لم تؤمنوا ﴾ عەرەبەکان ووتیان: ئیمە باوەرمان هیناوە بە خودا و بە رۆژی دوایی بە دڵ و بە زمان، خودا فەرمووی بە پیغەمەر: تۆ بەو عەرەبانە بلێ: ئیوە بە دڵ

باوەڕتان نەهێناوە، چونکە باوەڕهێنانی ڕاستی و بێگومان ئەبێ بەرانبەر بە هیـچ شتێ نـەبێ لـە داواکردنی دارایی و جگەی دارایی و، منتان نەئەنایە سەری من کە گوایا ئێوە وەك هۆزەکانی تر جەنگتان لەگەڵ من نەکردووە، ئەوە باوەڕهێنانی دڵنیە.

﴿ ولكن قولوا أسلمنا ولما يدخل الإيمان في قلوبكم ﴾ وە بەڵام ئێوە ووتووتانە: ئێمە فەرمانبەرداری ئێوە و مل کەچی ئێوەین و جـەنگیان لەگـەڵ ناکـەین و، لـە ترسـی کوشـتن و داواکردنی زەکات باوەڕتان هیناوە بـەدەم، نـەك بـە دڵ، ئـەگینا داوای زەکاتتـان نەئـەکرد و، باوەڕی بێگومان نەچوەتە ناو دڵتان و، ئەتانەوێ خۆتان ڕزگاربکەن.

بۆ زانین: ووشەی (مؤمن) و ووشـەی (مسـلم) ماناکانیـان جیـاوازن، (مؤمن) بـە کەسێ ئەبێژرێ: ووڵامی هەموو فەرموودەکانی خودا و پێغەمەر بداتەوە، بەبێ ئەوەی مەبەستێکی خۆی تیدا بیت لـە دارایی و پلەوپایە، لـە کاتی گرانی و هەرزانیدا و، لـە کاتی جەنگ و ئاشتیدا. بەڵام (مسلم) بە کەسێ ئەبێژرێ خۆی بدا بە دەستەوە لـەبەر مەبەستێ، پەیوەندی بە جیهانەوە هەبێ، بە وینەی ئەو عەرەبانە هاتوون بۆلای پێغەمەر و داوای زەکاتی لێ ئەکەن و منـەتی ئەنینـە سـەر جەنگیان لەگەڵ نەکردووە.

﴿ وإن تطيعوا الله ورسوله لا يلتكم من أعمالكم شيئا إن الله غفور رحيم ﴾ وە ئەگەر ئێـوە پەیرەوی خودا و فروستادەی خودا بکەن بەنیازی پاکەوە بە بێ دووروویی، خودا هیچ شتێ لـە پاداشتی کارەکانی ئێوە کەم ناکاتەوە. بەڕاستی خودا لیخۆشـبوونی زۆرە بـۆ کەسـانێ تووشـی هەڵـەبوون، میهرەبانە بۆ ئەو کەسانەی پەشیمان ئەبنەوە لـە هەڵـەکانیان.

﴿ إنما المؤمنون الذين آمنوا بالله ورسوله ثم لم يرتابوا ﴾ بەڕاستی بـاوەڕداران کەسـانیکی ئەوتۆن باوەڕیان هیناوە بە خودا و بە پێغەمەری خودا، لـە پاشانە کەوتوونەتە گومان و، بەڕاستی باوەڕ جیگەی خۆی گرتبێ لـە دڵیانا لـە بارەی ئایینی خۆیانەوە.

﴿ وجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبيل الله أولئك هم الصادقون ﴾ وە بـۆ ڕاسـت گـیرانی باوەڕهێنانیان بە دانانی دارایی و گیانی خۆیانیان جەنگیان کردووە لـە ڕیگەی چەسپاندنی خـودا و یاساکانی قورئان، ئەو کەسانە ئەوانەن ڕاست ئەکەن لـە باوەڕهێناندا و گومانیان لێناکرێ.

﴿ قل أتعلمون الله بدينكم والله يعلم ما في السماوات وما في الأرض والله بكل شيء عليم﴾ عەرەبەکان ووتیان: ئێمە باوەڕمان هیناوە، خودا بە پێغەمەری فەرموو: تۆ بـەوان بلـێ: ئایا ئێوە هەواڵ ئەدەن بە ڕاستی ئەو ئایینەی لـە دڵی ئێوەدا، ئەتانەوێ خودا هەڵبخڵەتینن،خـودا ناخلەتێ و، ئەزانێ بە هەموو شتێ لـەناو ئاسمانەکان و لـەناو زەوی‌دایە و، بە هەموو شتێ ئەزانێ لـە نیازی پاك و لـە دووروویی و هەموو شتێ تر.

﴿ يمنون عليك أن أسلموا قل لا تمنوا علي إسلامكم ﴾ ئەو عەرەبانە ڕیز و چاکـەی خۆیـان دەرئەخەن بە سەر تۆدا کە موسڵمان بوون لـەبەر سوودی پێغەمەر، بـە زمـان نـەك بـە دڵ، بـە

شتیکی گەورەی دائەنینکە جەنگیان لەگەڵ تۆ نەکردووە، دەری ئەخەن نیازیان پاك نەبووە، تـۆ بلێ: ئیوە منەت مەکەن بەسەر مندا بەهۆی ئیسلام بوونتانەوە و، دەست دریژیتان نەکردووەتـە سەر من.

﴿ بل الله یمن علیکم أن هداکم للإیمان إن کنتم صادقین ﴾ بەلکو خودا منەت ئەکا بەسـەر ئیوەدا و چاکەی خۆی دەرئەبری بەسەرتانەوە کە شارەزایی ئیوەی کردووە بـۆلای باوەرهینـانی بیگومان، ئەگەر ئیوە راست بکەن بە نیازی پاکەوە باوەربهینن.

﴿ إن الله یعلم غیب السماوات والأرض والله بصیر بما تعملون ﴾ بەراستی خودا ئەزانێ بـە هەموو نهینیيەکانی ئاسمانەکان و زەوی، خودا هەرشتێ ئیوە بیکەن ئەیبینێ و ئەیزانێ گەورە بـن یا بچووك لەناو ئەم گەردوونەدا، پاداشتی هەمووتان ئەداتەوە بە گویرەی کـرداری خۆتـان لـە چاك و لە خراپ.

**بە یاریدەی خودا کۆتایی بە ماناکردنی ئەم سورەتە هات**

**( ٤ )ی مانگی جیمادی یەکەم سالی ( ١٤٢١ )ی کۆچی**

**بەرانبەر ( ٤-٨-٢٠٠٠ )ی زایینی**

# ﴿ سورەتی قاف ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن جگە لە ئایەتی (٣٨) هەندێ تریان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (٢٩) لە مەدینەهاتوونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٤٥) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ١ بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ
فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ ٢ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ
رَجۡعُۢ بَعِيدٞ ٣ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ
حَفِيظُۢ ٤ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ فَهُمۡ فِيٓ أَمۡرٖ مَّرِيجٍ ٥
أَفَلَمۡ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوۡقَهُمۡ كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا
وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٖ ٦ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ
وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ٧ تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِكُلِّ عَبۡدٖ
مُّنِيبٖ ٨ وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ جَنَّٰتٖ
وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ٩ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ١٠
رِّزۡقٗا لِّلۡعِبَادِۖ وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ ١١

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ ق ﴾ بۆ ماناکردنی ئەو پیتە و وێنەی ئەو پیتە تەماشای سەرەتای سورەتیئەلبەقەرە و سورەتەکانی تر بکەن، ماناکانیان ڕوونکراوەتەوە بۆتان.

﴿ وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ ﴾ سوێندم بەو قورئانەی خاوەنی گەورەیی و ڕێزە و پیرۆزی تێدایە بۆ هەموو ئادەمیزاد و، پلەی بەرزترە بەسەر هەموو نامەکانی پێشوودا، هەموو نامەکانی تردا، بەڕاستی ئێمە هەموو مردووەکان زیندوو ئەکەینەوە لە ڕۆژی دواییدا بۆ پرسیار و وەڵام وبۆ پاداشتی کردەوەکانیان.

﴿ بَلْ عَجِبُوا أن جَاءهُمْ مُنذِرٌ مِّنْهُمْ فَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا شَـيْءٌ عَجِيـبٌ ﴾ بـەڵکو بێبـاوەڕان سەریان سوڕئەمێنێ کە هاتووە بۆلایان پێغەمەرێ لە خۆیان و لـە ڕەگەزی خۆیان ئەوان ئەترسێنێ لە ئەنجامی کارەکانیـان، دوابـی بێبـاوەڕان ئـەڵێن: نـاردنی موحەمـەد بەتەنـها بـە تایبـەتی بـۆ پێغەمەرایەتی شتێکی سەیر و سەرسوڕهێنەرە.ئەبوایە لایان سەیر نەبووایە; چونکە ئەوان ڕاستی و زمان پاکی موحەمەدیان ئەزانی و بڕوایان بکردایە.

﴿ أئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ذَلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ ﴾ ئایا کاتێ ئێمە مردین و بوین بە خاك و ڕزاین ئێمـە زیندوو ئەکرێینەوە؟ ئەو گەڕانە وەیە بۆلای زیندووبوونەوەیەکی تـازە دوای مـردن زۆر دوورە، چونکە باوباپیرانمان شتی وایان نەدیوە.

﴿ قَدْ عَلِمْنَا مَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَابٌ حَفِيظٌ ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەزانین بـەو هـەموو ئەندامانەی ئەوان زەوی ئەیخوا و لـەناوی ئەبا، چۆنـی دروسـت کـردوون، هـەروایش ئـەتوانێ بیانگێڕێتەوە و بیانکاتەوە بە ئادەمیزادێکی زیندوو بە وێنەی جاری پێشوو، لـــە لای ئێمـە هەیـە نامەیە پارێزراو لـە گۆڕان و دەست کاری هەموو شـتێکی تێـدا تۆمـارکراوە، بـە جـۆرێ هیـچ پارچەیە لـە ئەندامی ئەوانی لا پەنهان نی‌یە.

﴿ بَلْ كَذَّبُوا بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءهُمْ فَهُمْ فِي أَمْرٍ مَّرِيجٍ ﴾ خودا ئەفەرموێ شـتێ خراپـتر لـەوانـەی پێشـوو ئـەڵێن: بـەڵکو ئـەوان ڕاسـتی قورئـان و پێغەمەرایـەتی تـۆ و زیندووبوونـەوە بـە درۆ ئەخەنەوەکاتێ ئەو ڕاستی‌یە چو بۆلایان دوایی ئـەو بێباوەڕانـە لـەناو کـارێکدان جیـاوازن لـە یەکتری و، درۆکانیان لـەسەر یـەکبار نیـە، چـاك و خـراپ جـوێ ناکەنـەوە، جـارێك ئـەڵێن: موحەمەد شاعیرە، جارێ تر ئەڵێن: پۆشەوێژ، جاری تر جادوگەرە، لـەسەر بیروباوەڕی ناوەستن.

بۆ زانین: بێباوەڕان ئەڵێن: زیندووبوونەوە نیە: چونکە ئەگەر پیاوێ‌پیاوێ تـر بخـوا، ئەگـەر ئەندامی خوراوەکە لە لەشی بخۆرەکەدا زیندووبکرێتەوە، پیاوەخوراوەکە زیندوو نەکراوەتـەوە، لە وولامدا ئەبێژرێ: ئەوەی زیندوو ئەکرێتەوە ئەو ئەندامانەیە کە لە پێشا درووستکراوەبۆ هەر یەکە لـەو دوو پیاوە، خودا ئەندامی هەریەکەیان جوێ ئەکاتەوە و زیندوویان ئەکاتەوە.

﴿ أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاء فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ ﴾ ئایـا بێبـاوەڕان کاتێ باوەڕیانبە خودا و بە زیندووبوونەوە نی‌یە بۆ دوایـی نـاڕوانن بـۆلای ئاسمـان لـەسـەرەوەی خۆیـان بـە جـۆرێ ئێمـە درووسـتمان کـــردووە و، بـــەرزمان کردۆتەوەبـەبێ کۆڵەکـە و، ڕازاندوومانەتەوە بە ئەستێرەکان و، بە جۆرێ هیچ جۆرە بۆشایی و درزێـك بـۆ ئاسمـان نیـە و، دروستمان کردووە و لکاوە بەیەکەوە. بە پێچەوانەی خانوویەك کە ئادەمیزاد درووستی ئەکات خشتەکانی لـەسەر یەك دائەنێ و بۆشایی لـە نێوانیاندایە.

بۆ زانین: خاوەنی تەفسیری (الجواهر - طنطـاوی) ئەفـەرموێ: ئـەو ئایەتـە ئاماژەیـە بـۆلای کارێکی پەك خەر بۆ بێباوەڕان، کە بەڕاستی بونەوەرێ هەیە پێی ئەوترێ (الأثیر) کە نەنکترە لە

هەوا، نەرمترە لە هەموو شتێ ئێمە ئەیبینین، لە ژوورەوەی هەموو شـتێکەوەیە، ئـەو بوونـەوەرە ئادەمیزاد نەیانزانیوە بە جگەی گەیشتنی ڕووناکی ئەستێرەکانەوە نەبێ بۆلای ئێمە، ئێوە بڕوانـن بۆلای ئەوەی چۆن گەیشتنی ئەو ڕووناکیە بەڵگەیە لەسەر ئەوشتە پێویستە هەبێ بـۆ ئـادەمیزاد ئەوەی ئەو ڕووناکییە هەڵگری ئەو شتەیش بریتییە لە (الأثیر). بۆ زۆرتر بەڵگە لەسەر توانای خوای مەزن: بەڕاستی ئەستێرەی وای هەیە ڕووناکییەکەی ئەگاتە لای ئێمە بە زۆرتر لە هەزار ساڵی ڕووناکی، زۆر ئاشکرایشە ڕووناکی خۆر ئەگاتە لای ئێمە بە (٨) چرکـە و (١٨)سـانیە، لەگەڵ ئەوەیشدا، دووری خۆر لە ئێمەوە، بە ئەندازەی ڕۆیشتنی قەتارێکە بۆلای خـۆر ئەگـەر بگونجێ بە (٣٦٥) ساڵ.

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە لەسەر بوونی (الأثیر) (معجـم المصطلحـات العلميـة والفنيـة) ئـەڵێ: (الأثیر) ووتەیەکی یۆنانیە، ناو ئەبرێ بە ڕەگەزێکی پێنجەم، جگەی (ئاو و هەوا و ئاگر و خاك) کە هەموویان سەرشۆڕی گەردوون و، نەبوونن لە دوارۆژدا. ئیتر بێباوەڕان چـۆن باوەڕنـاهێنن بە زیندووبوونەوەی دوای مردن کە زۆر ئاسانترە لە درووستکردنی ئاسمان بـەوجۆرەی باسـکرا و، لە هەموو بوونەوەرانی تر.

﴿ وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُـلِّ زَوْجٍ بَـهِيجٍ ﴾ وە ئێمـە زەویمـان ڕاخستووە و ئامادەمان کردووە بە جۆرێ ئێوە لەسەری دانیشن و، دامـان نـاوە لەسـەر زەوی چەن کێوێکی وەستاو، بۆ ئەوەی زەوی نەجوولێ و ئێوە تووشی ئازار بن، ئێمـە ڕواندوومانـە لە زەویدا جۆرە ڕووەکێکی جوان و جیاواز لە یەکتری، بە گەورەیی و بچووکی و تام و بـۆن و ڕەنگ.

﴿ تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴾ لەبەرئەوەی ئێمە توانـای خـودا و پـەند وەرگرتـن بـە گەورەیی خودا نیشانبدەین بە هەموو بەندەیە بگەڕێتەوە بۆلای خودا بە دڵ و نیازی پاکەوە.

﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاء مَاء مُّبَارَكًا فَأَنبَتْنَا بِـهِ جَنَّـاتٍ وَحَـبَّ الْحَصِيـدِ ﴾ وە ئێمـە ناردوومانەتـە خوارەوە لە ئاسمانەوە ئاوێکی پیرۆز و بە سوود، دوایی ئێمە پـەیدامان کـردووە و ڕواندوومانـە چەندین درەخت و جۆرەها باخ و میوە و، شینایییە شایانی ئەوەن درەو بکرێن و گەنم و جـۆ و چەڵتووك و نیسکی لێپەیدابێ.

﴿ وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ ﴾ وە ئێمەڕواندوومانە بـەهۆی ئـاوەوە درەختـی درێـژی خورما بەرەوژوور هەڵچووە، بۆ درەختی خورما هەیە چەن گوڵێ بەری ئەو درەختـە لەوانـەوە پەیدا ئەبێ، ئەو گوڵانە ئەوەندە زۆرن هەندێکیان بەسەر هەندێ تریانا دانراون، چین بە چین.

﴿ رِزْقًا لِّلْعِبَادِ وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا كَذَلِكَ الْخُرُوجُ ﴾ ئەوانـەمان هـەموو دروسـت کـردوون لەبەر خواردەمەنی بۆ ئێوەی بەندە ئێمە بۆ سودی ئێوە و، ئێمـە زیندوومـان کردوەتـەوە زەوی شارێکیو شکی بێسەوزایی بەو ئاوە، هەر بە جۆرەیـە هاتنـە دەرەوی ئێـوە بـە زیندویـی دوای

مردنتان. کەواتە ئادەمیزاد ئەخۆن و گەشە ئەکەن و ژن و مێردی ئەکەنو، بە زیندوویـی دایـك ئەبن و ئەمرن و دوایی زیندوو ئەکرێنەوە، ئەو شتانە هەموویان لـە ڕووەکدا هەن، ژیانیان تێدایە، ئەخۆن و گەشە ئەکەن و پەیدا ئەبن و ئەمرن، لـە پاشا زیندوو ئەبنەوە. کەواتە ئێـوە بـەراوردی خۆتان بکەن لـە زیندووبوونەوەدا لـەگەڵ زیندووبوونەوەی زەوێکی وشکی بێ‌شینایی.

كَذَّبَتْ
قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ﴿١٢﴾ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ
لُوطٍ ﴿١٣﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ
﴿١٤﴾ أَفَعَيِينَا بِٱلْخَلْقِ ٱلْأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِى لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٥﴾
وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ
مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ ﴿١٦﴾ إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ
﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتْ سَكْرَةُ
ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ذَٰلِكَ
يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ ﴿٢٠﴾ وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ ﴿٢١﴾ لَّقَدْ
كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ
﴿٢٢﴾

﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَابُ الرَّسِّ وَثَمُودُ ﴾ لە پێش قوڕەیشی‌یەکانەوە تـاقمی نـوح پێغەمەرەکەی خۆیان کە نوحی کوڕی شیسی کوڕی قابیلی کوڕی ئادەم بو بە درۆیان خستەوە و، دانیشتووانی لای ئەو بـیرەی یەمامـە کـە پێغەمەرەکـەیان شـوعەیب و، تـاقمی سـەمود کـە پێغەمەرەکەیان نسالّح بو، پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوە. زانایان بیروبۆچوونیان جیاوازە لە مەبست لـەووشەی (أصحاب الرس) هەندێکیان ئەڵێن: ناوی بیرێکە لـە یەمامە، هەندی تریان ئەڵێن: جێگەیە تری جگەی ئەوانە. هەرچۆنێ بێ مەبەستەکە ناگۆڕن.

﴿ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَانُ لُوط وَأَصْحَابُ الْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ كُلٌّ كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴾ وە تاقمی عاد کە پێغەمەرەکەیان هود بوو، فیرعەون و تاقمەکـەی کـە پێغەمەرەکـەیان مووسـابوو، برایانی خەزوورەی لـوت و، دانیشتووانی لای باخێکی چڕ و پڕ کە پێغەمەرەکەیان شوعەیب بوو

تاقمی توبەعی پاشای یەمەن، ئەو تاقمانە هەموویان پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستەوە، دوایی پێویست کرا بۆ ئــەوان ســزادانی ئێمــە و یارمــەتی پێغەمــەرەکانمان بدەیــن. کەواتــە موحەمــەد خزمەکانی تۆیش چاوەڕوانی سزای ئێمە بکەن.

• زانایان بیربۆچوونیــان جیــاوازە لــەبارەی توبەعــەوە، هــەندێکیان ئــەڵێن: مرۆڤێکــی خــوادا ناسبووە، هەندێ تریان لایان وایە پێغەمەر بووە، هــەرچۆنێ بووبــێ ئامۆژگاری کــەری خۆیانیــان بەدرۆخستەوە.

﴿ أَفَعَيِينَا بِالْخَلْقِ الْأَوَّلِ بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴾ ئایا دوایی ماندوو بێتوانا بووین لە دروستکردنی ئادەمیزاد وَ لە جاری یەکەمدا و بۆ یەکەم جار، بێگومان ماندو و بێتوانا نەبوین، هــەتا توانامــان نــەبێ زیندوویــان بکەینــەوە، ئــەوان بڕوایــان وایــە یەکــەم جــار ئێمــە ئــەوانمان دروستکردووە، بــەڵام ئــەوان بــۆ دروستکردن و زیندووبوونەوەیــەکی تــازە لــە گومــان و سەرگەردانیدان دوای مردن زیندوو بکرێنەوە.

﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيــدِ ﴾ وە بــە ڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان دروستکردووە و، ئێمە ئەزانین بە شتێ دێت و ئەڕوا بەدەروونیا و لە دڵیا ئەیڵێ و کەس پێی نازانێ و، ئێمە نزیکــترین لــە ئــادەمیزادەوە لــە شــادەمارەکانی ئــەم لاو لایملی، خودا لــە هەموئەندامەکانی ئادەمیزاد نزیکە. بەڵام ژیان و مانــەوەی ئــادەمیزاد زیــاتر بەهۆی ئەو دوو دەمارەوەیە. ئێمە نزیکترین لە ئادەمیزادەوە.

﴿ إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴾ کاتێ دوو فریشتە دانیشتبوون لــە لای ڕاست و چەپی ئەو ئادەمیزادەوە، کــە خــۆی و هــەموو کــار و گفتوگــۆی ئــەو بــەو فریشــتانە سپێردراوە کە بیاننوسن و وەری بگرن و بیان پارێزن، خودا پێویستی بــەو دوو فریشــتانە نییــە. بەڵام دەستووری خودا وایەبۆ پەك خستنی ئادەمیزاد.

﴿ مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴾ نایەتە دەرەوە لــە دەمی ئادەمیزادەوە هیــچ گفــت وگۆیە مەگەر فریشتەیەێ چاودێری کردەوەکانی ئــەکا و، ئامادەیــە لــەگــەڵیا و پاداشــتی چــاك و خراپی ئەنووسێ بگرە کاتی نەخۆشیشی ئەنوسێ. چاکەیە بکا بە (١٠) چەنانە، ئەینوسێ، ئەگەر خۆاپەیە بکا، بەو فریشتەیە ئەڵێ خراپە ئەنووسێ مەینووسە هەتا دوای حەوت کاتژمێر. بــەڵکو لەو ماوەیەدا داوای لێخۆشبوون بکات. کەواتە خوا ئادەمیزادی بۆ ئەوە درووســت نــەکردووە سزای بدات. بەڵکو بۆ ئەوەی درووستکردووە لە خراپە پاکیان بکاتەوە.

• هەموو ئادەمیزادێ تووشی ئازار بێ بۆ ئەوەیە ئامۆژگاری وەربگرن و چاکە بکەن و خراپــە نەکەن.

• بۆ زانین: ئەو دوو فریشتانە، ئەوەیان لە لای ڕاستە چاکە ئەنووسێ و، ئەوەیان لە لای چەپە پاداشتی خراپە ئەنووسێ، لــە ئــادەمیزاد جــوێ نابنــەوە لــەکاتی ژن و مێردایــەتی و لــە کــاتی سەرئاودا نەبێ.

کاتێ خودای مــەزن باســی بــاوەڕ نــەبوونی بێبــاوەڕانی بــۆ زیندووکردنــەوە کــرد، بــەوان ڕائەگەیەنێ ئەو شتەی ئێوە باوەڕتان بە بوونی نیە، بەم نزیکە بە ئێوە ئەگا و ئەفەرموێ:

﴿ وجاءت سكرة الموت بالحق ذلك ما كنت منه تحيد ﴾ وە سەختی و بێهۆشی مردن راستی زیندووبوونەوە بۆ ئیوە روون ئەکاتەوە، بە چاوی خۆتان زیندووبوونەوە ئەبینن و ناتوانن باوەرتان پیی نەبێ، ئەو زیندووبوونەوەیە شتیکە تۆ باوەرت پیی نەبووە، لە دەستی رات ئەکرد و وات ئەزانی توشت نابێ.

﴿ ونفخ في الصور ذلك يوم الوعيد ﴾ وە فو ئەکرێ بە سوردا بۆ زیندووبوونەوە، ئەو کاتە رۆژیکی ئەوتۆیە خودا بەلێنی داوەسزای بێباوەرانی تیدا بدا. سور شتیکە وینەی کەرەنا، فوی پیدا ئەکرێ بۆ ئەوەی ئادەمیزاد خۆیان ئامادەبکەن بۆ پرسیار و پاداشت و سزا و وولاّم.

﴿ وجاءت كل نفس معها سائق وشهيد ﴾ وە هەموو کەسێ لەو رۆژەدا ئەروا بۆلای دەشتی کۆبوونەوە، لەگەلیایە فریشتەیە لیی خوری بۆلای پرسیارلی کردنی و، فریشتەیە شایەتی ئەدا یا بۆ سودی ئەو کەسەیە یا بۆ زیانی.

﴿ لقد كنت في غفلة من هذا ﴾ بەراستی تۆ ئەی ئادەمیزاد بێئاگا بووی لە جیهاندا لە شتێ تۆ تووشی ئەبێ لەم رۆژەدا لەم کارە سەخت و سامناکانە. بەخواردن و خواردنەوە و رابواردندا خەریك بووی.

﴿ فكشفنا عنك غطاءك فبصرك اليوم حديد ﴾ دوایی ئیمە پەردەی بێئاگای و نەزانینمان لەسەرتۆ لابرد و، بەسروش و قورئان هەموو شتیکمان بۆ تۆ روون کردیتەوە، دوایی چاوی تۆ تیژکراوەتەوە، ئەمرۆ هەموو شتێ لەوانەی تۆ باوەرت پیی نەبوو ئەیبینی و بۆت دەرئەکەوێ.

وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ ﴿٢٣﴾ أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ
عَنِيدٍ ﴿٢٤﴾ مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ ﴿٢٥﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا
ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِي ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ
وَلَٰكِن كَانَ فِي ضَلَٰلٍۭ بَعِيدٍ ﴿٢٧﴾ قَالَ لَا تَخْتَصِمُواْ لَدَيَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ
إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ ﴿٢٨﴾ مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٢٩﴾
يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴿٣٠﴾ وَأُزْلِفَتِ
ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ
﴿٣٢﴾ مَّنْ خَشِيَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴿٣٣﴾ ٱدْخُلُوهَا
بِسَلَٰمٍ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ ﴿٣٤﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴿٣٥﴾

﴿ وقال قرينه هذا ما لدي عتيد ﴾ وە ئـەو فریشـتەیە خراپـەی ئـەو کەسـەی پێسپێردراوە بێفەرمانی خودای‌کردووە، ئەلێ: ئەو شتەی ئەوتۆ لای منــە کردەوەکـانی تـۆ ئامـادەکراوە و، هەمووی نووسراوە، خودا فەرمان ئەدا بە فریشتەی لیخور و فریشتەی شاهید:

﴿ ألقيا في جهنم كل كفار عنيد مناع للخير معتد مريب ﴾ ئیوە هەموو بێباوەڕێ بـــەردەوام بوو لـەسەر بێفەرمانی خودا \، باوەر بە چاکەی خودا نەبووە و سوپاسـی خـودای نـەکردووە و فرەی بدەنە ناو دۆزەخ، خۆی چاکەی نەکردووە و، نەی هیشتووە جگەی خۆیشی چاکە بکـا، دەست دریژی کردووەتە سەر ئادەمیزاد، گومانی هـەبووە لـەو سـزایەی ئامـادەکراوە بـۆ ئـەو کەسانە بێفەرمانی خودایان کردووە.

﴿ الذي جعل مع الله إلها آخر فألقياه في العذاب الشـديد ﴾ ئـەو کەسـەی ئـەوتۆ داینـاوە لـەگەڵ خودا خودایەکی تر ئیوە ئەو کەسە بخەنە ناو سزایەکی زۆر ســەخت و بـەردەوام و بـێ بەراورد.

﴿ قال قرينه ربنا ما أطغيته ولكن كان في ضلال بعيد ﴾ ئەو هاورێ خراپەی ئەوتۆ هانی ئـەو بێباوەرەی ئەدا لـەسەر بێفەرمانی خودا ئەلێ: ئەی پەروەردگارم: مـن ئـەوم نەخسـتووەتە نـاو بێفەرمانییەوە، بەلاَم خۆی لـەخۆیا لـەناو گومرایی زۆر ئاشکرادابووە، بە جـۆری پیویسـتی بـە لادانی من بۆ خۆی نەبوە، خۆی لـە خۆیا خراپەکار بوە.

﴿ قال لا تختصموا لدي وقد قدمت إليكم بالوعيد ﴾ خودا فەرموی: ئیوە لـە بەردەمی منــدا لـەم رۆژەدا دژایەتی یەکتری مەکەن و، گفتوگۆی نابەجی مەکەن، هیچ کام لـە ئیوە کەمتر نــین لـەوی ترتان و، لـەمەوبەر لـە جیهاندا ئیوەم ترساندوە بە سزای سەخت ئەگەر بەردەوامبن لـەسەر بی فەرمانی، ئیتر بیانوتان نەماوە.

﴿ ما يبدل القول لدي وما أنا بظلام للعبيد ﴾ ناگۆرری شتی من بۆ ئیوەم رون کردۆتەوە لـە جیهاندا، بە ئومیدی ئەوە مەبن گفتوگۆ لای من بگۆری و، من ستەم لــە بـەندەی خـۆم ناکـەم پاراستنی چاکەی لـە خواترسان ئەدەمەوە، سزای ئەو کەسانە ئەدەم بی فەرمانی من ئەکەن.

﴿ يوم نقول لجهنم هل امتلأت وتقول هل من مزيد ﴾ تۆ بیری ئەو رۆژە بکـەرەوە ئیمـە بـە دۆزەخ ئەلیین : ئایا تۆ پربوی لـە تاوانباران بە جۆری من بەلینم داوە تۆ پر ببیو، دۆزەخ ئـەلی: ئەگەر تاوانباری تر هەن، دوایی من ئامادەم بۆ پیشوازی کردنیان، فەرمان بدە بخرینە ناوم جیگەم ماوە.

﴿ وأزلفت الجنة للمتقين غير بعيد هذا ما توعدون لكل أواب حفيظ ﴾ وە بەهەشـت نزیـك ئەخریتەوە بۆ ئەو کەسانەی لـە خودا ترساون و، خۆیانیان پاراستوە لـە بـی فـەرمانی خـودا، لـە جیگەیەکی دور نییەو بۆ ئەوان بەوان ئەبیژری : ئەو پاداشتە ئەو شتەیە ئیوە بەلینتان پی دراوە، ئەدری بە هەمو کەسی بەزۆری لـە بی فەرمانی ئەگەریتەوە، سنورەکانی خودا ئەپاریزی.

﴿ من خشي الرحمن بالغيب وجاء بقلب منيب ادخلوها بسلام ذلـك يـوم الخلـود لـهم مـا يشاؤون فيها ولدينا مزيد ﴾ هەر کەسی لە خودای خاوەن بەخشندە بترسی، لەگـەڵ ئەوەیشـدا خودای نەبینیوە، بە نیازیکی پاك و بە دلیکی خاوینەوە بگەریتەوە بۆ لای خوداو رو بکا بۆ لای پەرستنی خودا، بەو کەسە ئەبیژری: ئیوە بچنە ناو بەهەشت بەبی ترس لــە سزای خـودا، ئـەم رۆژە رۆژی بەردەوامی ئیوەیە لە ناو بەهەشت، بۆ ئـەو کەسـانە هەیـە لـە بەهەشـت هەرشتی ئارەزوی بکەن و، لە لای ئیمە هەیە زۆرتر لەوەیش ئارەزوی بکەن.

وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا۟ فِى
ٱلْبِلَٰدِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ
لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا
مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ
قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ
وَأَدْبَٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ
﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا
نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ
عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ
وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾

﴿ وكم أهلكنا قبلهم من قرن هم أشد منهم بطشا فنقبوا في البلاد هل من محيص ﴾ وە ئیمە لە پیش ئەو تاقمەی دانیشتوانی مەکە زۆر کاتی ترمان لە ناو بردن کە پیغەمبەرەکانی خۆیانیــان بەدرۆ ئەخستەوە، ئەوان زۆر بەهیزتر بون لە دانیشتوانی مەکە، دوایی ئەوانەی پیشـو ئەگـەران بە ناو شارەکان دا بۆ بازرگانی و، زۆر جیگەی ئەو شـارانە ئەگـەران، ئایـا راکـردن ئـەبی لــە دەست مردن؟ ئایا ئەو تاقمەی تۆ ناترسن توشی ئەوان ببی سزایە بە وینەی سزای ئەوانەی پیشو، هیزو توانایان نەگەیشتنە فریایان.

﴿ إن في ذلك لذكرى لمن كان له قلب أو ألقى السمع وهو شهيد ﴾ بەراستی لـەوەی ئیمـە باسمانکرد لـەناوبردنی ئەو کەسانەی پیغەمەرەکانی خۆیانیـان بەدرۆئەخسـتەوە ئامۆژگـاریکردنی تەواوە بۆ کەسێ دلیکی وورپای هەبێ و، بیربکاتەوە لـە فەرمانەکانی خودا و، یا گوێ بگرێ لـە فەرموودەی قورئان و، تەمێ خواربێ و، ئەو کەسە دلی لای خۆی بێ و، بێئاگـا نـەبێ پیـش وازیبکا لـە شتێ ئەیبیسێ و سودی لیوەربگرێ.

﴿ ولقد خلقنا السماوات والأرض وما بينهما في ستة أيام وما مسنا من لغوب ﴾ وە ئیمـە ئاسمانەکان و زەوی و شتێ لـە نیـوان ئاسمانـەکان و زەویـدان لــە بوونـەوەرانی سەرسـورهینەر، دروستمان کردوون لـە ماوەیوینەی شەش رۆژدا و، بەشەش نۆرە و، هیچ ئازار و ماندووبوونێ توشی ئیمە نەبووە.

﴿ فاصبر على ما يقولون وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس وقبل الغروب ﴾ دوایـی تـۆ ئارام لـەسەر شتێ بگرە بت پەرستان ئەیلین بەتۆ، شتی ناشایستە ئەدەنە پالْخودا و، بروایان بــە زیندووبوونەوە نیە، خودا ناتوانێ بوونەوەران زیندووبکاتەوە دوای مردنان و، تۆ یادی خودا بکە و سوپاسی پەروەردگاری خۆت بکە بــەر لــە هــاتنی خۆربـەکردنی نویـژی بـەیانی و، بـەر لــە ئاوابوونی خۆر بەکردنی نویژی نیوەرۆ و عەسر.

﴿ ومن الليل فسبحه وأدبار السجود ﴾ وەە دوایی نویژ بکە بۆ خودا لـە هەندێ کاتی شەودا بەکردنی نویژی مەغریب و عیشا و، شەونویژ بکە بۆ خودا، دوای ئەو نویژانە پیویسـت کـراوە کردنیان.

﴿ واستمع يوم يناد المناد من مكان قريب ﴾ وە تۆ گوێ بگرە لـە باسی شتێ ئیمە بە سروش هەوالماندا، بەتۆ لـە سامناکی و ترسی رۆژی دوایـی، ئـەو رۆژەی جـبرەئیل رای ئەگەیـەنێ بـە ئادەمیزاد لـە جیگەی زۆر نزیکەوە، بەجۆرێ هەموو ئادەمیزاد ئەیبیسێ و، ئیسـکە رزیوەکـان و دەمار لـە یەك بچراوەکان: ئیوە بە فەرمانی خودا و توانای ئەو زیندوو ببنەوە.

﴿ يوم يسمعون الصيحة بالحق ذلك يوم الخروج ﴾ ئەو رۆژە رۆژیکە بوونــەوەران دەنگـی راستی ئیسرافیل بۆ زیندووبوونەوەی ئادەمیزاد ئەبیسن لـە جـاری دووهـەمدا. ئـەو رۆژە رۆژی هاتن دەرەوەی مردووەکانە بە زیندوویی لـە گۆرەکانیانا بۆ پرسیار و بـۆ وەرگرتنـی پاداشـت و تۆلـە.

﴿ إنا نحن نحيي ونميت وإلينا المصير ﴾ بە راستی ئیمە گیـانداران زینـدوو ئەکەینـەوە لـە جیهاندا، دوای ئەوەی نەبوون و، ئیمە ئەوان ئەمرینین دوای تەواوبوونی تەمەنیان و، بۆلای ئیمە ئەگەرینەوە لـە رۆژی دواییدا بۆ پرسیار و وولام و، وەرگرتنی پاداشتی کارەکانیان.

﴿ یوم تشقق الأرض عنهم سراعا ذلك حشر علینا یسیر ﴾ رۆژیکە زەوی ئەشـــکێ و پارچـە ئەبێ و، دوور ئەکەویتەوە لـە ئادەمیزاد و، بە پەلـە دینە دەرەوە لـە ناو زەویدا، زیندووکردنەوەی ئادەمیزاد لـە گۆرەکانیانا کۆکردنەوە و هەلسانی ئەوانە، زیندووکردنـــەوەیان و رەوانـەکردنیان بۆلای جیگەی پرسیار و وولام، ئەوانە هەموویان کاریکی ئاسانن لـەسەر ئیمە، ئیتر تۆ گرنگی بە گفتوگۆی ئەوان مەدە، ئەلین: ئیمە زیندو ناکریینەوە.

﴿ نحن أعلم بما یقولون وما أنت علیهم بجبـار فذکـر بـالقرآن مـن یخـاف وعیـد ﴾ ئیمـە زاناترین لـە تۆ بەشتێ بێباوەران ئەیلین و، بروایان بە زیندووبوونەوە نیە و، دەستەلاتی ئـــەوەت نیە، زۆریان لێبکەی پەیرەوی تۆ بکەن، دوای تۆ بە یاساکانی قورئان ئامۆژگاری کەسێ بکە لـە سزای من و لـە شتێ من بۆم ئامادەکردووە لـە سزای خۆم بۆ کەسێ بێ فەرمانی من بکا.

# ﴿ سورەتی زاریات ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەوی ئایەتەکانی (٦٠) ئایەتن.



﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ والّزارياتِ زَوْراً ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بەو بایانە خاك و خۆڵ و جگەی ئەوان پەراگەندە ئەکات هەر یەکەیان بۆلایە بە پەراگەندەیەکی زۆر سەرسوڕهێنەر، یا من سوێند ئەخۆم بەو ژنانەی منالّیان ئەبێ و بلاّوی ئەکەنەوە بەڕووی زەویدا، یا سوێند ئەخۆم بە شتێ ئادەمیزاد و فریشتەکان لە یەك جوێ ئەکەنەوە.

﴿ فَالْحَامِلَاتِ وِقْرًا فَالْجَارِيَاتِ يُسْرًا فَالْمُقَسِّمَاتِ أَمْرًا﴾ دوایی من سوێند ئەخۆم بەو هەورانەی قورسایی ئاویان هەڵگرتووە، بەو کەشتیانە ئەڕۆن بەناو ئاودا بە ڕۆیشتنێکی ئاسان، بەو فریشتانە فەرمانەکانی خودا بەش نەکەن بەناو بوونەوەراندا، بەو جۆرەی خودا فەرمانیان پێ ئەدا.

هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئەو چوار شتانەی پێشوو هەموویان ئیش و کاری بایەکانن: هەربایە تۆز و خۆڵ بلاّوئەکەنەوە، هەربایە هەڵگری قورسایی هەوری پڕ لە ئاو، هەر بایەکانن بە ئاسانی ئەڕۆن و ئەو هەورانە هەڵئەگرن، هەر بایەکانن باران بەش ئەکەن بەسەر هەموو ڕووی سەر زەویدا.

﴿ إنما تُوعَدُونَ لصادِقٌ وَإنَّ الدِيْنَ لَواقِعٌ ﴾ سوێند ئەخۆم بەوانە هەموو: بەڕاستی شتێ بەڵێنی پێ دراوە بە ئێوە لە پەیدابوونی ڕۆژی دوایی ڕاستەو، گومانی تێدانیەو، پرسیارو پاداشت بێگومان هەیەو ئەبێ.

خودای مەزن بە تایبەتی سوێندی خواردوە بەو چوار شتانە، لەبەرئەوەی خاوەنی سودی زۆرن و، هۆی گەشەکردنی زیندەگانی گیاندارانن، بەجۆرێ سودیان بۆ ئێمە ناژمێررێن و، بەڵگەی ئاشکران لەسەر توانای خودا، هەریەکە لەو چوار شتانە سودی تایبەتی خۆیانیان بۆ دیاری‌کراوە، بۆیە پێویستە ئێمە سوپاسی خودا بکەین.

﴿ وَالسَماء ذاتِ الْحُبكُ إنَكُمْ لَفي قَوْل مُخْتَلِفٍ ﴾ من سوێند ئەخۆم بەو ئاسمانەی خاوەنی چەندین ڕێگەی جۆراوجۆرە بۆ هاتوچۆی ئەستێرەکان، زۆر بە جوانی دروست کراوەو، خاوەنی پەیرەوێکی زۆر شیر نیە، بەهۆی ئەستێرەکانەوە ڕازێنراوەتەوە، بە جۆرێ جێگەی ئەوەیە بیری لێ بکرێتەوەو، بکرێ لەسەر توانای خودا، سوێندم بەو ئاسمانەی بەو جۆرە سەرسوڕێنە دروست کراوە ئێوە لەناو گفتوگۆی پڕوپوچ دژی یەکترین، بیروبۆچونێکتان هەیە هەندێ ترتان بەدرۆ ئەخەنەوە لە بارە پێغەمەرو قورئانەوە: جارێ ئێوە ئەڵێن: جادوگەرە، قورئان جادوە، جارێ تر ئێوە ئەڵێن: موحەمەد هۆنراوە بێژەو قورئان هۆنراوەیە، یا نوسراوی پێشوانە، بێگومان ئەو گفتوگۆیەی ئێوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەسەر یەکبارنین و، ترختان بۆ دانەنرێ.

﴿ يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أفِكَ قُتِلَ الْخَرّاصُونَ الذيْنَ هُمْ في غَفْلَةٍ ساهُونَ ﴾ لە ڕاستی و لە ئایین لادراوە کەسێ بەهۆی ئارەزۆو نەزانینی خۆی لە ڕاستی و ئایین لادراوە، لەناوچوون و بێ بەش کراون لە میهرەبانی و بەزەیی خودا ئەو بێ باوەڕو درۆزنانەی ئەوتۆ، ئەو کەسانە لەناو نەزانینا داپۆشراون، بێ ئاگان لە شتێ فەرمانیان پێدراوە، بە گۆترە کاری و بەبێ بەڵگە گومانی خۆیان بەشکردوە لە بارەی خودای مەزن و ڕۆژی دواییەوە: ئەڵێن: بتەکان هاوبەشی خودان و، جنۆکە و فریشتەکانی کچی خودان، زیندوبونەوە گفتوگۆیەکی پڕوپوچە.

﴿ يَسْألُونَ أيانَ يَوْمَ الدِين يَوْمَ هُمْ عَلى النار يُفْتَنُونَ ﴾ پرسیار ئەکەنس و ئەڵێن: ئەی موحەمەد: چ کاتێ ڕۆژی پاداشت و زیندوبونەوە پەیدا ئەبێ، خودای گەورە وولامیانس ئەداتەوەو ئەفەرموێ: زیندوبونەوە لە ڕۆژێکا پەیدا ئەبێ ئەوان نومایش ئەکرێن بەسەر ئاگری دۆزەخداو، لەناو ئاگردا سزای یان ئەدرێ، فریشتەکان لەو ڕۆژەدا بە تاوانباران ئەڵێن:

﴿ ذُقوا فِتْنَتِكُمْ هذا الذي كُنْتُمْ بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ﴾ ئێوەی بێ باوەڕو گوترە باز بچێژن سزای خۆتان، ئەمە ئەو سزایەی ئەوتۆ بە ئێوە بەدرۆتان ئەخستەوەو، داواتان ئەکرد ئەو سزایە بە گورجی لە جیهاندا بێت بۆ لاتان.

إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ
وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ
﴿١٦﴾ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ

﴿١٨﴾ وَفِيٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾ وَفِى ٱلْأَرْضِ ءَايَٰتٌ
لِّلْمُوقِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٢١﴾ وَفِى ٱلسَّمَآءِ رِزْقُكُمْ
وَمَا تُوعَدُونَ ﴿٢٢﴾ فَوَرَبِّ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ إِنَّهُۥ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَآ أَنَّكُمْ
تَنطِقُونَ ﴿٢٣﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَٰهِيمَ ٱلْمُكْرَمِينَ ﴿٢٤﴾
إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَٰمًا ۖ قَالَ سَلَٰمٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٢٥﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ
أَهْلِهِۦ فَجَآءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ ﴿٢٦﴾ فَقَرَّبَهُۥٓ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ
﴿٢٧﴾ فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا۟ لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٍ
﴿٢٨﴾ فَأَقْبَلَتِ ٱمْرَأَتُهُۥ فِى صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ
﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٠﴾

﴿ إنَ الْمتقين في جناتٍ وَعُيونٍ أخذينَ ما آتاهُمْ ربُهُمْ إنهُمْ كانُوا قَبْلَ ذلِكَ مُحْسِنِينَ ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی لە خوا ترساون و خۆیانیان پاراستوە لەبێ فەرمانی خوا، لە ناوچە چەندین بەهەشت و لەلای چەندین کانیاوی ئاوی شیرین و زۆر خۆشدان، ئەو شتەی لە پاداشتی کردارەکانیانا پەروەردگاری خۆیان بەوانی بەخشیوە وەری ئەگرن و زۆریان پێ خۆشە، بەڕاستی ئەو کەسانە بەر لەوەی بێن بۆلای بەهەشت کردەوەی چاکیان کردووە لە جیهاندا.

﴿ کانُوا قَلِيلاً مَنَ الَيْلِ ما يَهْجَعُونَ وَبالأسْحار هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾ هەندێکە لە کارە چاکەکانیان، ماوەیەکی کەم لە شەودا خەوتوون و، خەریکی پەرستنی خوادا بوون و، لە شەش یەکی کۆتایی شەویشدا داوای لێ خۆشبونیان لە پەروەردگاری خۆیان کردووە. وە هەندێ تر لە چاکەکانیان.

﴿ وَفِي أمْوالِهِمْ حَقٌ لِلسائِلْ وَالْمَحْرُومِ ﴾ و لەناوداراى خۆیانا بەشێکیان پێویست کردبوو لەبەر ڕەزامەندی خوداو بەزەییان بە ئادەمیزادا، بیدەن بە هەرێ داوای بەشی خۆی بکا لە دارایی ئەوان و، بیدەن بە کەسێ داوای نەکردووەو بە ساماندداریان زانیووە.

﴿ وَفي الأرْضِ آياتٌ لِلْمُوقِنِينَ وَفيس ألفُسِكُمْس أفَلاس يُنصِرُونَس ﴾ وە لە زەویدا چەندین کانگاو گیاندارو ڕوەك و شتی تری سەرسوڕێنەرو، لە لەش و دەرونی خۆتانا کە لە تۆوێکی پیاوێ ئێوە پەیدابوون و بوون بە خاوەنی ئەقڵ، لەوانەدا چەندین بەڵگەی ئاشکرا هەن بۆ کەسانێکی ئەوتۆ بڕوای بێگومانیان بەخوا هەبێ بیکەن بە بەڵگە لەسەر توانای خودا. ئایا ئێوە دوایی بۆ بیرناکەنەوەو تەمێ و ئامۆژگاری وەرناگرن.

تەفسیری زمناکۆیی

﴿ وَفِي السَّماءِ رِزْقُكُمْ وَما تُوعَدونَ ﴾ وەلە ناو ئاسماندایە هــۆی پــەیدابوونی خواردەمــەنی و ژیان ئێوە وەك بارانبی و، هەر لـە ئاسمانەوە فەرمان ئەدرێ بە شتێ بەڵێنی پێدراوە بکرێ لـەگـەڵ ئێوە لـە چونتان بۆناو بەهەشت یا بــۆلای دۆزەخ. بێگومـان هـەموو شـتێ خـودا لــە ئاسمانــەوە فەرمانی پێ ئەدا.

بۆ زانین: هەر کەسێ بە باشی بیر بکاتەوە لـە دروست کردنــی بونــەوەران، بــە تایبــەت لــە چۆنیەتی دروستکردنی ئادەمیزاد، بەو هــەموو زانیارییــەو هەیــەتی، ئــەبێ بڕیـاری ئــەوەیش بـدا هێزێکی زۆر بە توانا هەیە جگەی بونەوەران دروست کەری هەموو شتێکە، ئەوەیشە هەر خوای تەنها و بە توانایە.

ئەگەر کەسێ بڵێ: هەرشتێ هەستی پێ نەکرێ و نەخرێنە بەر تاقی کردنە، ناگونجێ بڕیار بــە بوونی بدرێ، لـە وەڵامدا ئەبێژرێ: ئایا تۆ خاوەنی ئــەقڵی بانــە، بێگومـان ئـەڵێ: مـن خـاوەنی ئەقڵم، خۆڕون و ئاشکرا ئەقڵ هەستی پێ نــاکرێ و ناخرێتــە ژێـر تـاقی کردنــەوەو، کەسـیش ناتوانێ بڵێ: ئەقڵ نیە. کەواتە ناشتوانرێ ببێژرێ خودا نیە کــە هــەر ئەویشــە ئــەقڵی دروســت کردووە.

﴿ فَوَرَبِّ السَّــماءِ وَالأَرْضِ إِنَّـهُ لَحَــقٌّ مِثْـلَ مـا أَنَّكُـمْ تَنْطِقُـونَ ﴾ دوایــی ســوێند ئــەخۆم بــە پەروەردەکەری ئاسمان و زەوی، ئەوەی بەڵێنی پێ دراوە بە ئێوە ڕاستە بە وێنەی گفتوگۆکردنی ئێوە، هەرچۆنێ ئادەمیزاد گومانی لەوەدا نیە گفتوگۆ ئەکا، پێویستە بڕوای بــە پــەیدابوونی ئــەو شتەیش هەبێ بەڵێنی پێ دراوە بە ئێوە.

ئەو شتەی جێگەی سەر سوڕمانی ئێمە بێ، ئەبێ چ شتێ بێ خەشمی خودای جوڵاندبێ، ئــەو سوێندە گەورەیە بخوا؟ لە وەڵامدا: بێگومان لـە ئادەمیزادو جنۆکەدا کەسێ وابــێ شــەرم هــەن، گفتوگۆو کاری وا ناشایستەو ئەکەن ئەبنە هۆی جوڵاندنی خــەشمی خــودای خـاوەن میـهرەبان، وەك ئەوەی ئەڵێن: خودا کوڕو کچ و هاوبەشی هەیەو، بڕوایان بە زیندووبوونەوەو توانای خودا نیە.

لـە کردەوەو بەسەر هاتی دانیشتوانی کاتەکانی ڕابوردودا، زۆر شتی وابــوون بەڵگــە بــوون لـەسەر توانای خودای گەورە، وەك خودا ئەفەرموێ:

﴿ هَلْ أَتاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْراهِيمَ الْمُكْرَمِينَ ﴾ ئایـا هـاتوە بـۆلای تـۆ باسـی مێوانــە ڕێـز لێ گیراوەکانی ئیبراهیم لـەلایەن خوداو لـەلایەن ئیبراهیم و ژنەکەیەوە، چونکــە خــۆی و ژنەکــەی خزمەتیان ئەکردن، ئەو مێوانانە (١٢) فریشتە بوون لـە شێوەی ئادەمزادا، چون بۆلای ئیــبراهیم مژدەی بدەنێ خودا کوڕێکیان ئەداتێ و، هەواڵی لـەناوبردنی تاقمەکەی لوتیشی بدەنێ.

﴿ إِذْ دَخَلُوا عَلَى إِبراهِيمَ فَقالُوا سَلاماً قالَ سَلامٌ قَوْمٌ مُنْكَرُونَ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتــە بکــەرەوە ئــەو میوانانە چونە لای ئیبراهیم، دوایی ووتیان: ئێمە سڵاو لـە تۆ ئەکەین، ئیــبراهیم ووتــی: ســڵاوی من لـەسەر ئێوەبێ، ئێوە تاقمێکی بێگانەن من ناتان ناسم، ئێوە خۆتانم پێ بناسێنن.

﴿ فَراغَ إلى أهْلِهِ فَجاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ فَقَرَّبَهُ إلَيْهِمْ قالَ ألا تَأكُلُونَ ﴾ دوایی ئیبراهیم بە نهێنی و بە جۆرێ میوانەکان نەزانن چوو بۆلای خێزانەکەی فەرمانی پێدان خواردن ئامادە بکەن بۆ ئەو میوانانە، دوایی چو بۆلای میوانەکان بە گوێرەکەبە برژاوی قەڵەوەوە، نزیکی کردەوەو، لەبەر دەمیانا دای ناو نەیان خوارد، ووتی ئایا ئێوە بۆ گۆشتی ئەو گوێرەکەیە ناخۆن.

﴿ فَأوْجَسَ مِنْهُمْ قالُوا لا تَخَفْ وَبَشَّرُوهُ بِغُلامٍ عَلِيمٍ ﴾ دوایی ئیبراهیم لە دەرونی خۆیا هەستی بە ترس کرد، هەر میوانێ نانی نەخواردایە گومانی خراپەی لێ ئەکرا بە گوێرەی دەستوری ئەو کاتە ووتیان تۆ مەترسە، ئێمە نێرراوی خوداین، نیازی خراپەمان لێ ناکرێ و موژدەیان بە ئیبراهیم دا بە کوڕێکی زۆر زانا، کە خودا بەوی ئەبەخشێ، ناوی ئەنرێ بە ئیسحاق.

﴿ فَأقْبَلَتِ امْرَأتُهُ في صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهها وَقالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ ﴾ دوایی خاتون سارای ژنی ڕوی کرد بۆلای خانوەکەی خۆیان و دەستی کرد بە هاتوچۆو، بە دەنگی بەرزەوەو بەسەر سورمانەوە، دوایی لە خۆشیانا دای لە ڕومەتی خۆی بە پەنجەی دەستی و، ووتی: چۆن من منالم ئەبێ، من پیرەژنێکی نەزۆکم؟.

﴿ قالُوا كذلكَ قالَ رَبُّكِ إنَّهُ هُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ ﴾ فریشتەکان ووتیان: هەر بەو جۆرەیە ئێمە ووتمان و هەواڵمان دا بەتۆ، پەروەردگاری تۆ فەرمویێتی و ئێمە هەواڵی ئەو کارە ئەدەین، خودا خاوەنی توانایە. بەڕاستی خودا هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، ئەزانێ بەوەی تۆ نەزۆکی. بەڵام کاری خودا بەو جۆرەیە ئەفەرموێ: ببە. ئەو شتەیش ئەبێ.

**بە یاریدەی خودا کۆتایی پێ هات (٦)ی مانگی جیمادی یەکەم**
**ساڵی ( ١٤٢١ ای کۆچی بەرابەر بە (٦١/٨/٢٠٠٠)ای زایینی.**

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان. سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ پـەروەردگاری هـەموو بونەوەران. درودی خودا لـەسەر پێغەمەرو یارویاوەران و خێزان و ئومەتی بێ.

قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ
مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ
لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا
فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ
ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ وَفِى مُوسَىٰٓ إِذْ أَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَٰنٍ
مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ
فَنَبَذْنَٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ وَفِى عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلرِّيحَ
ٱلْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَىْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾
وَفِى ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُوا۟ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْا۟ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ
فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا ٱسْتَطَٰعُوا۟ مِن قِيَامٍ
وَمَا كَانُوا۟ مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا
فَٰسِقِينَ ﴿٤٦﴾

﴿ قالَ فَما خَطْبُكُمْ أيها الْمُرْسَلونْ قالوا إنّا أرْسَلْنا إلى قَوْمٍ مُجْرمينَ ﴾ ئیبراهیم ووتـی بـە فریشتەكان: ئێوە چ كارێكتان هەیەو بۆ چ كارێ نێرراون ئـەی نێرراوەكـان لـەلایـەن خـوداوە. فریشتەكان ووتیان: بەڕاستی ئێمە ڕەوانەكراوین بـۆلای تـاقمێكی تاوانبار، كـە تـاقمی لوتـن، كارێكی زۆر بێز لێ كراو ئەكەن، هیچ كەسێ بەر لـەوان ئەو كارەی نەكردووە.

﴿ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجارَةً مِنَ طِينٌ مُسَوَّمَةً عِنْـدَ رَبـكَ لِلْمُسْرِفينْ ﴾ بـۆ ئـەوەی ئێمـە بڕێژیـن بەسەریانا بەردێ لـە قوڕێكی سورۆكراو، بـە دەسـتوری خـودا لـەناویان ببـەین، ئـەو بەردانـە نیشانەكراون و ئامادەكراون لـەلایەن پەروەردگاری تۆو بـۆ لـەناوبردنی ئـەو تاقمـە لـە سنور دەرچوون و، كارێكی زۆر ناشایستە و بێز لێ كراو ئەكـەن كـە تاقمەكـەی لوتـن، دانیشـتوی گوندی سەدومن.

﴿ فَأَخْرَجْناهُ مَنْ كانَ فِيها مِنَ الْمُؤْمِنِينْ. فما وَجَدْنا فِيها غيرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾ دوای ئەوەی ئێمە چوینە ناو ئەو گوندە، ئێمە هەر کەسێ لە باوەڕداران لەو گوندەدابن دەریان ئەکەین، بۆ ئەوەی تووشی سزانەبن، بەو جۆرە سزایە توشی ئەو تاقمە ئەبێ، دوایی ئێمە لەو گوندەدا جگە لە تاکە خانوێ لە مانان کەترمان دەست ناکەوێ باوەڕی هێنابێ، زانایان ئەڵێن: دانیشتوانی موسڵمانانی ئەو خانوە لوتو دوو کچی لوتو چەند کەسێ تر کە ژمارەی هەمویان (١٣) نەفەربوون.

﴿ وَتَرَكْنا فِيها آيَةً لِلَّذِينَ يَخافُونَ الْعَذابَ الأَلِيمَ ﴾ وە ئێمە جێمان هێشت لەو گوندەدا نیشانەیەکی زۆر گەورە لە سزای خودا بۆ کەسانێکی ئەوتۆ لە سزای ئازاردار ئەترسن، بۆ ئەوەی ئامۆژگاری وەربگرن.

بۆ ئاگاداری: لەو ئایەتەدا ووشەکانی (الْمُؤْمِنِينَ الْمُسْلِمِنَ) بەیەك مانا دانراون. بەڵام گۆران کاریان پێ کراوە هەتا ووشەیە دوو جار دووپات نەکرێتەوە، پاراوی قورئان زۆرتربێ، هەرچەندە لە هەندێ جێگەی تردا ماناکانیان بە جیاواز لە یەکتری دانراون، بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستە تەماشای مانای ئایەتی (١٤)ی سورەتی ئەلحوجورات بکەن.

﴿ وَفِي مُوسى إذا أَرْسَلْناهُ إلى فِرْعَوْنَ بِسُلْطانٍ مُبِينْ . فَتَوَلّى بِرُكْنِهِ وَ قالَ ساحِراً وَ مَجْنُونَ ﴾ وە ئێمە بەجێمان هێشتوە لەبەسەر هاتی موسایشدا بەڵگەیەکی گەورە بۆ کەسێ تەمێ خوار بێ و بیربکاتەوە کاتێ ئێمە موسامان ڕەوانە کرد بۆلای فیرعەون بە کارێکی پەك خەری زۆر ئاشکراو کە بریتی بوو لە داردەستەکەی و جگەی ئەویش بۆ ئەوەی فیرعەون بیربکاتەوەو باوەڕ بهێنێ، دوایی فیرعەون ڕوی وەرگیرا لە باوەڕهێنان، بەهۆی ئەو شتەی پشتی پێوەردابوو، خۆی پێ بەهێزکردبوو، کە بەو سوپا گەورەی خۆی بە فریوی خواردبوو، ئەیووت: موسا یا جادو گەرە یا شێتە و نێرراوی خودا نیەو، ئاگای لەوە نیە دوارۆژی خۆی لەلایەن منەوە چ شتێکی بەسەردێ.

﴿ فَأَخَذْناهُ وَجُنُدَهُ فَنَبَذْناهُمْ فِي الْيَمِ وَهُوَ مُلِيمْ ﴾ دوایی ئێمە فیرعەون و سوپاکەیمان گرتن، دووایی ئێمە ئەوانمان فڕەدایە ناو دەریای سورو، هەموویانمان خنکان بەو ڕووبارە و فیرعەون کارێکی وای کردبوو لە بێباوەڕی و بێ فەرمانی خودا لۆمەی لەسەرکردنیان بکرێ و پێی لەکەدار بێ لە هەردوو جیهاندا و، ئەوەندە بێ شەرم بوو، ئەی ووت من پەروەردگاری ئێوەم.

﴿ وَ فِي عادٍ إِذْ أَرْسَلْنا عَلَيْهِمُ الرِيحَ الْعَظِيمْ ﴾ وەلەبەسەرهاتی تاقمی عاد نیشانەو تەمێ کردنی وامان بەجێ هێشتوە، کاتێ ئێمە ناردمان بۆسەریان بایەکی گەرمی بێ سوودو بێ هەروباران، بێ ئەوەی درەختەکانیان موتوربە بکا.

﴿ ما تُنْذِرُ مِنْ شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إلاّ جَعَلْتَهُ كالرَمِيمَ ﴾ هیچ شتێکی بەجێ نەئەهێشت ئەو بایە بچوایە بەسەریا مەگەر ئەو شتەی ئەکرد بە وێنەی خۆڵەمێش، پارچە پارچەی ئەکرد.

﴿ وَ فِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَعوا حَتى حِينْ ﴾ وەبەجێمان هێشتووە لەبەسەر هاتی تاقمی سەمود بەڵگەیە بۆ ئادەمیزاد، تەمێ خوار بن بەو بەڵگەیە، کاتێ بێژرا بەوان لەلایەن ساڵحەوە کە هوشترەکەیان کوشت: ئێوە ڕابوێرن لە جیهاندا هەتا کاتێ سزای سەختی خودا دێت بۆلاتان و لەناوئەبرێن، ماوەی ئەو سزایە سێ ڕۆژە.

﴿ فعَتَوا عَنْ أمرِ رَبِّهِم فأخَذَناهُمْ الصاعِقةَ وَ هُمْ يَنظُرُونَ ﴾ دوايـی ئـەو تاقمـە دژی فـەرمانی پەروەردگاری خۆيان هەڵسان، دوايی تووشی ئەوان بوو دوايی سەبرينی هوشترەكە سزايە دوای سێ ڕۆژو، ئەو تاقمە بە چاوی خۆيان لـە ڕۆژدا تەماشايان ئەكرد ئەو سـزايە ئەهاتـە خـوارەوە، لـەگيانەلاودابوون.

﴿ فماَ إستَطاعوُا مِنْ قِيامِ وَ ما كانُوا مُنتَصِرينَ ﴾ دوايـی ئـەو تاقمـە توانـای ئـەوەيان نـەبوو هەڵسن و ڕاكەن و، هيچ كەسێ نەبوو يارمەتيان بداو ڕزگاريان بكا لـە سزای خودا.

﴿ وَ قَوْمُ نُوحِ مِنْ قَبْلُ إنَهُمْ كانوُا قَوْماً فاسِقِينَ ﴾ وەئێمە تاقمی نوحمان لـەناوبرد لـە پێش بت پەرستان و ئەو تاقمانەی پێشوو، هەتا بن بەهۆی تەمێ خواری هەموو بێ باوەڕێ. بەڕاستی تاقمی نوح كۆمەڵێ بوون لـەسنوری فەرمانی خودا دەرچوون.

وَٱلسَّمَآءَ بَنَيۡنَٰهَا بِأَيۡيْدٖ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلۡأَرۡضَ
فَرَشۡنَٰهَا فَنِعۡمَ ٱلۡمَٰهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَا زَوۡجَيۡنِ
لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٥٠﴾
وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٥١﴾
كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ
﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ
بِمَلُومٖ ﴿٥٤﴾ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٥﴾ وَمَا
خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ
وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ
﴿٥٨﴾ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبٗا مِّثۡلَ ذَنُوبِ أَصۡحَٰبِهِمۡ فَلَا يَسۡتَعۡجِلُونِ
﴿٥٩﴾ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوۡمِهِمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾

﴿ وَ السَماءَ بَنَيْناها بِأيْدوٌ إناَ لَموُسِعون ﴾ وەئێمە ئاسمانمان دروست كرد بەهۆی هێزو توانـای خۆمانەوەو، ئێمە بەڕاستی لـە فراوانكردنی ئەندازە دوری نێوان ئاسمان و زەويداين ڕۆژ بە ڕۆژ.

زانای بە ناوبانگ (ئەحمەد ئەمين عێراقی، لەنامـەی خۆيـا (التكـامل في الأسـلام) لـە بـارەی مەبەست لـە مانای ڕستەی (وَإنا لَمُوسِمُونَ) وە بيروبۆچونی هەندێ لـە زانايانی ڕوون كردۆتـەوە ئەفەرموێ: "سەد ملێۆن كاكێشان هەيــە= (المجرات)، لـەوانەيـە كاكێشـانی تريش هـەبێ لـە ئەندازەيەكی دورتردا.

(سیرجێز) ئەڵێ: ئەندازەی دورایی هەندێ لە کاکێشان لەگەڵ هەندێ تریانا (ملیوین و نیویی ساڵی ڕوناکیە، لەگەڵ ئەوەیشدا ڕوناکی لە ساڵێکا (٣٦) ملیون میل ئەبڕێ و، دورایی نێوان کاکێشەکان لەدرێژبوونی بەردەوامدایە (کامو) ئەڵێ: ئەندازەی دوری نێوان ئەستێرەکان، دیاری کراوە بە (٥٠٠) ملیون ساڵی ڕوناکی) بەڕاستی ئەو ئایەتە بەڕێزە ڕاستترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کاری پەك پێغەمەر (د.خ) کارێکی هەتا هەتاییە بەتەنها لە نێوان کارە پەك خەرەکانی پێغەمەرانی تردا... ئەوەیشمان لەبیر نەچێ ئەحمەد ئەمین ئەڵێ: دورایی ئاسمانەکان ئێستا (١٠) جەنانەی کاتی دروست کردنیانە بۆیەکەم جار.

﴿ وَالأَرضَ فَرَشْناها فَنِعْمَ الماهِدُونَ ﴾ وەئێمە زەویمان ڕاخستووەو، ئامادەمان کردووە بۆ ئەوەی ئادەمیزاد بەبێ ئازار بەسەر پێوە بژین و، یارمەتی یەکتری بدەن و، سود لە پیتی وەرگرن و، ئاوەدانی بکەنەوە، نەك بۆ ئەوەی جەنگی تێدا بکەن و ئاژاوەی بۆ سازێنن و، مزگەوت و کانیاو شارو گوندەکان کاول بکەن، دوایی ئێمە بە چاکی زەویمان ئامادەکردوە بۆ سودی ئادەمیزاد.

﴿ وَ مِنْ كُلِ شَيْءٍ خَلَقْنا زَوْجَيْنِ لَعَلَكُمْ تَذَكَرُونَ ﴾ وە ئێمە لە هەموو ڕەگەزێ دوو بەشی جیاوازمان دروست کردووە، لە نێرو لە مێ، ئاسمان و زەوی، شەو ڕۆژ، تاریکی و ڕوناکی، ئادەمیزادو جنۆکە، ساردی و گەرمی، ئیتر ئەو شتانە گیانداربن یان بێ گیان. زانایان ئەڵێن: بچوکترین شتێ لە بونەوەران خودای گەورە نێرو مێی و ساردی و گەرمی تێدا دروست کردووە، لەبەر ئەوەی ئێوە بیر لە توانای خودا بکەنەوەو، پەند وەربگرن.

﴿ فَفِرُّوا إِلَى اللهِ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرُ مُبِينُ ﴾ تۆ بە بت پەرستان بڵێ: دوایی ئێوە ڕابکەن لەبێ فەرمانی خودا بۆ لای پەرستنی خوداو پەشیمان بونەوە. بەڕاستی من لەلایەن خوداوە، ترسێنەرێکی ئاشکرام لە سزای خودا بەو کارە پەك خەرانەی خودا پێی بەخشیووم لەبەر سوودی ئێوە.

﴿ وَلا تَجْعَلوا مَعَ اللهِ إلهاً آخرَ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرُ مُبِينُ ﴾ وە ئێوە دامەنێن لەگەڵ خودا چەند خوایێ تر بۆ پەرستن بەڕاستی من ترسێنەرێکی ئاشکرام لەلایەن خوداوە بۆ سودی ئێوە لە سزای خودا.

هاوبەشدانان بۆ خودا چەند جۆرێ هەیە: پەرستنی بتەکان. منداڵ دانان بۆ خودا. ڕەنگ کردنی خۆت بە ڕەنگی پیاو چاکان بە ڕووالەت، بەلام لەناوەرۆکا، ئەو ڕەنگە ئەدا لە خۆی بە پەیداکردنی سامان پلەو پایەو، ڕابواردن و ڕاوکردنی ئادەمیزادی ساویلکەو، بۆ بەرژەوەندی خۆی. نیازی پاك و گوفتاری چاك گەڕانەوەیە بۆلای خودا، دوو ڕی و سامان پەیداکردن بەو جۆرە دوژمنایەتی خودایە.

﴿ كَذلِكَ ما أتَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ مِّنْ رَّسول إلا قالُوا ساحِراً وَمَجْنُونَ ﴾ هەر بە جۆرەی تاقمەکەی لای تۆ بەتۆ ئەڵێن: شێت یا جادوگەر، نەڕۆیشتوە هیچ پێغەمەرێ بۆلای کەسانێکی ئەوتۆ لە پێش بت پەرستانەوە بوون مەگەر ئەیان ووت بەو پێغەمەرە یا جادوگەرە یا شێت و، پێغەمەر نیە، ئیتر تۆ خەفەت مەخۆ.

﴿ اَتوَصَوا بِهِ بَلْ هَمْ قَوْمٌ طاغونَ فَتوَلَ عَنْهُم فما أَنْتَ بِمَعْلُوم ﴾ ئایا بێ باوەڕانی پێشوو بێ باوەڕانی دوایی پێك هات و لە نێوان خۆیانا بە پێغەمەرەکانیان بڵێن: یا جادوگەرن یا شێتن؟ ئەوانەی پێشو ڕایان سپاردوە بە مانای دووایی ئەو گفتوگۆیە بکەن؟. ئەوانە ڕایان نەسپاردوە. بەڵکو ئەوانەی ئێستا خۆیان تاقمێکن یاخی بوون لە فەرمانی خوداو لە سنور دەرچوون، خۆیان ڕەوشت پیسن و نەزانن و، لە خراپیدا هاوبەشی ئەوانەی پێشوون، ئەگینا لەیەك کاتا نەژیاوون، دوایی تۆ وازیان لێ بهێنەو، گفتوگۆیان لەگەڵ مەکە، دوایی لۆمەت ناکرێ لەسەر باوەڕنەهێنانی ئەوان و، تۆ پێویستی سەرشانی خۆتت بەجێ هێناوە .

﴿ وَ ذَكرَ فَإِنَ الذِكرى تَنْفَعُ المُؤمِنِينَ ﴾ وەتۆ ئامۆژگاری ئادەمیزاد بکەو، واز لە ئامۆژگاری مەهێنە، دوایی بەڕاستی ئامۆژگاری کردن سود ئەبەخشێ بە باوەڕداران.

﴿ وَ ما خَلَقْتُ الجِنَ وَ الإِنْسَ إِلاَ لِيَعْبُدُونَ ﴾ وە منە جنۆکەم ئادەمزادم بۆ هیچ شتێ دروست نەکردوون مەگەر هەر لەبەرئەوەی ئەوان من بپەرستن. یانێ پەرستنی خودا بە تەنها، خۆ پاراستنە لە پەرستنی یەکتری و، لە پەرستنی دارایی و پلەو پایەو، هەموو ئارەزوانی پڕوپوچ، سەشۆری ڕاستی و داد پەروەری بن، یارمەتی کەسانی ڕاست بدەن و، کار بۆ چاکەی هەردوو جیهان بکەن، ئادەمیزادو جنۆکە بۆ کردنی ئەو شتانەم دروست کردوون و، بەڵگەی ئاشکراو ئەقڵم پێ بەخشیون چاك و خراپ جویێ بکەنەوە.

﴿ ما أُرِيدُ مِنهُم مِنْ رزقٍ وَ ما أُريدُ أنْ تُطْعِمُونِ ﴾ مەبەستی من لە دروست کردنی جنۆکەو ئادەمیزاد، پەیداکردنی خواردەمەنی و هۆی ژیانبێ، وەك ئەوەی من هەر بۆ ئەوەم دروست کردبن و، من داوا لەوان ناکەم خواردەمەنی هۆی ژیان پەیدا بکەن بۆ بەندەکانی من لە جگەی خۆیان، من ئەوانم هەربۆ مەبەستی پەرستنی خۆمم دروست کردون، من گرتومەتە ئەستۆی خۆم ئەوان بەخێو بکەم و هەموو جۆرە هۆیەکی ژیانیان بۆ ئامادە بکەم.

﴿ إِنَ اللهَ هوَ ألْرَزاقُ ذَو الْقُوَةِ الْمُبِينُ ﴾ بەڕاستی هەرخودایە بەخێوکەرو ڕۆژی دەربە هەموو بونەوەران، خاوەنی هێزو توانایەکی زۆر سەختەو ماندوبوون ڕووی تێ ناکا، زەوی دروست کردووە بە جێگەی ژیان بۆ ئادەمیزاد، هەموو جۆرە هۆی ژیانی تێدا پەیدا کردوە، بەجۆرێ شایانی ئەوەیە بەکار بهێنرێ بۆ سودی ئەوان و، ئەقل و چاوگوێی و توانای پێ بەخشیون.

﴿ فإِنَ لِلَذِينَ ظَلَمُوا ذَنُوباً مِثلَ ذَنُوبِ أَصْحابِهِمْ فَلاَ يَسْتَعْجِلُونَ ﴾ دوایی بەڕاستی بۆ کەسانێکی ئەوتۆ هەیە ستەمیان لە خۆیان کردوە لە دانیشتوانی مەکە، موحەمەد بەدرۆ ئەخەنەوە، بەشێکی زۆر گەورە لەسزا، بە وێنەی بەشی هاوڕێ پێشوکانیان لە سزای خودا، دوایی داوای پەیدابوونی ئەو سزایە نەکەن بە گورجی پەیدا بێ، ئەو سزایە دوائەخرێ بۆ ئەوەی پەشیمان ببنەوە.

﴿ فَوَيْلٌ لِلذيْنَ كَفرُوا يَوْمِهِمْ الذي يُوعَدُونَ ﴾ دوایی هاوارو سزای سەخت بۆ کەسانێکی ئەوتۆیە باوەڕیان بە سزای ئەو ڕۆژەی خۆیان نیە بەڵێنی پێ دراوە بەوان و لە پاشەڕۆژدا توسیاتن ئەبێ.

**بە یاریدەی خوا تەواو بوو**

# ﴿ سورەتی طور ﴾

لەمەکە هاتۆتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٤٩) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
وَٱلطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ﴿٢﴾ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ﴿٣﴾ وَٱلۡبَيۡتِ
ٱلۡمَعۡمُورِ ﴿٤﴾ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ﴿٥﴾ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ﴿٦﴾ إِنَّ
عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ ﴿٧﴾ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ ﴿٨﴾ يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ
مَوۡرٗا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا ﴿١٠﴾ فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ
﴿١١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ
جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾
أَفَسِحۡرٌ هَٰذَآ أَمۡ أَنتُمۡ لَا تُبۡصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصۡلَوۡهَا فَٱصۡبِرُوٓاْ
أَوۡ لَا تَصۡبِرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

**بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ وَالطُّور ﴾ وەمن سوێند ئەخۆم بە کێوی تور، ئەو کێوەی موسا گفتوگۆی لەلادا کردوە لە خزمەت خوادا، ووشەی تور بە زۆر مانا هاتووە: هاتوە بە مانا چۆلایی بەردەمی خانوو، بە مانا هەموو کێوێ کێوێکە لە سینا، دوو کێویٚ لە قودسدا، بە چەن شتیٚ تریش. بەلام لێرەدا مەبەست ئەو کێوەیە موسا گفتوگۆی تێدا کردووە لە خزمەت خودادا.

﴿ وَكِتابِ مَسْطُور فِي رَق مَنْشُور ﴾ وە من سوێندخۆم بەو نامەیە ئەنوسرێتەوە لەناو چەرمێکی کراوەدا، پێوەنەدراوەو دانەخراوە، هاتۆتە خوارەوە بۆسەر موحەمەد، هەموو کەسیٚ ئەتوانیٚ ئەو نامەیە دەستی خۆی بخاو، فێری بێ و چاك و خرابی بۆ رون ببێتەوە، هۆی ئاسایشی هەردوو جیهانی تێدایە، باسکردنی چەرم بۆ وێنەیە ئەگینا لە کاغەزو ئێسك و شتی تردا نوسراوەتەوە.

﴿ وَالبَيْتِ المَعْمُور ﴾ وەمن سوێند دەخۆم بەو خانووەی ئاوەدان کراوەتەوە بەسەردانی حاجیەکان بۆلایی و، بەو کەسانەی دراوسێی ئەو خانوەن کە بریتیە لە کەعبە، بە فەرمانی خودا ئیبراهیم و ئیسماعیل دروستیان کردووە، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد پەرستنی خودای تێدا بکریٚ.

﴿ وَالسَقْفِ المَرْفُوعِ ﴾ وەمن سوێند ئەخۆم بەو ئاسمانەی بەرزکراوەتەوە لەبـەرچاوی ئێـوەدا بەبێ ئەستون، جێگەی هەموو زانستی و هۆی ژیانی بوەنەوەرانە.

﴿ وَالْبَحْرِ المَسْجُور ﴾ وەمن سوێند ئەخۆم بەو دەریایەی ڕێگەی لێ گیراوە لـەوەی هەڵچێ و برژی بەسەر زەویداو، گیانداران بخنکێنێ، یامن سـوێند ئـەخۆم بـەو دەریایـەی گـەرم کـراوەو سورکراوەتەوە بە وێنەی ئاگردانێ سورکرابێتەوە بەهۆی ئاگرەوە.

زانایان ئەڵێن: ئەو ئایەتە ئاماژەیە بۆلای ئەوەی، ئەم زەوی‌یە ئێمە بەسەرێیەوە ئەژین و وێنەی کاڵەکێکە توێژێکی تەنك ناوەوەی ئەو کاڵەکەی داپۆشیوە کە ئەو خواردەمەنی و تـۆو ئـاوەی تێدایە، ئەم زەویەش کە ئەم دەریاو زەریایانــەی بەسـەرەوەیە، زەریایـەکی زۆر گـەرمی ئـاگری لەناودایـە، توێژاڵێکـی زۆر تـەنکی زەوی دای پۆشـیوە، جــاری وائـەبێ تەقێتــەوە بــەهۆی بومەلـەرزەوە، ئاگرێکی زۆرو زەبەنە فڕە ئەداتە دەرەوە، زانایانی کۆن تا ئەم سەردەمە ڕێگـەیان پێ نەبردووە. بەلام بەر لـە هەموو زانایە نزیکەی (١٤٠٠) ساڵ لـەمەوبــەر عـەبدوڵای کـوڕی عەباس ڕێگەی پێ بردوەو، ئەفەرموێ:

(لا يَرْكَبَنَ رَجُلٌ البَحْرِ إلا غازياً أو مُعْتَمِراً أَوْ جاجاً فَانَّ تَحْتَ البَحْرَ ناراً وَتَحْتَ النـار بَحْـراً) هیچ پیاوێ سواری کەشتی ناو دەریا نەبێ مەگەر بۆ جەنگ لـەگەڵ بێ باوەڕان، یان بۆ کردنـی عەمرە یا حەج نەبێ بەڕاستی لەژێر ئەو دەریایەدا ئاگرەو لـەژێر ئاگرەکەدا دەریایە)، ئـەو دەریـا ئاگرە بە گەورەترین کاری پەك خەری قورئان دائەنرێ، بــە کورتـی بـە ڕاسـتی دەریـا لـەسـەر زەویەو، ئاگر لـە ناو زەویدایە.

﴿ إِنَّ عَذابَ رَبِّكَ لَواقِعٌ ﴾ من سوێند ئەخۆم بەوانە. بەڕاستی سزای پەروەردگاری تۆ پــەیدا ئەبێ و دێنەخوار بۆیان لـە ڕۆژی دواییدا.

﴿ مالَهُ مِنْ دافِعٍ يَوْمَ تَمُورُ السَّماءُ مَوْراً وَتَسِيرُوا الجِبالُ سَيْراً ﴾ هیچ کەسێ نیـە ئـەو سـزایە بگێڕێتەوە، ئەو سزایە پەیدا ئەبێ لـە ڕۆژێکا ئاسمـان ئـەجولێ و دێـت و ئـەڕواو بـە جوڵانێکـی سەفت، هێزی ڕاکێشەری نامێنێ و، ڕێك و پێکی ئەستێرەکان تێك ئەچێ و، ئەدەن لـە یـەکتری و پارچە پارچە ئەبن و، کێوەکان لـە جێگەی خۆیا نامێنن و ئەبن بە تۆزو، ئەڕۆن بە ڕۆیشـتنێکی سەرسوڕێنەر بە ئاسماندا .

﴿ فَوَيْلٌ لِلْمُكَذِبِيْنَ الذينَ هُمْ في خَوْضٍ يَلْعَبُونَ ﴾ دوایـی سـزای زۆر سـەخت بۆ کەسـانەی ئەوتۆیە کە فەرموودەکانی خوداو پێغەمەریان بەدرۆ دائەنا، ئەوان لـەناو کاری پڕو پوچدا یــاری ئەکەن و بێ ئاگان .

﴿ يَوْمَ يُدَعُونَ إِلى نار جَهَنَمْ دَعاً هذِهِ النارُ التي كَنْتُمْ بِها تُكَذِبُونَ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە پــاڵ بـە تاوانبارانەوە ئەنرێ بۆ ئاگری دۆزەخ بە پاڵ پێوەنانێکی زۆر سەخت، فریشتەکان بەوان ئــەڵێن: ئەمە ئەو ئاگرەی ئەوتۆیە، ئێوە باوەڕتان پێی نەبوو، بە درۆتان ئەخستەوە، هەر سروشێ لـەلایەن خوداوە بهاتایە بۆلای موحەمەد بەدرۆتان ئەخستەوە.

﴿ أفسِحْرٌ هذا أمْ أَنْتُمْ لا تُبْصِرُونَ أصْلوْها ﴾ ئایا دوایی ئەم ڕۆژەو ئەم سزایە جادوە کە ئێوە ئەتان ووت موحەمەد جادوو کەرە، ئایا ئێوە ئەم سزایە نابینن ئێستا، هەروەك ئـەوەی ئێـوە ئـەو بەڵگانەتان نەئەبینی لەسەر ڕاستی ئەم ئاگرە، ئێوە بچنە ناوی و سزاکەی بچێژن.

﴿ فَاصْبِرُوا أوْلا تَصْبِرُوا سَواءٌ عَلَيْكُمْ ﴾ دوایی ئێوە ئارام بگرن لەسەر ئـازاری ئـەم ئاگرەیـا ئارام نەگرن یەکسانە لەسەر ئێوە.

﴿ إنَما تُجْزَوْنَ ما كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ بەڕاستی ئێوە هەر بەشتێ پاداشتان ئەدرێتەوە ئێـوە خۆتـان کردوتانە لە جیهاندا، لە تاوان و بێ فەرمانی خوداو پێغەمەر.

دوای ئەوەی خودای مەزن باسی دانیشتوانی دۆزەخـی کـرد، باسـی دانیشـتوانی بەهەشـت ئەکاو ئەفەرموێ:

إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَعِيمٍ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ
وَوَقَىٰهُمْ رَبُّهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا
كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٍ مَّصْفُوفَةٍ وَزَوَّجْنَٰهُم
بِحُورٍ عِينٍ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّبَعَتْهُمْ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلْحَقْنَا
بِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَمَآ أَلَتْنَٰهُم مِّنْ عَمَلِهِم مِّن شَىْءٍ كُلُّ ٱمْرِئٍۭ بِمَا كَسَبَ
رَهِينٌ ﴿٢١﴾ وَأَمْدَدْنَٰهُم بِفَٰكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَٰزَعُونَ
فِيهَا كَأْسًا لَّا لَغْوٌ فِيهَا وَلَا تَأْثِيمٌ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَانٌ
لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ لُؤْلُؤٌ مَّكْنُونٌ ﴿٢٤﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ
﴿٢٥﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّا كُنَّا قَبْلُ فِىٓ أَهْلِنَا مُشْفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ
عَلَيْنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلُ
نَدْعُوهُ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾

﴿ إنَّ المُتقِينَ في جَناتٍ وَنَعِيمٍ ﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی لە خوا ترساون و خۆیانیان پاراستوە لەبێ فەرمانی خودا لەناو چەندێ باخ و بێستان و خواردەمەنی و ڕابواردنی زۆر چاکدان.

﴿ فاكِهِينَ بِما أتاهُمْ رَبُهُمْ وَوَقاهُمْ رَبُهُمْ عَذابَ الجَحِيمِ ﴾ شادمانن بـە شـتێ پـەروەردگاری خۆیان بەوانی بەخشیوەو پێی ڕائەبوێرن و، پەروەردگاری خۆیان پاراستونی لـە سـزای دۆزەخ. بەوان ئەبێژێ:

﴿ كُلُوا وَشْرَبُوا هَنِيئاً بِما كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ ئێوە بخۆن و بخۆنـەوە خواردەمـەنی و خـوراوە، ئازارو ناخۆشی بە دواوە نەبێ، بەهۆی پاداشتێ ئێوە خۆتان كردوتانە لـە جیـهاندا. كـەوا پلـەو پایەو بنەماڵەو دارایی سوود بە ئێوە نابەخشێ لـە پاشە ڕۆژدا، مەگەر بەكاربهێنرێن لـە خزمـەتی مرۆڤدا.

﴿ مُتَكِئِينَ عَلى سُرُرٍ مَصْفُوفَةٍ وَزَوْجْناهُمْ بِحُورعِين ﴾ ئێـوە دانیشـتن و پـاڵ بدەنـەوە بەسـەر چەندین كورسی ڕێزكراون و دانراو لـەلای یەكترەوەو، ئێمە ئەیكەن بە هاوجووت و هاوڕێ بۆ ئەوان چەن ژنی چاوجوان و لـەش سپی و ڕومەت شیرین و چاوگەورە.

﴿ وَالَّذِينَ أمَنُوا وَاتَبَعَتْهُمْ ذُرِيَتُهُمْ بِأيمان ألْحَقْناهُمْ ذرِيَتـهم ﴾ وە كەسـانێكی ئـەوتۆ باوەڕیـان هێناوە بە پێغەمەری خوداو، خێزانەكانیانً دوای ئەوان كەوتوون بە هۆی باوەڕهێنانیان بە خوداو بە پێغەمەر، ئێمە ئەو خێزانە باوەڕدارانەی ئەوان ئەگەیـەنین بـە پلـەو پایـەی باوكـەكانیان لـە بەهەشتا، باوەكو بە ئەندازەی باوكـەكانیان كـردەوەی چاكیـان نـەكردبێ لـە جیـهاندا لـەبـەر دڵخـۆش كردنـی باوكـەكانیان. بـەڵام ئـەو خێزانانـەی بـە منـاڵی مـردوون سـزایان نـادرێ، باوكەكانیان باوەڕداربن یا بێ باوەڕ. بەڵام ئەو كەسـانەی ئـەڵێن: منـاڵی بـێ بـاوەڕان سـزایان ئەدرێ ڕاست نیە.

﴿ وَما ألتناهُمْ مِنْ عَمَلِهِمْ مِنْ شَيْءٍ ﴾ وە ئێمە هیچ شتێ لـە پاداشتی كردەوەی باوكـەكانیان كەم ناكەینەوە.

بۆ زانین: ئایا ئەو منالانەی بە منالی مردوون كـۆ ئەكرێنـەوە بـۆ پرسـیار و وەلام و، ئەچنـە بەهەشت، لـە قورئان و لـە فەرموودەی پێغەمەر لـەو بارەیەوە بەلگەی بێگومان دەست ناكـەوێ چاك وایە هەواڵەی زانیاری خودا بكرێ. ئایا منـالان بـە موسـڵمان دائـەنرێن یانـە؟ شـافیعی و حەنەفی و حەنبەلیەكان لایان وایە دوای باوك و دایكیان ئەكەون لـە ئیسلامیتدا لـە جیهان، ئیتر باوك و دایكیان هەردوولایان موسڵمانبن یا یەكێكیان موسڵمانبن. بەڵام لای مالیكیەكان ئەڵێن: مناڵ بە موسڵمانی دایك بە موسڵمان دانانرێ.

﴿ كُلُ أمْرِئٍ بِما كَسَبَتْ رَهِينٌ ﴾ هەموو ئادەمیزادێ ئەخرێتە گرەوی شتێ خۆی كردویەتی لـە جیهانداو، بە كردەوەی خۆیە بەستراوەو ئەچێتە خزمـەت خـودا، ئەگـەر كـردەوەی چـاكی كردبێ ڕزگاری ئەبێ، ئەگەر كردەوەی چاكی نەبێ بە گوێرەی كرداری خـۆی كـاری لـەگـەڵ ئەكرێ.

﴿ وَأمْدَدْنا هُمْ بِفاكِهَةٍ وَلَحْمٍ مِمّا يَشْتَهُونَ ﴾ وە ئێمە ئەبەخشین بە دانیشتوانی بەهەشت كات لـە دوای كـات مێـوەو گۆشـتی جۆراوجـۆرو هەمـەڕەنگ لـە هـەر شـتێ ئـارەزۆی بكـەن. خواردەمەنی بەهەشت لـەسەر یەك شێوە نیە. بەڵكو ئەگۆڕرێ بە گوێرەی ئارەزوی خۆیان.

﴿ يَتَنازَعُونَ فِيها كَأساً لا لَغْوٌ فِيها وَلا تَأْثِمٌ ﴾ دانیشتوانی بەهەشـت هـەندێكیان لـە هـەندێ تریان لـە بە هەشتا پیاڵەی پڕ لـەمەی خۆش لـە یەكتری وەرئەگرن و، ئەوان گفتوگـۆی پڕوپـوچ لـەگەڵ یەكتری ناكەن لـەبەهەشتا كاتێ مەی ئەخۆنەوەو، شـتێ ناكـەن لـەبەهەشـتا ببێتـە هـۆی گوناە كردن، لـەبەهەشتا سەرخۆشی و دژایەتی یەكتری نیە لـە كاتی خواردنەوەی مەیدا.

﴿ وَيَطُوفُ عَلَيْهِمْ غِلْمَـانٌ لَـهُمْ كَأَنَـهُمْ لُؤْلُـؤٌ مَكْنُـونٌ ﴾ وەخزمـەت گـوزارە تایبەتیـەکانیان ئەگەڕێن بەسەریانا بە پیاڵە پڕ لەمەی، ئەو خزمەتکارانەیان لـە شـیرینی و لەشـی سپیانەوە بـە وێنەی مرواریوان پارێزراون، دەستیان لێ نەدراوەو تۆزیان لێ نەنیشێ، هەندێ لە زانایان ئـەڵێن: بریتین لـە منالی‌خۆیان. پرسیار لـە پێغەمەرکرا: خزمەتکارەکانیان بەو جۆرەبن لـە جوانیـدا ئـەبێ جوانی خاوەنەکانیان چۆنبێ، پێغەمەر فەرمووی بە وێنەی جوانی مانگە بەرانبەر بە ئەستێرەکان.

﴿ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلى بَعْضٍ يَتَساءَلُونَ قالُوا إنا كُنا قَبْـلُ فِي أهْلِنـا مُشْـفِقِينَ ﴾ وە دانیشتوانی بەهەشت هەندێکیان ڕوئەکەن بۆلای هەندێ تریان، پرسیار لەیەکتری ئەکەن: کارو کردەوەتان چۆن بووە لـە جیهاندا، لـە وەڵامـدا ئـەڵێن: ئێمـە بەڕاسـتی لـەناو خێزانـەکانماندا لــە جیـهاندا ئەترساین لـە سزای خودا، بە ئومێدی پاداشتی چاك بووین لـە خزمەت خودادا.

﴿ فَمَنَ اللهُ عَلَيْنا وَوَقانا عَذابَ السَمُومِ ﴾ دوایی خودا چاکەی خۆی دا بەسەرمانداو لێمــان خۆشبوو خستینیە بەهەشت و، ئێمە پاراست لـەسزای ئاگرێ بە هەموو بۆشایی لـەشدا ئەڕوا.

﴿ إنا كُنا مِنْ قَبْلُ نَدْعُوهُ إنَهُ هُوَ البَرُ الرَحِيمُ ﴾ بەڕاستی ئێمە لـەمەوبەر لـە جیهاندا ئەپاڕاینەوە لـە خودا، داوامان ئەکرد بمانپارێزێ لـە سـزای خـۆی، بەڕاسـتی خـودا چاکـەی زۆرە بـۆ ئـەو کەسانەی لـەو ئەترسن، میهرەبانەو خاوەنی بەزەییە بۆ ئەو کەسانەی لـەخودا ئەپاڕێنەوە.

کۆمەڵێ لـە بێ باوەڕانی دانیشتوانی مەکە لـەسەر ڕێکانی مەکە دائەنیشتن و، هـەر کاروانـێ لـە عەرەبەکان بهاتنایە بۆ مەکە بەوانیان ئەووت: موحەمەد بۆشە وێژەو شێت و هۆنراوە دانـەرە جادوگەرە، باوەڕ بە گفوگۆکان مەکەن خودای مەزن لـەو بارەوە بە پێغەمەری فەرموو:

فَذَكِّرْ فَمَآ أَنتَ بِنِعْمَتِ
رَبِّكَ بِكَاهِنٍ وَلَا مَجْنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمْ يَقُولُونَ شَاعِرٌ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيْبَ
ٱلْمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلْ تَرَبَّصُوا۟ فَإِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾
أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلَٰمُهُم بِهَٰذَآ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٣٢﴾ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ
بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ
﴿٣٤﴾ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ
رَبِّكَ أَمْ هُمُ ٱلْمُصَۣيْطِرُونَ ﴿٣٧﴾ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ

مُسْتَمِعُهُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَهُ ٱلْبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿٣٩﴾
أَمْ تَسْـَٔلُهُمْ أَجْرًا فَهُم مِّن مَّغْرَمٍ مُّثْقَلُونَ ﴿٤٠﴾ أَمْ عِندَهُمُ ٱلْغَيْبُ فَهُمْ
يَكْتُبُونَ ﴿٤١﴾ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا فَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هُمُ ٱلْمَكِيدُونَ ﴿٤٢﴾
أَمْ لَهُمْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٣﴾ وَإِن يَرَوْا۟ كِسْفًا
مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطًا يَقُولُوا۟ سَحَابٌ مَّرْكُومٌ ﴿٤٤﴾

﴿ فَذَكِّرْ فَما أَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِكَ بِكاهِنٍ وَلا مَجْنُونٍ ﴾ دوایی تۆ ئامۆژگاری ئادەمیزاد بکـــە و، ڕێگەی ڕاستیان نیشان بدە، دوایی تۆ بەهۆی چاکـەی پـەروەردگاری خۆتـەوە نەپۆشـەویژی و نەشێت. کەواتە تۆ گرنگی بە گفتوگۆی پروپوچی بێ باوەڕان مەدە.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ شاعِرٌ نَتَرَبَصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنُونِ ﴾ بەڵکو بێ باوەڕان ئـەڵێن: موحەمـەد شـاعیرە، لەبەرئەوەی شاعیرە چاوەڕوانی ئەوە ئەکەین تووشی ڕوداوێکی جیهان ببێ ئەو بمرێ بە گوێرەی ئاواتی ئێمە. ئیتر با بە ئارەزۆی خۆی بیروباوەڕی خۆی دەرببڕێ. کەواتە بەردەوام ئەبین لەسـەر بەدرۆخستنەوەی، خۆ ئەگەر تووشی هیچ شتێ لەوانە نەبێ دوایـی چـەن ڕۆژێ تـر، درۆکـانی ڕون ئەبێتەوە هەروەك شاعیرەکانی تر، لە پاشا خوی و هاوڕێکانی بلاوە ئەکـەن، دوایـی خـودا فەرمانی دا بە پێغەمەر:

﴿ قُلْ تَرَبَصُوا فَأَني مَعَكُمْ مِنَ الْمُتَرَبِصِينَ ﴾ تۆ بلێ بەو بێ باوەڕانە: ئێوە چاوەڕوانی مـردن و جگەی مردن بکەن بۆمن، دوایی بەڕاستی منیش وەك ئێوە چاوەڕوانی ئەوە ئەکەم ئێـوە تووشـی سزای خودا بین و، من لەناوچونی ئێوە بە چاوی خۆم ئەبینم بەهۆی یارمەتی خوداوە.

﴿ أَمْ تَأْمُرُهُمْ أَحْلامُهُمْ بِهذا أَمْ هُـمْ قَـوْمٌ طـاغُونَ ﴾ ئایـا ئـەقڵی ناتـەواو و ڕزیـوی خۆیـان فەرمانیان پێ ئەدا بەو بوختان و سەر لێ شێوانەو ئازاردانی موحەمەد؟ یا ئەوان تاقمێکن لە سنور لایانداوە وەکەچی ڕاستیش زۆر ئاشکرایە، بەڵگەیشیان بەدەستەوە نیـە. بـەڵام ئەیانـەوێ پلـەو سامانیان پارێزراوبێ.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ بَلْ لا يُؤْمِنُونَ ﴾ یا ئەوان ئەڵێن: موحەمەد لەلایەن خۆیەو ئەو قورئانــەی هەڵبەستوە، بەڵکو ئەوان باوەڕناهێنن و، واز لـە کردەوەی پرو‌پوچ نایەرن.

﴿ فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِثْلِهِ إِنْ كانُوا صادِقِينَ ﴾ دوایی کە ئێوە ئەڵێن: ئەو قورئانە هۆنراوەیـە یـا موحەمەد خۆی دایناوە، یا پۆشەویژو جادووە، ئێوە وێنەی ئەو قورئانە بهێنن ئەگەر ئێوە ڕاسـت ئەکەن.

﴿ أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخالِقُونَ ﴾ ئایا ئەو بـێ باوەڕانـە بەرێکـەوت پـەیدابوون، بەبێ ئەوەی کەسێ ئەوانی دروست کردبێ یا بەڕێوەبەرێکیان هەبێ و، پرسیاریان لێ نەکرێ وەك جڕوجانەوەری ناو پیسایی. یا ئەوان خۆیانیان درووست کردووە، بە گوێرەی ئارەزۆی خۆیان و ویستو توانای خۆیان؟

﴿ أَمْ خَلَقُوا السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ بَل لا يُوقِنُونَ ﴾ ئایا ئاسمانەکان و زەوی ئەوان درووستیان کردوون، هەرچەندە بە گوێرەی بڕوا و گفت و گۆی خۆیان ئەیان ووت: خودا درووستی کردوون. بەڵام ئەوان بڕوای بێگومانیان بە یەکێتی خودا نی‌یە. کردار و گوفتاریان وەك یەك نین. ئەم سەردەمەی ئێمە کەسانی وا هەن ئەڵێن: ئێمە بڕوامان بە خودا هەیە کە چی‌یە کردەوە خوداپەرستی ناکەن.

﴿ أَمْ عِندَهُمْ خَزَائِنُ رَبِّكَ أَمْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ ﴾ ئایا کلیلی گەنجینەکانی پەروەردگاری تۆ لە پێغەمەرایەتی و ڕۆزی دانی گیانداران و جگەی ئەوانیش لای ئەو بێباوەڕانەیە، هەتا هەرکەسێ ئارەزۆیان هەبێ بیکەن بە پێغەمەر و، ڕۆزی بدەن بە هەرکەسێ بیانەوێ، یا ئەوان دەستەڵاتیان هەیە بەسەر هەموو بوونەوەراندا، خودا ئارەزۆی هەبێ یا نەیبێ، خۆیان هەموو شتێ بکەن. کە ئەوان کردەوەکانیان بەو جۆرە بێ، چۆن ئەڵێن: هەموو شتێ خودا درووستی کردووە.

﴿ أَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعُونَ فِيهِ فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُمْ بِسُلْطَانٍ مُبِينٍ ﴾ ئایا ئەوان پەیژەیەکی وایان هەیە بەسەریا بەرزببنەوە بۆلای خودا و، فەرموودەی خودا ببیسن و بڵێ: موحەمەد بوختان ئەکا بەدەم خوداو، دوایی ئە کەسەی چووە گۆێی گرتووە با بەڵگەیەکی ئاشکرا بهێنێ لەسەر داواکاری ئەوانە، هیچ شتێ بە بێ بەڵگە ڕوون نابێتەوە. کەواتە ئێوەی بێباوەڕ بوختان ئەکەن.

﴿ أَمْ لَهُ الْبَنَاتُ وَلَكُمُ الْبَنُونَ ﴾ ئایا ئێوە ئەوەندی نەفام نین، ئەڵێن: خودا کچی هەیە کە کچ لای ئێوە بێ نرخە، ئێوە کوڕتان بۆ خۆتان داناوە، بێگومان ئەو بێباوەڕانە زۆر گێل و گەوجن. بە ڕاستی ئەو کەسانەی بڵێن: موحەمەد شاعیرە، یا خودا کچی هەیە و ئەوان کوڕیان ئەوێ، یا موحەمەد شێتە، یا بڕوایان بە فەرموودەی خودا نەبێ، ئەوانە هەموویان بوختان و درۆن ئەیاندەنە پاڵ خودا و پێغەمەر.

﴿ أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْراً فَهُمْ مِنْ مَغْرَمٍ مُثْقَلُونَ ﴾ ئایا تۆ لەسەر ڕاگەیاندنی پەیامی خودا داوای کرێ لەوان ئەکەی، دوایی ئەوان بۆ بژاردنی ئەو کرێیە باریان گران بێ، تۆ داوای بکەیت و، ئەوان نەتوانن بیژمێرن. بێگومان تۆ داوای کرێ لەوان ناکەیت، ئیتر ئەو بێباوەڕانە بۆ ئەبێ تۆ بە درۆ بخەنەوە و باوەڕت پێ نەهێنن؟

﴿ أَمْ عِندَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ﴾ ئایا ئەوان لایان هەیە زانینی شتێ لەبەر چاو نی‌یە، دوایی ئەوان ئەو شتە بنووسن بە ئارەزۆی خۆیان. یانێ خودای مەزن ئەوانی ئاگادارای ئەو شتە کردووە دیار نی‌یە و، بۆ ئەوانی دەرخستووە ئەو لەوحەلمەحفوزەی هەموو شتێکی نادیاری تێدایە، هەتا ئەوان ئەوەی خۆیان ئەیانەوێ لە ناویا بینووسن، دوایی هەواڵ بدەن بە ئادەمیزاد بە شتێ زانیویانە و، چاوەڕوانی ئەوە بکەن تۆ تووشی ڕووداوی جیهان ببی و، بڵێن: ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ هەموویان پڕوپووچن، وە ئەگەر ئەوان نەچوون ئەو کارانە بکەن چ کەسێ هەواڵی داوە بەوان ئەو شتانە بڵاوبکەنەوە بە ئارەزۆی خۆیان؟

﴿ أَمْ يُرِيدُونَ كَيْداً فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ ﴾ ئایا ئەوان ئەیانەوێ پیلانێ بۆ تۆ ساختە بهێنن و تۆ بکوژن، ئەو پیلانە سەرناگرێ و خودا تۆ ئەپارێزێ، دوایی ئەو کەسانەی باوەڕیان نەهێناوە، هەر ئەوانە پیلانیان لێ ئەکرێ و بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوە و لە ناو ئەچن.

﴿ أَمْ لَهُمْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ ئایا بۆ ئەوان هەیە خودایە جگەی خودا بیپەرستن و، بیانپارێزێ لە سزای خودا و بۆیان بپاڕێتەوە و، یارمەتییان بدا. بێگومان بۆیان نی‌یە. پاك و دووری بۆ خودایە لە شتێ ئەوان ئەیکەن بە هاوبەش بۆ خودا، یا خودایە تر هەبێ.

﴿ وَإِنْ يَرَوا كِسْفاً مِنَ السَمَاءِ ساقِطاً يَقُولُونَ سَحابٌ مَرْكُومٌ ﴾ وە بێبـاوەڕان ئـەوەندە بـێ شەرمن ئەگەر پارچەیە لـە ئاسمـان بکەوێتـە خـوارەوە بـە سـەریانا ئـەڵێن: پارچەیـە لـە هـەور نیشتووەتە سەر یەك، بڕوایان بەوە نییە تۆڵەیان لێبکرێتـەوە. بـە کورتـی خـودای مـەزن هیـچ بیانوویەکی بۆ ئەو کەسە نەهێشتووەتەوە باوەڕ بە پێغەمەرایەتی موحەمەد نەکەن، هەر ئەوەی بۆ ماوەتەوە بڕوای بە بوونی خودا نەبێ. ئەو ١٦ پرسایارانە بەڵگەی بێگومانن لەســەر بێبـاوەڕی بت پەرستان.

فَذَرْهُمْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ
يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى فِيهِ يُصْعَقُونَ ﴿٤٥﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔا
وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابًا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ
أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ۖ وَسَبِّحْ
بِحَمْدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٤٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَإِدْبَٰرَ ٱلنُّجُومِ ﴿٤٩﴾

﴿ فَذَرْهُمْ حَتى يُلاقُوا يَوْمَهُمْ الذي فِيهِ يُصْعَقُون ﴾ دوایی تۆ واز بهێنە لەو کەسانە کە تۆ بـە درۆ ئەخەنەوە و، جەنگیان لـەگەڵ مەکە هەتا تووشی ئەو ڕۆژەی ئـەوتۆی خۆیـان ئـەبن، لـەو ڕۆژەدا لـەناو ئەبرێن، ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە ئەو پیلانەی ئـەوان هیـچ سـودێ بـەوان نابەخشـێ و، ئەوان یارمەتییان نادرێ لـە لایەن هیچ کەسێکەوەس و ناتوانن ڕا بکەن.

﴿ يَوْمَ لا يُغني عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئا وَلاهُـمْ يُنصَـرُونَ ﴾ وە بـە ڕاسـتی بـۆ کەسـانێکی ئـەوتۆ ستەمیان لـە خۆیان کردووە بە باوەڕ نەهێنان بە ڕۆژی دوایی هەیە سزایەکی گەورە لــە ڕۆژی دواییدا جگە لـەو سزایەی تووشیان ئەبێ لـە جیهاندا و، بەڵام زۆرتر لـەوان نایزانن و باوەڕی پێ ناهێنن.

﴿ وَإنَ لِلذيْنَ ظَلَمُوا عَذاباً دُونَ ذلِكَ وَلكِـنَّ أكـثَرَهُمْ لا يَعْلَمُـونَ ﴾ تـۆ ئـارام بگـرە لـەبـەر فەرمانی پەروەردگاری خۆت بە دوا خستنی سزادانی ئەوان و، مانـەوەی تـۆ لـەسـەر ئـازاردانی ئەوان بۆ تۆ، دوایی بە ڕاستی تۆ لـە ژێر چاو دێری و پاراستنی ئێمەدای، ئەوان تووشـی ئـازاری سەخت ئەبن لـەمەودوا.

﴿ وَأصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِكَ فَأَنَّكَ بأَعْيُنِنا رَسَبح بِحَمْدِ رَبِكَ حَـينَ تَقُـومُ ﴾ وە تـۆ پـاکی و دووری دەربڕە بۆ پەروەدگاری خۆت، سوپاسی بکە لـەسەر ئـەو هـەموو چاکانـەی نایەنـە ژمـارە، لـە هـەموو جێگەیەکـە لـە خـەو هەڵئەسـی و بـڕۆ بـەلای نوێژکردنـەوە و، لـە دواییـدا پـاکی بۆپەروەردگاری خۆت دەربڕە لـە شەوداو، دوای وونبوونی ئەستێرەکان لـە کۆتـایی شـەودا و، خەریکی یادی خودا و پەرستنی خودایە لـە هەموو کاتێکا.

# ﴿ سورەتی وە نەجم ﴾

لە مەکە هاتووەتە خوارەوە. جگە لە ئایەتی (٣٢) کە لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٦٢) ئایەتن.



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ
عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾
ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾
فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾
مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ
نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾
إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ
مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾

﴿ وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى ﴾ وە من سوێند ئەخۆم بە هەموو ئەستێرەیەك کاتێ هەڵدێن و ئاوا دەبن، کاتێ ئەکەونە خوارەوە لە ڕۆژی دواییداو پەرش و بڵاو ئەبنەوە، کاتێ ئەکەونە خوارەوە بەسەر شەیتانەکاندا.

﴿ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَى ﴾ ئەی تاقمی قورەیش: موحەمـەدی دانیشتووی لای ئێوە و خۆتان ئەیناسن بە دەم پاکی لە ڕێگەی ڕاست لای نـەداوە و، بـڕوای بـە بـیر و بـاوەڕی پـوچ نەبووە.

خودای مەزن لەبـەر سـوودی زۆری ئەسـتێرە سـوێندی پـێ خـواردوون، نـاتوانرێ باسـی هەموویان بکرێ، بەڵام وەك نموونە باسی هەندێکیان ئەکەین:

١- بەهۆی ئەستێرەکانەوە ئادەمیزاد لە ناو دەریادا و، لەسەر ڕووی زەوی، ڕێگەی خۆیـان ئەدۆزنەوە لە ناو تاریکی شەودا.

٢- ئەستێرە بوونەوەرێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە، ڕووناکی ئەستێرە لە یەك سانیەدا (٣٠٠) هەزار کیلۆ مەتر ئەبڕێ و، ڕووناکی ئەستێرە و شەپۆلی پەخشی وێنەی ڕادیۆیی لە حەوت یەکی سانیەیەکدا ١/٧ بە دەوری هەموو گۆی زەوی‌دا ئەسووڕێتەوە.

﴿ وَمَا يَنطِقُ مِنَ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى ﴾ وە موحەمەد لە لایەن خۆیەوە، بە ئارەزۆی خۆی و بە جۆرێکی پڕ و پوچ گفتوگۆ ناکا، مەگەر ئەو قورئانە سروشێکە لە لایەن خوداوە بۆی نێردراوە. چۆن ئەبێ بە ویستی خۆی گفتوگۆ بکات کەسێ نێردراوی خودا بێ و، بۆ ئەوەی خراپە و درۆ بنەبڕ بکات؟

بۆ زانین: لەم چوار ئایەتانەی دواییدا ئاماژە بۆلای ڕووداوێکی بێگومان ئەکرێ، کە زانینی ئەو ڕووداوەبە جگەی سروش نەبێ نازانرێ، ئەو ڕووداوەیش بریتیە لەوەی دوو جار جوبرەئیل بەو شێوەیە خودا دروستی کردووە، بۆ پێغەمەر دەرکەوتووە. نەك لەسەر ئە شێوەیە کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ جبرەئیلی ئەبینی کاتێ سروشی بۆ ئەهێنا، ئەو شێوەیە هەر جۆرێ بێ، هەواڵەی لای خودای مەزنی ئەکەین:

﴿ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى ﴾ ئەو سروشە ئەو قورئانەیە فریشتەیەکی زۆر بە توانا و بەهێز فێری ئەو کەسەی کردووە دانیشتووی لای ئێوەیە کە موحەمەدی کوڕی عەبدوولایە، ئەو فریشتەیە خاوەنی دیمەنێکی جوان و ئەقڵ و ئایینێکی تەواوە، دەست و دەم پاکە لە هاوردنی ئە سروشەدا، ئەو فریشتەیە جبرەئیل بوە بەو دیمەنەی شایانی خۆیەتی.

﴿ ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَى وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَى ﴾ ئەو فریشتەیە خاوەنی دیمەنێکی شیرین و بیروبۆچوونێکی تەواوە، دوایی ئەو فریشتەیە ڕاوەستا و دەرکەوت بۆ پێغەمەر لەسەر دیمەن و شێوەی ڕاستی خۆیا، بە جگەی ئەو دیمەنەی سروشی ئەهێنا بۆ پێغەمەر و، ئەو فریشتەیە دەرکەوت بۆ پێغەمەر لەلای کەناری سەرەوەی زەوی کە بریتی‌یە لە ڕۆژهەلاتەوە، یانێ خۆرئاوا بەلای خوارەوە دانراوە لای زانایان.

﴿ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى ﴾ دوای ئەوەی جبرەئیل دەرکەوت بۆ پێغەمەر لە ڕۆژهەلاتەوە بە شێوەی ڕاستی خۆی نزیك بوویەوە لە پێغەمەر و دواتر هات بۆلای پێغەمەر، دوایی بە جۆرێ نزیك بویەوە، ئەندازی دووری نێوان جبرەئیل و پێغەمەر، بە ئەندازەی درێژی دوو کەوان بوو یا کەمتر. بەودیمەنەی جاران کە سروشی بۆ پێغەمەر ئەهێنا. یانێ دوایی جبرەئیل دەرکەوت بۆ پێغەمەر لەسەر ئەو دیمەنە ڕاستەی خودا جبرەئیلی لەسە دروستکردبوو، بەرزبووبووە لە لای سەرەوە، دوای ئەوە جبرەئیل گەڕایەوە بۆلای ئەو دیمەنەی جاران سروشی ئەهێنا بۆلای پێغەمەر و، کە نزیك بوویەوە بە ئەندازەی دوو کەوان یا کەمتر لە دوو کەوان، ئەوەی ئێمە بیزانین جبرەئیل ئەهات بۆلای پێغەمەر لە شێوەی (دوحیەی کەلبیدا).

﴿ فَأَوْحَى إِلَى عَبْدِهِ مَا أَوْحَى ﴾ دوای ئەوەی جبرەئیل گەڕایەوە بۆلای دیمەنی پێشووی خۆی، خودا بەهۆی جبرەئیلەوە سروشی نارد بۆلای بەندەی خۆی کە موحەمەدە، شتێ بە سروش ئەینارد بۆلای پێغەمەری خۆی.

﴿ مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى ﴾ ئەو شتەی پێغەمەر بە چاوی خۆی بینیبووی لەبارەی دیمەنی ڕاستی جبرەئیلەوە دڵ و دەروونی پێغەمەر بە درۆی نەخستەوە و، بڵێ من تۆم نەبینیو و ناتناسم، بە ڕاستی ئەیزانی ئەوەی چاوی پێی کەوتووە جبرەئیل بووە وە هەڵەی نەکردووە.

﴿ أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى ﴾ ئایا دوایی بۆ ئێوەی بت پەرست محەمەد بەدرۆ ئەخەنەوە و گفتوگۆی پڕوپوچ ئەکەن لە سەر شتێ موحەمەد بە چاوی خۆی بینیویەتی کە بە ڕاستی جبرەئیلی بینیوە لەسەر ئەو شێوەیەی خودا دروستی کردووە، موحەمەد ئەو پیاوە ڕاست وێژە کە بۆ خۆتان ئەیناسن و، ئەزانن و دەم و زمان پاکە و ئەقڵی تەواوە و، درۆتان لێ نەبیستووە... جارێ لە زەوی جارێ تر لە ئاسمان پێغەمەر جبرەئیلی بینیوە.

﴿ وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى عِندَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى ﴾ وە بە ڕاستی موحەمەد جارێ تر جبرەئیلی بینیوە لە لای سیدرەتولمونتەهادا، کە ئەو جێگەیە کۆتایی و لای ژووررووی چوونی هەموو بوونەوەرانە و، لەو جێگەیە بەرەوژوورتر ڕێگەیان پێ نادرێت بڕۆن، ئیتر فریشتەبن یا جگەی فریشتە بن.

لە فەرموودەی خودای مەزنەوە بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ دوو جار جبرەئیلی لەسەر ئەو شێوەیە بینیوە کە خودا دروستی کردووە: جاری یەکەم ئاماژەی بۆ فەرمووە: (فاستوى وهو بالأفق الأعلى). جاری دووهەم کە لە شەوی میعراجدا جبرەئیل پێغەمەری گێڕا بەناو ئاسماندا، هەتا گەیشتنە جێگەیە کۆتایی چوونی هەموو کەسێکە هەر پلەیەکی هەبێت. زانایان زۆربەی زۆریان لایان وایە (سدره المنتهى) درەختێکی موردە لە ئاسمانی حەوتەمدایە، چۆنییەتی ئەو درەختە هەرچۆنێ بێ وا باشە ئێمە بڕوامان پێی هەبێ و هەواڵەی زانیاری خودای بکەین.

﴿ عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَى ﴾ لە لای (سیدرەتولمونتەهایە) ئەو بەهەشتەی جێگەی گەڕانەوەی ئەو کەسانەیە لە خودا ئەترسن و خۆیان لە بێفەرمانی خودا ئەپارێزن، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جێگەی گیانی شەهیدانە.

﴿ إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَى ﴾ بە ڕاستی پیغەمەر جبرەئیلی بینی کاتێ شتێکی سەرسوڕێنەر سیدرەی داپۆشیبوو لە چەندین بوونەوەران کە بەڵگەبوون لەسەر گەورەیی و توانای خودا، لە ڕووناکی و جوانیو لە فریشتە و ڕاخەری زێڕ و شتی تری وا سەرسوڕێنەر نایەنە ژمارە و ئەقڵی بۆی دیاری ناکرێن. ئەو جێگەیە ئەوەندە پیرۆزە فریشتەکان ئەچن بۆلای و زیارەتی ئەکەن بە کۆمەڵ، وەك ئێمە زیارەتی کەعبە ئەکەین.

﴿ مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى ﴾ چاوی پێغەمەر لەو شتانەی ئەبینی لای نەئەدا بۆ ئەم لاو لاو لە سنووری ئەو شتە دەرنەئەچوو فەرمانی پێدرابوو، هەموو ئەو شتانەی ئەیبینی لە بارەی جبرەئیل و ئاسمانەوە لە شەوی میعراجدا ڕاستن و گومانیان تێدا نییە، سوێند بە خودای مەزن، موحەمەد چەندین بەڵگەی گەورەی پەروەردگاری خۆی بینی لە شەوی میعراجدا، کە نایەنە ژمارە، بەجگەی توانا و دەستووری خودا کەس نایانبینێ، یەکێ لەو شتانە ڕووناکی خودای گەورە سیدرەی ڕوونکردبووەوە. ئایا ئەی بت پەرستان: لات و عوزا و مەناتی ئێوە، ئەوەی موحەمەد بینی ئەو بتانەی ئێوە بینیویانە؟

أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ
ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ ٱلذَّكَرُ وَلَهُ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ
ضِيزَىٰٓ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِىَ إِلَّآ أَسْمَآءٌ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ
ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهْوَى ٱلْأَنفُسُ ۖ
وَلَقَدْ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَٰنِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ
ٱلْءَاخِرَةُ وَٱلْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ ۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ لَا تُغْنِى
شَفَٰعَتُهُمْ شَيْـًٔا إِلَّا مِنۢ بَعْدِ أَن يَأْذَنَ ٱللَّهُ لِمَن يَشَآءُ وَيَرْضَىٰٓ ﴿٢٦﴾

﴿ أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّى وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَى ﴾ ئایا ئێوەی بت پەرست هەواڵ ئەدەن بە من ئەو بتانەی ئێوە کە بریتین لە لات و عوزا و مەناتی تری سێیەمی بێنرخ، ئەو توانا و گەورەییانە هەیە باسی خودای پێ ئەکرێ؟ بت پەرستان ئەو بتانەیان بە کچی خودا دائەنان و ئەیان پەرستن، لات ناوی ئەو پیاوە بووە قاوەتی کردووە بۆ حاجیەکان بۆ ئەوەی بیخۆن، کاتێ مرد ئەچوونە سەر گۆڕەکەی و ئەیان پەرست. لە پاشانا دیمەنێکیان بۆ کێشا و ئەیان پەرست،عوزا درەختێ بوو، هۆزی غەتنان ئەیان پەرست، پێغەمەر خالیدی کوڕی وەلیدی نارد ئەو درەختەی بڕی، مەنات بەردێ بوو هۆزی هوزەیل و خوزاعە و سوقەبن ئەیانپەرستن.

﴿ أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَى تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَى ﴾ ئایا ئێوەی بت پەرست چۆن نێرینە کە لە لای خۆتان بەڕێز و بەنرخە دای ئەنێن بۆخۆتان و، مێینەکە کە لە لاتان بێنرخن دایان ئەنێن بۆ خودا، ئەو جۆرە کارەی ئێوە، بەشکردنێکی ستەمکارانەیە و بێدادیە و، دوورە لە ڕاستیەوە.

بت پەرستان گومانیان وابوو ئەو بتانە، دیمەن و شێوەی فریشتەکانن، یا جێگەداری جنۆکەکانن و، فریشتە و جنۆکەیش کچی خوان،بەو جۆرە کارە نارەوایە وایان دانابوو، ئەوانە بۆیە ئەیان پەرستن کچی خوان، کەچی ئێوە بێز لە بوونی کچ ئەکەنەوە بۆخۆتان.

﴿ إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاء سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ ﴾ ئەو بتانە هیچ شتێ نین مەگەر ئەوانە یا بەردێکن خۆتان تاشیوتانن یا درەختێکە یا پیاوێکە و، خۆتان و باوباپیرتان ناوتان ناون بە خودا و، ئەیان پەرستن، خودا بۆ پەرستنی ئەو بتانە هیچ بەڵگەیەکی نەناردووەتە خوارەوە لە نامەیەك و جگەی نامەیە.

﴿ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَى ﴾ ئەو بت پەرستانە دوای هیچ شتێ نەکەوتوون مەگەر دوای گومان و ئارەزۆی پڕوپوچی دەروونی خۆیان کەوتوون بە ڕاستی لە لایەن پەروەردگاری خۆیانەوە پێغەمەر و نامەیەکی شارەزاکەری ڕێگەی ڕاست چوە بۆلایان و وازیان لێهێناون.

﴿ أَمْ لِلْإِنسَانِ مَا تَمَنَّى فَلِلَّهِ الْآخِرَةُ وَالْأُولَى ﴾ بۆ ئادەمیزادی بێباوەڕ نیە شتێ لای خۆشبێ و بە ئومێدی بێ، ئەڵێن: بتەکانمان بۆمان ئەپاڕێنەوە لای خودا و، ئەگەر ئێمە بچینەوە بۆلای جیهان جارێ تر، ئێمە کاری چاك ئەکەین، یا بۆ یەکێ لە دانیشتووانی گوندی مەکە و تایف ئەکرا بە پێغەمەر، دوایی هەر بۆ خودایە هەموو کارێکی پاشەڕۆژ و جیهان، هیچ کەسێ خاوەنی هیچ شتێ نی‌یە مەگەر بە دەستووری خودا، لە هەردوو جیهاندا هەرشتێ ئارەزۆی بکا ئەیبەخشێ بە هەرکەسێ ئارەزۆی هەبێ.

﴿ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَى ﴾ بت پەرستان وتیان:ئێمە بۆیە ئەو بتانە ئەپەرستین هەتا بۆمان بپاڕێنەوە لە لای خودا، خودای مەزن فەرمووی: وە زۆر فریشتە هەن لە ئاسمانەکاندا لەگەڵ ئەو هەمووە ڕێزە هەیانە لە لای خودا، پاڕانەوەیان بۆ هیچ کەسێ سودێ نابەخشێ مەگەر لە دوای ئەوەی خودا دەستووری دا بۆ پاڕانەوە بۆ فریشتەکان کە بپاڕێنەوە بۆ کەسێ ئارەزۆی هەبێ و خۆشی بوێ و شایستەبێ بۆ ئەوەی پاڕانەوەی بۆ بکرێ.

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ تَسْمِيَةَ ٱلْأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾
وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ
ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ﴿٢٨﴾ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا ٱلْحَيَوٰةَ
ٱلدُّنْيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن
سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا
فِى ٱلْأَرْضِ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَسَـٰٓـُٔوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟
بِٱلْحُسْنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَـٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَ
إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلْمَغْفِرَةِ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ
وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِى بُطُونِ أُمَّهَـٰتِكُمْ فَلَا تُزَكُّوٓا۟ أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ
بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾

﴿ إِنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ لَيُسَمُّونَ الْمَلَائِكَةَ تَسْمِيَةَ الْأُنثَى ﴾ بە ڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕ بە ڕۆژی دوایی نایەرن ناوی فریشتەکان ئەبەن بە ناوی ژنانەوە و، بڕوایان وایە کچی خودان.

﴿ وَمَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنَّ الظَّنَّ لَا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئًا ﴾ وە هیچ جۆرە زانیاری‌یەکان بەو شتە نی‌یە خۆیان ئەیڵێن، کە هاوبەش بۆ خودا دائەنێن و لایان وایە فریشتەکان منالّی خودان،ئەو کەسانە دوای هیچ شتێ ناکەون جگە لە گومان و گفتوگۆی پڕوپوچ و، گومان هیچ نابەخشێ بەرانبەر بە گوفتاری ڕاست، شتێ ڕاستبێ بە بێ زانینی بێگومان نازانرێ، ئەگەر ئادەمیزاد دوای گومان بکەون هیچ شتێ لەم جیهانەدا پایەدار نابێ، دانانی فریشتەکان بە کچ و ژنی خودا گومان پەرستی‌یە و نابێتە بەلّگە بۆ ئەوان.

﴿ فَأَعْرِضْ عَن مَّن تَوَلَّى عَن ذِكْرِنَا وَلَمْ يُرِدْ إِلَّا الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴾ دوایی تۆ واز لە کەسێ بهێنە ڕووی وەرگێڕاوە لە نامەی ئێمە و، جگە لە ژیان و ڕابواردنی جیهان هیچ شتێ تری ناوێ و مەبەستی پێی نی‌یە.

﴿ ذَٰلِكَ مَبْلَغُهُم مِّنَ الْعِلْمِ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اهْتَدَىٰ ﴾ هەلّبژاردنی جیهان و خۆشی جیهان ئەوپەڕی زانیاری و ئاواتی ئەو کەسانەیە و، وازیان لە پاشەڕۆژ هێناوە. بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زاناترە بە کەسێ لای داوە لە ڕێگەی ئایینی خۆی، هەر ئەویش زاناترە بە کەسێ ڕێگەی ڕاست وەربگرێ. بێگومان بت پەرستان و وێنەی ئەوان لە هەموو سەردەمێکدا لایان داوە لە ڕێگەی ڕاست، خودا ئەزانێ کە تۆ و باوەڕداران ڕێگەی ڕاستان گرتووە، خودا پاداشتی ئێوە ئەداتەوە بە چاکە و، سزای ئەوانیش ئەداتەوە بە گوێرەی کرداری خریان.

﴿ وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاءُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى ﴾ وە بۆ خودایە شتێ لە ئاسمانەکان و لە زەویدان لە هەموو بوونەوەران هەر خودایە ئەیانبا بەڕێوە و، خودا ئادەمیزادی درووستکردووە و، ئەزانێ بە کردەوەی هەموویان، لەبەرئەوەی پاداشتی کەسانێکی ئەوتۆ بداتەوە خراپەیان کردووە و، هاوبەشی‌یان بۆ خودا داناوە و، بە سزای شتێ کردوویانە و، کەسانێکی ئەوتۆیش چاکەیان کردووە پاداشتییان بداتەوە بە چاکە کە چوونیانە بۆ بەهەشت.

﴿ الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ ﴾ ئەو کەسانە چاکەیان کردووە و، پاداشتیان بە چاکە ئەدرێتەوە کەسانێکی ئەوتۆن خۆیان دوور ئەخەنەوە لە گوناهە گەورەکان وێنەی بت پەرستی و ئازاردانی دایك و باوك و، خۆیان دوور ئەخەنەوە لەو گوناهانەی تر کە ئەو پەڕی‌یان گرتووە لە خراپیدا وەك: داوێن پیسی و خواردنەوەی مەی، مەگەر کردنی گوناهێ بچووکبێ یا نزیکی گوناهێکی گەورە بکەون و نەیکەن، ئەو جۆرە گوناهانە خودا خۆش ئەبێ لەوان کە پەیدا ئەبن لەو کەسانەی گوناهی گەورەیان کردووە، گوناهی بچووك بە وێنەی تەماشاکردنی ژنانی بێگانە و دانیشتن لای مێزی خواردنەوەی مەی.

بۆ زانین: ووشەی ﴿ اللَّمَمَ ﴾ بە مانا نزیکبوونەوە لە گوناهە، لێرەدا مەبەستە لە گوناهی بچووك، یانێ هەرکەسێ خۆی دوورخستبێتەوە لە گوناهە گەورەکان و لەو گوناهانەی بێزیان لێ ئەکرێتەوە لێبوردن و چاکەکردنی خودای مەزن ئەیانگرێتەوە، هەرچەندێ گوناهی بچووکی کردبێ، مانای وا نیە ئادەمیزاد بۆی هەیە خۆی دوور نەخاتەوە لە گوناهی بچووك و بۆی ڕەوایە.

﴿ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ ﴾ بە ڕاستی پەروەردگاری تۆ لێخۆشبوونی فراوانە، خۆش ئەبێ لە گوناهی بچووك بەهۆی دوورکەوتنەوە لە گوناهە گەورەکان، بۆی هەیە لە هەموو گوناهێ خۆشببێ گەورەبن یا بچووك.

جیاوازی نێوان گوناهی گەورە و گوناهی بچووك: گوناهی گەورە ئەوەیە: خودا هەڕەشەی پێ بکا بە ئاگر، یا بە خەشمی خۆی، یا بە دوورخستنەوەی لە بەزەیی خۆی، یا بە سزادان، یا پەلاماری گوناه بدا بە بێ ترس و بە بێ پەشیمانبوونەوە، زۆر پێناسەی تری بۆ کراوە.

﴿ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ ﴾ پەروەردگاری تۆ زاناترە بە ئێوە لە خۆتان، یەکەمجار ئێوەی لە زەوی درووست کرد لە ئادەمەوە، دوایی لە تۆوی باوکتان کە لە خواردەمەنی زەوی پەیدا ئەبێ و، لە کاتێکەوە ئێوە بێچوێ بوون لە منالّدانی دایکتانا، ئەو شتەی لە ئێوەی ئەزانێ خۆتان نایزانن. خودا لەگەلّ ئێوەیە تا دواهەناسەتان و باشتان ئەناسێت.

﴿ فَلَا تُزَكُّوا أَنفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى ﴾ دوایی ئێوە ستایشی خۆتان مەکەن و خۆتان چاکەی خۆتان مەلّێن، پەروەردگاری تۆ زاناترە لە خۆتان بە کەسێ لە خودا بترسێ و خۆی لە بێفەرمانی خودا پاراستبێ.

هەندێ لە زانایان ئەلّێن: وەلیدی کوڕی موغەیرە باوەڕی بە پێغەمەر هێنا، هەندێ لە بت پەرستان سەرزەنشتیان کرد و ووتیان: بۆ تۆ وازت لە ئایینی گەورەکانت هێنا، ووتی: لە ترسی سزای خودا، یەکێ لەوان ووتی: هەندێ لە دارایی خۆتم بدەرێ، من ئەو سزایەی تۆ هەلّئەگرم، دوایی ڕێکەوتن لەسەر ئەندازەیە لە دارایی و هەندێکی دایە و، وەلید لە ئایین وەرگەڕا و دواتر پەشیمان بوویەوە، باوەڕی بە خودا هێنایەوە، ئەوەی مابوو لەسەری لە دارایی‌یە نەیدایە.

لەوبارەوە خودای مەزن فەرموی:

أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعْطَىٰ قَلِيلًا وَأَكْدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلْغَيْبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِى صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبْرَٰهِيمَ ٱلَّذِى وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعْيَهُۥ سَوْفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجْزَىٰهُ ٱلْجَزَآءَ ٱلْأَوْفَىٰ ﴿٤١﴾

﴿ أَفَرَأَيْتَ الَّذِي تَوَلَّى وَأَعْطَى قَلِيلًا وَأَكْدَى ﴾ ئایا موحەممەد تۆ هەواڵ ئەدەی بە من لە بارەی پیاوێکی ئەوتۆ وازی لە باوەڕهێنان هێنا. کەمێ لە دارایی خۆی بەخشی بە پیاوێ‌تر، بۆ ئەوەی ئەو پیاوە لە جیاتی ئەو بچێتە دۆزەخ و، ئەو پیاوە دوایی پەشیمان بوویەوە، ئەو شتەی مابووە لەسەری‌لەو دارایی‌یە بیدا نەیدایە و لای ڕاست نەبوو بیداتێ.

﴿ أَعِندَهُ عِلْمُ الْغَيْبِ فَهُوَ يَرَى ﴾ ئایا ئەو کەسەی وازی لە باوەڕهێنان هێنا و، گەڕایەوە بۆلای بت پەرستی، ئەو دارایی‌یەی مابووەوە لەسەری نەیدا بە پیاوەکەی تر، لای هەبوو بزانێ بە شتێ لەبەر چاو نی‌یە لە کاروباری ڕۆژی دوایی، بزانێ ئەو پیاوە لە جیاتی ئەم سزای ڕۆژی دوایی هەڵئەگرێ، دوایی وابزانێ سزای ئاگری دۆزەخ لەسەر بت پەرستی پارچە قوماشێکە و ئەفرۆشرێ و ئەکڕرێ و بە چاوی خۆی ئەیبینێ.

﴿ أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَى وَإِبْرَاهِيمَ الَّذِي وَفَّى ﴾ ئایا ئەو کەسەی وازی هێنا لە باوەڕهێنان لە تەوراتی موسادا و لە نامەی ئەو ئیبراهیمەی ئەوتۆ هەموو فەرمانەکانی خودای بەجێ هێنا هەواڵی نەداوەتێ بەم فەرموودانەی دوایی کە لە نامەکانی ئەواندان:

١- ﴿ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى ﴾ کە بە ڕاستی هەموو ئادەمیزادێ سزای نادرێ بە گوناهی کەسێ تر و، هیچ یەکێ هەڵناگرێ لە جیاتی یەکێ تر قورسایی باری کەسێ تر.

٢- ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى ﴾ وە کە بە ڕاستی بۆ هیچ ئادەمیزادێ نیە هیچ پاداشتێ مەگەر شتێ ئادەمیزاد خۆی کردبێتی و خۆی تێدا ماندوو کردبێ‌لە چاك و لە خراپ.

٣- ﴿ وَأَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرَى ﴾ وە کە بە ڕاستی ئەو کردارە لە ڕۆژی دواییدا بە ئادەمیزاد نیشان ئەدرێ لە تەرازوی بەراوردی کارەکانی.

٤- ﴿ ثُمَّ يُجْزَاهُ الْجَزَاءَ الْأَوْفَى ﴾ لە پاشا ئەو ئادەمیزادە پاداشتی ئەدرێتەوە بە پاداشتی تەواوی کردەوەکان و، بە بێ زۆر کردنی کارە خراپەکانی و، هەمووی لە نامەی کرداریا تۆمارکراوە، خودای مەزن بە میهرەبانی خۆی پاداشتی چاکەکانی بە (١٠)ە چەنانە یا زۆرتر پێ ئەبەخشێ.

وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلْمُنتَهَىٰ
﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴿٤٤﴾
وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوْجَيْنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلْأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ
عَلَيْهِ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُخْرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ
ٱلشِّعْرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهْلَكَ عَادًا ٱلْأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَا۟ فَمَآ أَبْقَىٰ ﴿٥١﴾
وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلْمُؤْتَفِكَةَ
أَهْوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾

هَٰذَا نَذِيرٌ مِّنَ النُّذُرِ الْأُولَىٰ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ الْآزِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنْ هَٰذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمْ سَامِدُونَ ﴿٦١﴾ فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا ۩ ﴿٦٢﴾

٥- ﴿ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الْمُنتَهَىٰ ﴾ وە کۆتایی هاتنی هەموو بوونەوەران و گەڕانەوەیان هەر بۆلای پەروەردگاری تۆیە و، هەر ئەو پاداشتییان ئەداتەوە و، بە گوێرەی کرداریان چاکبێ یا خراپ.

٦- ﴿ وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ ﴾ وە کە بە ڕاستی هەر پەروەردگاری تۆیە هێزی پێکەنین و گریان و خۆشی و خەفەت دروست ئەکا بۆ ئادەمیزاد، بە تایبەتی خۆشی و خەفەت بۆیان لە هەردوو جیهاندا.

٧- ﴿ وَأَنَّهُ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا ﴾ وە کە هەر پەروەردگاری تۆیە گیانداران ئەمرێنێ لە جیهاندا و، زیندوویان ئەکاتەوە لە پاشەڕۆژدا، هەر ئەویشە باوکان بمرێنێ و منداڵەکانیان دروست بکا و لە جێگەی ئەوان دایان بنێ، جگەی خودا ئەو توانایەی نی‌یە. کەواتە گفتوگۆی کەسێ بڵێ: (المادة) یانێ شتێ تر لەگەڵ ئەودا پەیدابێ، بنچینە و هۆی ژیانە گفتگۆی ڕوونە، ئەقڵ بەدرۆی ئەخاتەوە چونکە (مادة) خۆی لە خۆیا ناجووڵێ مەگەر بەهۆی شتێ جگەی خۆی بێ، هیچ ئەقڵێ وەری ناگرێ شتێکی کەڕی کوێر، خۆی لە خۆیەوە پەیدابێ و ببێ بە بنچینەی هەموو شتێ.

٨- ﴿ وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ﴾ وە کە بە ڕاستی پەروەردگاری تۆ لە هەموو ڕەگەزێ دوو جۆری درووستکردووە: نێرینە و مێینە، هەموو گیانداری خودای مەزن درووستی کردوون.

﴿ مِن نُّطْفَةٍ إِذَا تُمْنَىٰ ﴾ لە ئاوی نێرینە کاتێ ئەڕژێتە ناو منداڵدانی مێینە، دوایی یا بێچووی‌یەکی نێر یا بێچووی‌یەکی مێی لێ پەیدا ئەبێ، ئایا جگەی خودا چ کەسێ بێ ئەو ئامادەبوونەی منالبوون پەیدا بکا؟

بەڵام لەبیرمان نەچێ خودا خاوەن توانا ئادەم و حەوا و عیسای لە تۆوی نێرینە درووست نەکردوون. ئادەمی ڕاستەوخۆ لە خاك درووستکردووە، حەوای لە ئەندامێکی ئادەمەوە درووست کردووە، گیانی کردوون بە بەردا، عیسای درووستکردووە بەهۆی فووی جبرەئیلەوە بە لەشی مەریەمدا، بەبێ ئەوەی هیچ پیاوێ دەستی لێی کەوتبێ.

٩- ﴿ وَأَنَّ عَلَيْهِ النَّشْأَةَ الْأُخْرَىٰ ﴾ وە بە ڕاستی لەسەر پەروەردگاری تۆیە درووستکردنێکی تر و، گەڕانەوەی گیان بۆ لەشی ئادەمیزاد، دوای مردنیان لە پاشەڕۆژدا.

١٠- ﴿ وَأَنَّهُ هُوَ أَغْنَىٰ وَأَقْنَىٰ ﴾ وە بە ڕاستی هەر پەروەردگاری تۆیە هەندی لە بەندەکانی خۆی ئەوەندە سامانیان بداتێ پێویستییان بە کەسی تر نەبێ و، بە هەندێ تریان ببەخشێ ئەوەندە دارایی لە خۆیان زیاتر بێ و هەڵی بگرن و، هۆی سامانداری و هەڵگرتنی دارایی بۆ ئامادەکردوون.

١١- ﴿ وَأَنَّهُ هُوَ رَبُّ الشِّعْرَى ﴾ بەڕاستی هەر پەروەردگاری تۆیە، پەروەردگاری ئەستێرەی شیعرا، شیعرا ئەستێرەیەکە لە کاتی گەرمایی زۆردا، دوای ئەستێرە جەوزا هەڵدێ و، هۆزی خوزاعە ئەیان پەرست و، ئەیان ووت: خودای ئێمەیە، خودای مەزن فەمووی: شیعرا خودا نی‌یە و من پەروەردگاری ئەوم، یەکەم کەس پەرستی (ئەبو کەبشە بوو) چونکە ڕۆیشتنی بە ئاسماندا جیاوازە لەگەڵ ڕۆیشتنی ئەستێرەکانی تر، ناویشیان ئەبرد بە (کلب الجبار)، گەورەترە لە خۆر بە بیست جار.

١٢- ﴿ وَأَنَّهُ أَهْلَكَ عَادًا الْأُولَى ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ تاقمی عادی یەکەمی لەناوبرد کە تاقمی هود بوون، زانایان ئەڵێن: عادی دووهەم بریتین لە تاقمی ئیرەم، هەندێ تریان لایان وایە بریتین لەو بێباوەڕانە دوای تاقمی هود پەیدابوون، بنەبڕوون و هیچیان نەمایەوە.

١٣- ﴿ وَثَمُودَ فَمَا أَبْقَى ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ تاقمی سەمودی لەناوبرد، کە تاقمی ساڵحبوون، دوایی هیچ کام لە تاقمی عاد و لە تاقمی سەمود هیچیان نەمانەوە و، بنەبڕبوون.

١٤- ﴿ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُوا هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغَى ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە بەرلە تاقمی عاد و سەمود تاقمی نوحمان لەناو بردبوو، لەبەر ئەوەی تاقمی نوح ستەمکارتر و لە سنوور دەرچووتربوون لە هەردوو تاقمەکە، ئازاری زۆری نوحیان ئەدا و، لە نوحیان ئەدا بە جۆرێ هۆشی بە خۆیەوە نەئەما.

١٥- ﴿ وَالْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوَى فَغَشَّاهَا مَا غَشَّى ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە لەناومان برد دانیشتووانی گوندی موئتەفیکە، گوندەکەمان بەرزکردەوە و خستمانە خوارەوە بە دانیشتووانەکانییەوە بۆ سەر زەوی، دوایی ئەو گوندەی داپۆشی ئەو سزا سەختەی داپۆشین، (موئتەفیکە) گوندی تاقمی لوتە، بە مانا (ئەم دیودیو کرا بە دانیشتوانیەوە) وە.

بۆ زانین: ئەم (١٥) شتانەی باسکران، هەموویان لە نامەکانی موسا و ئیبراهیمدا باسیان کراوە، بۆیەش لێرەدا هێنراون، چونکە ئەو پیاوەی لە ئایین وەرگەڕا و، هەندێ دارایی خۆی دا بە یەکێ تر لە جیاتی ئەم بڕواتە دۆزەخ و، ئەوەی مابوەوە بەسەریەوە نەیدایە پیاوێکی ژیر بوو، ئەیزانی ئەو (١٥) باسانە لە نامەکانی موسا و ئیبراهیمدا هاتوون.

﴿ فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكَ تَتَمَارَى ﴾ دوای ئەوەی خودای مەزن باسی ئەو (١٥) ئامۆژگاری‌یانەی فەرموو، هەرکاتێ ئادەمیزاد بەوانە تەمێ خواربوون، هەموو یەکێ لەوانە چاکەیەکی خودان، بۆیە فەرمووی: دوایی تۆ گومانت لە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردەکەی خۆتانا ئەبێ، کە هەموویان بەڵگەن لەسەر توانای خودا. بێگومان پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ گومانی لێ‌ناوەشێتەوە.

﴿ هَذَا نَذِيرٌ مِّنَ النُّذُرِ الْأُولَى ﴾ ئــە قورئانــە، یــا موحەمــەد، یــا لــەناوبردنی ئــەو گەلانــەی ڕابوردن، ترسێنەری ئــادەمیزادبوون، هــەندێکن لەوانــەی پێشــوو ئادەمیزدیــان ترســاندووە لــە بێفەرمانی خودا، هەموو کەسێ بەرپرسیارە لە تــاوانی خــۆی و بــەرتیل دان بــۆ لابردنــی ســزا بێسوودە، خودا تەماشای کرداری ئادەمیزاد هەر بۆ سوودی خۆی ئەکات. پاشەڕۆژی تاونباران هەر لەناو چوونە.

﴿ أَزِفَتْ الْآزِفَةُ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ اللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴾ هــاتنی ڕۆژی دوایــی نزیکــە، هیــچ کەســێ توانای دەرخستنی کاتی ڕۆژی دووایی نی‌یە لە جگەی خودا. ﴿ الْآزِفَةُ ﴾ بە مانا نزیکیە، دیــارە ڕۆژی دوایی نزیکە.

﴿ أَفَمِنْ هَذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ وَأَنتُــمْ سَامِدُونَ ﴾ ئایــا ئێــوە دوایــی، سەرتان سوڕئەمێنێ لــە پــەیدابوونی ڕۆژی دووایــی و، لــە فــەرموودەکانی قورئــان، بــە گاڵتــە پێکردنەوە ئێوە پێئەکەنن و، بڕواتان بە بوونی ڕۆژی دوایی و بە فەرموودەکانی قورئان نی‌یــە، ئێوە ناگرین و خەفەت ناخۆن بۆ ئەو خراپانەی ئەیکەن و ئەو شتەی لە کیسی خۆتانتان داوە و، ئێوە بێئاگان لەوەی کە بەسەرتان دێت.

﴿ فَاسْجُدُوا لِلَّهِ وَاعْبُدُوا ﴾ دوایی ئێوە پێویستە سوژدە ببەن بۆ خــودا و، هــەر بــۆلای ئــەو بگەڕێنەوە، پێویستە ئێوە هەر خودا بپەرستن و، واز لە بت پەرستی و ڕابواردنی جیــهان بــهێنن. سوژدەبردنی خوێندنی قورئان لە وێنەی خوێندنی ئەو ئایەتــە لای شــافیعیەکان و مالیکی‌یــەکان سونەتە، لای حەنەفی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان پێویستە.

بۆ ئاگاداری: لەمەولەر لەبەرەئەوەی مانــای ئایەتــەکان پــەیوەندی‌یان بــە یەکــەوە هــەبوو، نەمانتوانی لە مەبەستی ئایەتی (٣٩) ی ئەم سورەتە تێبگەین ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّا مَا سَعَى ﴾، زانایان بیربۆچوونیان جیاوازە، ئایا ئادەمیزاد بە جگەی کردەوەی خۆیان سوودیان پێ ئەگات، یا سود لە جگەی کردەوەی خۆیان وەرناگرن؟ هەندێ لە زانایان ئەڵێن: ئــە ئایەتــە پــەوەندی بــە تاقمی موسا و ئیبراهیمەوە هەیە، کە سوودیان لە کــردەوەی جگــەی خۆیانیــان وەرنــەگرتووە، بەڵام ئۆمەتی پێغەمەری ئیسلام سوود لە کردەوەی جگەی خۆیان وەرئــەگرن، لەبــەر ئەمانــەی خوارەوە:

بۆ زانین: لەمەوبەر لە باسی ماناکردنی ئایەتی (٣٩) ی ئەم سورەتە ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَانِ إِلَّــا مَا سَعَى ﴾ باسی هەندێ شتی بە سوود نەکرا، من وای بە باش ئەزانم باسیان بکەین:

زانایان لەمەبەستی ئەو ئایەتە بیربۆچوونیان جیاوازە: ئایا کردەوەی جگەی خۆی سوودی پێ ئەبەخشێ یا نە؟ هەندێکیان ئەڵێن: مەبەست لە هاتنە خــوارەوەی ئــەو ئایەتــە، بــۆ نەتــەوەکانی

ئیبراهیم و موسایە کە کــردەوەی جگـەی خۆیـان سـوودیان پـێ نەئەبەخشـین. بـەڵام ئۆمـەتی موحەمەدکردەوەی جگەی خۆیان سوودیان پێئەبەخشـێ، بەڵگـەیان فـەرموودەی خودایـە لـە ئایەتی (٢١)ی سورەتی توردا ئەفەرموێ ﴿ ألحقنا بهم ذریتهم بأیمـان ﴾ و، فـەموودەی پێغەمـەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەموێ:

﴿إذا مات الإنسان إنقطع عمله إلا من ثلاثة صدقة جاریة أو علم ینفع به أو ولد صالح یدعـو لـه ﴾، بە چەند فەموودەی تری پێغەمەری خودا ﴿ﷺ﴾، هەروەها هەموو موسڵمانان تێکـڕا پێکـهاتوون لـەسەر ئەوەی کردەوەی جگە خۆ سوود ئەبەخشێ. کەواتـە ئەگـەر کەسـێ بڵـێ: کـردەوەی جگەی خۆ سود بەخش نیە دەرچوونە لـە ڕیزی کۆمەڵی ئیسلام، بۆ باشـتر چەسـپاندنی ئـەوەی کە کردەوەی جگەی خۆ سود بەخشە خاوەنی تەفسیری (جەمەل) لـە بەرگی چوارەم، لاپـەڕەی (٢٣٦) نموونەی بۆ ڕوونکردنەوەی ئەومەسەلـەیە زانای بەناوبانگ (ئیبنوتەیمیە) گێڕاوەتەوە، بـۆ باشتر متمانەیش تەماشای تەفسیری خازین بکەن.

# ﴿ سورەتی ئەلقەمەر ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگـە لـە ئایەتـەکانی (٤٥-٤٦) لـە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٥٥) ئایەتن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا
وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ
وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣﴾ وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّنَ الْأَنبَاءِ
مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكْمَةٌ بَالِغَةٌ فَمَا تُغْنِ النُّذُرُ
﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِ إِلَىٰ شَيْءٍ نُّكُرٍ ﴿٦﴾
خُشَّعًا أَبْصَارُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴿٧﴾
مُّهْطِعِينَ إِلَى الدَّاعِ يَقُولُ الْكَافِرُونَ هَٰذَا يَوْمٌ عَسِرٌ ﴿٨﴾

**﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾**

**بەناوی خودا بەخشندەی میهرەبان**

﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ الْقَمَرُ ﴾ بە ڕاستی نزیکە هاتی ڕۆژی دوایی و، پارچەپارچـەبوونی مانگ و بکەوێتە خوارەوە لە ئاسمان و، ئەستێرەکان بکەونە هاتوچۆ، وەکـو خۆیـان نەمێننـەوە، دوایی هەندێکیان بدەن لە هەندێ تریان، مانگ بدا لە ئەستێرەیە تر لـە کـاتی گـەڕانیدا، بـەم لاولای زەوی‌دا پارچەپارچە ببێت.

زۆر لەو زانایانەی مانای قورئانیان کردووە، ئەڵێن: بت پەرستان داوایان لـە پێغەمـەر کـرد داوا لـە خودا بکات کە مانگ ببێ بە دوو پارچە و، وەکـو خـۆی لێبێتـەوە ئەگـەر تـۆ ڕاسـت ئەکەی پێغەمەری.دوایی مانگ بوو بە دووپارچە.

بێگومان هەرچەندە ئەو کارەساتە خۆی لـە خـۆی‌دا بوونەکـەی ئـەگونجێ و خـودا توانـای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە بەڵام گونجاو شتێکە و پەیدابوون شتێ ترە، پەیدابوونەکەی پێویستی بە بەڵگەی بێگومان هەیە، بگرە بەڵگە لەسەر پێچەوانەکەی هەیە.بەهۆی ئەم بەڵگانەوە:

١- بوونی ئەو ڕووداوە ڕێك ناكەوێت لەگەڵ ژمارەیەكی زۆر لە ئایەتەكانی قورئان كە بە ڕاستی ئەڵێن: پێغەمەر وولامی داخوازی بت پەرستان نادادەوەبۆ پەیدابوونی كاری پەك خەر، لە تێكدانی كاری سروشتی، وولامی شتێ ئەداتەوە خودا فەرمانی پێ دابێ، بۆ نموونە: خودا لە سورەتی ئەلئەعرافدا، لە ئایەتی (١٤٦) ئەفەرموێ: ﴿ و إن یروا كل أیة لا یؤمنون بها ﴾ وە ئەگەر بێ باوەڕان هەموو كارە پەك خەرەكان ببینن باوەڕی پێناهێنن.

٢- لەتبوونی ڕووداوێكی گەردوونی مێژوویی گرنگە كەواتە ئەگەر ببوایە دانیشتووانی خۆرهەلات و خۆرئاوا ئەیانبینی و، زانایانی مێژونووس و جگەی ئەوانیش تۆماریان ئەكرد، وەك كەوتنە خوارەوەی (١٢) بورج لە كۆشكە كیسرادا لە شەوی لە دایكبوونی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾.

٣- پارچەپارچەبوونی مانگ بە فەرموودەیبێگومان و موتەواتیر هەواڵی پێنەدراوە، بەڵگو بە جگەی متەواتر هەواڵی پێدراوە بۆ ئەوجۆرە كارانە، دوژمنانی پێ بێدەنگ ناكرێ. موتەواتر ئەوەیە: كۆمەڵێكی زۆری ئادەمیزاد هەواڵ بدەن بە شتێ، بە گوێرەی ئەقڵ ئەو ژمارەیە كۆنەبنەوە لەسەر درۆی ئەو كارە. جگەی ژمارەیەكی بەو جۆرە نابنە هۆی متمانەی گشتی.

٤- فەرموودەی ﴿ انشَقَّ الْقَمَرُ ﴾ لە دووای ﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ ﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوی پارچەپارچەبوونی مانگ لە ڕۆژی دواییدا ئەبێ، وەك لە سورەتی (ئەلئین شیقاقدا) ئەفەرموێ ﴿ إذا السماؤ إنشقت ﴾ یانێ تۆ بیری ئەو كاتە بكەرەوە، ئاسمان لەت لەت ئەبێ و پارچەپارچە ئەبێ و كاتێ خودا بیەوێ و، بونەوەران لەناو ببا،ئەو كاتە ئادەمیزاد بە خزمەت خوای خۆیان ئەگەن.

﴿ وَإِن يَرَوْا آيَةً يُعْرِضُوا وَيَقُولُوا سِحْرٌ مُّسْتَمِرٌّ ﴾ وە ئەگەر بێ باوەڕان بەڵگەیە لەسەر توانای ئێمە و ڕاستی داواكاری موحەمەد ببینن ڕوو وەرئەگێڕن و چاوی خۆیانی لێكوێر ئەكەن و ئەڵێن: ئەو بەڵگەیە جادوویەكی بەردەوامی كۆتایی پێنەهاتووە.

﴿ وَكَذَّبُوا وَاتَّبَعُوا أَهْوَاءَهُمْ وَكُلُّ أَمْرٍ مُّسْتَقِرٌّ ﴾ وە ئەو بێباوەڕانە ڕاستی هاتنی پێغەمەر و هاتنی ڕۆژی دوواییی بەدرۆ ئەخەنەوە و، دوای ئارەزۆی پڕوپوچی خۆیان ئەكەون، هەرچەندە بەڵگەی ڕاستیشیان لەسەربێ و هەموو شتێ خودا بەڵێنی پێداوە كۆتایی پێدێ لە كاتی خۆیا، هیچ شتێ لە خودا پەنهان نییە، كە یەكێ لەوانە وازهێنانە لە فەرموودەكانی قورئانی پیرۆز.

﴿ وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّنَ الْأَنبَاءِ مَا فِيهِ مُزْدَجَرٌ ﴾ بە ڕاستی هاتووە بۆلای ئێوەی بت پەرست بەهۆی قورئانەوە شتێ كە لەو شتەدا هەیە بێباوەڕان كۆتایی بە بێباوەڕی خۆیان بهێنن، ئامۆژگاریكردن بۆیان لە هەواڵی گەلانی ڕابردوو سزادانیان.

﴿ حِكْمَةٌ بَالِغَةٌ فَمَا تُغْنِ النُّذُرُ ﴾ ئەو شتە بریتییە لە قورئان كە ئامۆژگاری و بەڵگەدانان لەسەر ڕاستی ئەوپەڕی گرتووە، بەلام دوایی ترساندنی قورئان و پێغەمەران هیچ سودێ بە بێ باوەڕان نابەخشێ.

﴿ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِ إِلَى شَيْءٍ نُّكُرٍ ﴾ دوایی تۆ واز لە بێباوەڕان بهێنە و مەیانترسێنە، ترسان هیچ سودێ بەوان نابەخشێ، تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە خودا فەرمان ئەدا بە ئیسرافیل فو بکا بە سوردا و بانگیان بکا بۆلای شتێ کە دڵی ئادەمیزاد لای خراپە و بۆی هەڵناگیری کە بریتیە لە سزای گرانی خودا.

﴿ خُشَّعًا أَبْصَارُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ الْأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُّنتَشِرٌ ﴾ ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە ئادەمیزاد لە گۆڕەکانیان دێنە دەرێ بە کزۆڵی و چاو بەرەوخوار، بە وێنەی کولە بڵاوئەبنەوە و دێن بە یەکا ئەوەندە زۆرن و سەرگەردان.

﴿ مُّهْطِعِينَ إِلَى الدَّاعِ يَقُولُ الْكَافِرُونَ هَذَا يَوْمٌ عَسِرٌ ﴾ بە پەلە ڕا ئەکەن و ملیان هەڵئەبڕن بۆلای ئەو کەسەی بانگیان ئەکا، بێباوەڕان ئەڵێن: ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی ترسناك و زۆر گرانە. لەبەر ئەوەی نیشانەی ئازار ئەبینین.

كَذَّبَتْ
قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا
رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ﴿١٠﴾ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُّنْهَمِرٍ
﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾
وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِّمَن كَانَ
كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٥﴾ فَكَيْفَ كَانَ
عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ
﴿١٧﴾

﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ﴾ لە پێش تاقمی بت پەرستان تاقمەکەی نوح پێغەمەری خۆیانیان بەدرۆخستەوە، دوایی ئەو تاقمە نوحی بەندەی ئێمەیان بەدرۆخستەوە و، ووتیان: ئەو شێتە و، ئازاریان ئەدا و نەیان ئەهێشت فەرمانی ئێمە ڕابگەیەنێ و هەڕەشەیان لێ ئەکرد.

﴿ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ﴾ دوای ئەوەی تەنگیان پێ هەڵچنی پەنای برد بۆلای خودا و لە پەروەردگاری خۆی پاڕایەوە کە بە ڕاستی توانای نەماوە و، کۆتایی بە کاری ڕاگەیاندنی من هاتووە، جگە لەوەی تۆ بنەبڕیان بکەی هیچ شتێ تر بە دەستەوە نەماوە، دوایی تۆ بە سزای خۆت تۆڵە لەوان بکەرەوە، یاریدەی پێغەمەری خۆت بدە.

﴿ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاء بِمَاء مُّنْهَمِرٍ ﴾ دوایی ئێمە بە ئاوێکی زۆری بەخوڕ دەرگای ئاسمانمان کردەوە و بارانێکی زۆرمان باراند، دوایئەوەی هەزار ساڵ ئامۆژگاری کردن بێ سوود بوو، فەرمانمان پێدابوو کەشتییەکی درووستکردبوو.

﴿ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاء عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴾ وە ئێمە چەندین کانیاومان لە زەویدا هەڵقوڵاند، دوایی ئاوی ئاسمان و زەویی گەیشتن بە یەك، زەریایەکی زۆر گەورەیان لێپەیدابوو، لەسەر ئەو فەرمانەی خودا بە ڕاستی دیاریکراوبوو بۆ لەناوبردنیان و، هەموویان بە ئاوی ئەو زەریایە خنکان.

﴿ وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ ﴾ وە ئێمە نوحمان دانا لەسەر کەشتییە خاوەنی چەندین تەختەی درەخت و چەندین بزمار و گوریس بۆ بەستنەوەی هەروەك هەموو کەشتییەکانی تر.

﴿ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاء لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴾ بەڵام ئەم کەشتییەی نوح ئەڕۆیشت بەناو ئاودا، بەهۆی چاودێری ئێمە و پاراستنی ئێمە، بۆیە ڕزگاریان بوو لە ترسی خنکان، ئێمە نوحمان ڕزگار کرد، لەبەر پاداشت دانەوەی نوح کە بە ڕاستی نوح چاکەی خودا بوو، بۆ نەتەوەکەیی و سوپاسیان نەکرد.

﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە هەواڵی کەشتی نوحمان بەجێ هێشت بۆ گەلانی داهاتووبە ئامۆژگاری کردن و تەمێ‌کردن بۆ کەسێ پەند وەربگرێ و سود بە ترساندنی وەربگرێ.ئایا دوایی کەسێ هەیە سودی لێوەربگرێ و بترسێ لە سزای خودا؟

﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾ دوایی تۆ تەماشا بکە بە چ جۆرێ بۆ سزادانی من و ترساندنی من. بە ڕاستی ئەو لافاوە زۆر ڕاستە و، نوحیش ڕاستی کرد لەو شتەی کە ڕایگەیاند بە تاقمەکەی خۆی و ئەوانی ترساند.

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە مانای قورئانمان ئاسانکردووە بۆ ئامۆژگاری، لەبەرئەوەی سودی لێوەربگیرێ، نەك بۆ ئەوەی لە کاتی پرسە و شتی تردا بخوێنرێت، ئایا دوایی کەسێ هەیەتەمێ وەربگرێ و ڕانومایی وەربگرێ؟

كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ
رِيحًا صَرْصَرًا فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ النَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ
نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ
لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٢٢﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوا أَبَشَرًا
مِّنَّا وَاحِدًا نَّتَّبِعُهُ إِنَّا إِذًا لَّفِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ

مِنۢ بَيۡنِنَا بَلۡ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٞ ﴿٢٥﴾ سَيَعۡلَمُونَ غَدٗا مَّنِ ٱلۡكَذَّابُ
ٱلۡأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرۡسِلُواْ ٱلنَّاقَةِ فِتۡنَةٗ لَّهُمۡ فَٱرۡتَقِبۡهُمۡ وَٱصۡطَبِرۡ ﴿٢٧﴾
وَنَبِّئۡهُمۡ أَنَّ ٱلۡمَآءَ قِسۡمَةُۢ بَيۡنَهُمۡۖ كُلُّ شِرۡبٖ مُّحۡتَضَرٞ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوۡاْ صَاحِبَهُمۡ
فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ
صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلۡمُحۡتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ
لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٣٢﴾

﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُر ﴾ تاقمی عاد بەدرۆیان خستەوە پێغەمەرەکەی خۆیان کە هود بوو، دوایی چۆنبو سزای ئێمە و، ترساندنەکانی ئێمە، دوایی ئێمە سزای ئەوانماندا بە سزایەکی ئازاردەر، سزاکەیش ئەوەبوو

﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرّ ﴾ بە ڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆ سەریان بایەکی سەخت و زۆر سارد و سامناك لە ڕۆژێکی نەگبەت و ناخۆش بۆیان و، بەردەوامبوو هەتا لە ناوی بردن.

﴿ تَنزِعُ النَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُر ﴾ ئەو بایە ئادەمیزادی لە جێگەی خۆیان دەرئەهێنا وفرێی ئەدانە سەر زەوی بە وێنەی درەختی خورما لە بن دەرهاتبێ و ڕاکشابێ، دوایی ئێوە بەچۆنی ئەزانن سزای ئێمە و، ترساندنەکانی ئێمە بە چ جۆرێ ڕسوامان کردن؟

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە مانای قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاری کردن و تەمێ کردنی ئادەمیزاد، ئایا کەسێ هەیە ئامۆژگاری و پەندەکەی وەربگرێ لە ماناکەی بگا بە ئاسانی؟

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُر ﴾ تاقمی سەموودی سەر بە ساڵح، هەموو پێغەمەرەکانی منیان بە درۆخستەوە، چونکە بە درۆخستنەوەی ساڵح وەك ئەوە وایە هەموو پێغەمەرەکانی بە درۆخستبێتەوە لەبەر ئەوەی سەرچاوەی هەموویان یەکن.

﴿ فَقَالُوا أَبَشَرًا مِّنَّا وَاحِدًا نَّتَّبِعُهُ إِنَّا إِذًا لَّفِي ضَلَالٍ وَسُعُر ﴾ دوایی تاقمی سەموود وتیان: ئایا ئێمە چۆن دوای کەسێ لە ڕەگەزی ئادەمیزاد وەك ئێمە بکەوین، بە ڕاستی ئێمە ئەو کاتەی دوای بکەوین لە ناو گومڕایی و شێتیدا ئەبین، شتی وا ناگونجێ ئێمە دوای بکەوین، ئەگەر فریشتە بووایە دوای ئەکەوتین.

﴿ أَؤُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ مِن بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴾ ئایا چۆن هاتووەتە خوارەوە سرووش بە تەنها لە ناو ئێمەدا و، لەناو ئێمەدا هەیە کەسێ شایستە ترە بۆ پێغەمەرایەتی. بەڵکو ساڵح زۆر درۆزنە و خۆ گەورە زانێن پاڵی پێوە ناوە بڵێ: من بووم بە پێغەمەر.

﴿ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ الْكَذَّابُ الْأَشِرُ ﴾ ئەو تاقمە کە بەیانی سزا هاتە خوارەوە ئەزانن چ کەسێ زۆر درۆزنە و خۆی بە گەورە ئەزانێ، ساڵح پێغەمەرە یا ئەو تاقمە بێباوەرانە؟

﴿ إِنَّا مُرْسِلُو النَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ ﴾ بە ڕاستی ئێمە ئەو هوشترەی ئەوان داوای ئەکەن دەری ئەهێنن و ئەینێرن بۆلای ئەوان بۆ تاقی کردنەوەی ئەوان و جیابوونەوەی پاك و پیسی کەمێ ئەی ساڵح تۆ چاوەڕان بکە و ئارام بگرە لەسەر ئازاری ئەوان، لەمەودوا تۆ ئەبینی چ شتێ توشی ئەوان ئەبێ لە سزا و بێنرخی و ڕسوایی ئەوان.

﴿ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴾ وە تۆ هەواڵ بدە بە تاقمی سەمود کە بە ڕاستی ئاوی ئەو بیرە بەشکراوە لە نێوان ئەوان و ئەو هوشترەدا بە نیوەیی، هەموو بەشێ لەو ئاوە خاوەنەکەی ئامادەبێ بۆی لەسەرەی خۆیا و لە ڕۆژی دیاریکراوی خۆیا، هیچ لایەکیان لە سنووری دیاریکراوی خۆیان دەرنەچن و، تاقمی سەمود بەو بەشکردنە ڕازی نەبوون.

﴿ فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَى فَعَقَرَ ﴾ دوایی تاقمی سەمود بانگی خراپترین هاوڕێی خۆیانیان کردکە ناوی (قوداری کوڕی سالیفی ئوحەیمری سەمودی بوو) کە ئەو هوشترە سەربڕێ، دوایی ئەو پیاوە خراپە بەبێ ئاوڕدانەوە بۆلای فەرمانی خودا شمشێری خۆی هەڵگرت و پەلاماری هوشترەکەیدا و کوشتی و گۆشتەکەیان دابەش کرد بە ناو خۆیانا.

﴿ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾ دوایی چۆن بوو بە چ جۆرێ بوو سزادانی من و ترساندنەکانی من بۆ ئەوان، لە دوای سەربڕینی ئەو هوشترە. بێگومان ئەو سزایە بنەبڕی کردن.

﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ ﴾ بەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆ سەریان جبرەئیل تاکە دەنگێکی گەورەی کرد بەسەریانا، دوایی بە وێنەی پوش و پەلاشێکیان لێهات ئامادەکرابێ بۆ خواردنی ئاژاڵ و ببێ بە تۆز و بای گران ببیا.

زانایان لە مەبەست لە مانای (فتعاطي) بیروبۆچوونیان جیاوازە: هەندێکیان ئەڵێن: ئەو پیاوە خراپە مەی خواردەوە و سەرخۆشبوو هوشترەکەی سەربڕی، هەندێ تریان ئەڵێن: ئەو پیاوە خراپە ئامێر و کەل و پەلی سەربڕینی هەڵگرت و، ڕووی کردە لای هوشترەکە وسەری بڕی.

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە مانای قورئانمان ئاسانکردووە بۆ ئامۆژگاری کردن و تەمێ کردنی ئادەمیزاد، ئایا دوایی هەیە کەسێ ئامۆژگاری وەربگرێ و تەمێ خواربێ؟

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا
عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّا آلَ لُوطٍ نَّجَّيْنَاهُم بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا
كَذَٰلِكَ نَجْزِي مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا

بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ فَذُوقُواْ
عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدۡ صَبَّحَهُم بُكۡرَةً عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ ﴿٣٨﴾
فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ
﴿٤٠﴾ وَلَقَدۡ جَآءَ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ ٱلنُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذۡنَٰهُمۡ
أَخۡذَ عَزِيزٖ مُّقۡتَدِرٍ ﴿٤٢﴾

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ ﴾ تاقمی لوت بەدرۆیان خستەوە هەموو پێغەمەرەکان بە لوتیشەوە کە ئەیانترساندن لە سزای خودا، تاقمەکانی نوح و عاد و سەمود و جگەی ئەوان پێغەمەرەکانی خۆیانیان بە درۆئەخستەوە، بۆیە خودای مەزن سزای دان و ئەفەرموێ:

﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّا آلَ لُوطٍ نَّجَّيْنَاهُم بِسَحَرٍ ﴾ بە ڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆ سەریان بایەکی زۆر سەخت و فڕەی ئەدا بەسەریانا زیخ و بەرد، هەموویان بنەبڕبوون بە جگەی خێزانەکەی لوت کە بریتی بوون لە دوو کچی و ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێنابوو، ئەوانمان ڕزگار کرد لە کۆتایی شەودا و بەر لە بەیانی.

﴿ نِعْمَةً مِّنْ عِندِنَا كَذَلِكَ نَجْزِي مَن شَكَرَ ﴾ ئێمە ئەوانمان ڕزگارکرد، لەبەر چاکەیە لەلایەن ئێمەوە بۆ ئەوان، هەروەبەو جۆرەی ئێمە ئەو چاکەیەمان کرد لەگەڵ ئەوان، ئێمە پاداشتی کەسێ ئەدەینەوە سوپاسی چاکەی ئێمە بکا و باوەڕمان پێ بهێنێ.

﴿ وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ ﴾ وە بە ڕاستی لوت ئەو تاقمەی ترساند بە سزای سەختی ئێمە، دوایی گومانیان برد لەو ترساندنەی ئێمە و گاڵتەیان کرد بە لوتو هەڕەشەیشیان لێ کرد.

﴿ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَا أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾ وە بە ڕاستی ئەو تاقمە داوایان لە لوت کرد لە بارەی مێوانەکانیانەوە کاری خراپیان لەگەڵ بکەن، ئەو میوانانە فریشتەبوون لە شێوی کوڕی جوانداببوون، دوایی ئێمە چاوی ئەو تاقمەمان کوێرکرد و مێوانەکانی لوتیان نەبینی، دوایی بەهۆی زمانی فریشتەکانەوە، بەوانمان ووت: ئێوە بچێژن سزای سەختی من و، ئەو شتەی ئێوەی پێ ئەترساند لە سزای من.

﴿ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴾ وە بە ڕاستی سەرلەبەیانی سزایەکی بەدەوام تووشی ئەوانبوو، شوێنەوارەکەی بەردەوامە هەتا ڕۆژی دوایی، ئەیانسپێری بە دۆزەخ.

﴿ فَذُوقُوا عَذَابِي وَنُذُرِ ﴾ دوایی ئێوە بچێژن سزای من و ئەو شتەی لوت ئێوەی پێ ئەترساند و باوەڕتان پێ نەئەکرد و گاڵتەتان پێ ئەکرد.

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە مانای قورئانمان ئاسان کردووە بۆ ئامۆژگاری و تەمێ وەرگرتن، دوایی ئایا کەسێ هەیە ئامۆژگاری وەربگرێ و تەمێ خواربێ؟

﴿ وَلَقَدْ جَاءَ آلَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذْنَاهُمْ أَخْذَ عَزِيزٍ مُّقْتَدِرٍ ﴾ وە بە ڕاستی چوبوو بۆلای فیرعەون و تاقمەکەی چەندین ترسێنەرەکانی ئێمە لە موسا و هارون و، ئەو شتەی نێررابوو بۆ مووسا لە بەڵگە ئاشکراکانی ئێمە، دوایی ئەو تاقمە هەموو بەڵگە ئاشکراکانی ئێمەیان بە درۆخستۆتەوە، دوایی ئێمە سزای ئەوانمان دا بەوێنەی سزای کەسێکی زۆر بە دەستەڵات و بە توانا، هیچ شتێ ڕێگەی پێ ناگرێ.

أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُوْلَٰٓئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَآءَةٌ
فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴿٤٤﴾ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ
وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَٱلسَّاعَةُ أَدْهَىٰ وَأَمَرُّ
﴿٤٦﴾ إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَٰلٍ وَسُعُرٍ ﴿٤٧﴾ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ
عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾
وَمَآ أَمْرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِٱلْبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَآ
أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ
فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُّسْتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ
فِي جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴿٥٥﴾

﴿ أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِّنْ أُوْلَئِكُمْ أَمْ لَكُم بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ ﴾ ئایا بێباوەڕانی ئێوەی عەرەب چاکتن و بەهێزترن لەو بێباوەڕانەی ڕابوردوون و پێغەمەرەکانی خۆیانیان بەدرۆخستۆتەوە و بنەبڕبوون، یا بۆ ئێوە هەیە لەو نامەیە هاتووە بۆ پێغەمەرەکانمان ڕزگاربوونی ئێوەی بێباوەڕ لە سزای خودا، با ئێوە بێباوەڕیش بن، بێگومان ئێوە لەوان چاکتر نین و، ڕزگاربوونیشتان لە هیچ نامەیەکدا بۆتان نەنووسراوە.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ نَحْنُ جَمِيعٌ مُّنتَصِرٌ ﴾ ئا ئێوە ئەڵێن: ئێمە کۆمەڵێکین بەتوانا و هیچ کەسێ سەرناکەوێ بەسەر ئێمەدا و، هیچ زۆرداری بەسەر ئێمەدا زاڵ نابێ، بێگومان ئێوە بەو جۆرەیش نین و ژێر ئەکەون و بێتوانایشن.

﴿ سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ ﴾ لەمەودوا بەم نزیکە تاقمی بێباوەڕانی قورەیش هێزیان نامێنێ و، کۆمەڵیان پارچە پارچە ئەبێ، ئەشکێن و، بە شکاوی بەرەودووا ڕائەکەن و هەڵدێن.

ئەو فەرموودەی خوای مەزنە هاتە دیی، ئەوەبو لە جەنگی بەدردا شکان و بەرەودوا ڕایان کرد، ئاڵای ئیسلام و موسڵمانان بەرزکرایەوە. هەندێ لە هاوڕێکانی پێغەمەر لە کاتی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەیان ووت: ئێمە مانای ئەو ئایەتە نازانین. بەڵام لە ڕۆژی بەدردا کە پێغەمەر فەرمووی: (سیهزم الجمع) ئەو کاتە مانای ئەو ئایەتەیان بۆ ڕوونبوویەوە.

﴿ بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ ﴾ بەڵکو هاتنی ڕۆژی دوایی بە ڕاستی کاتی سزادانی بێباوەڕانە هەر لە تاقمی سەردەمی نوحەوە هەتا ئەم سەردەمەی پێغەمەر و، هاتنی ڕۆژی دوایی سزاکەی زۆر سەختتر و تاڵتزە بۆ بێباوەڕان لەم سزایەی ڕۆژ جیهان و قاوەڵتیە بۆیان.

﴿ إِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ﴾ بە ڕاستی تاوانباران لە ناو گومڕایی و لەناوچووندان لە جیهاندا و، لە پاەڕۆژیشدا لە ناو ئاگری گەرمی دۆزەخدان، تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە تاوانباران ڕائەکێشرێن لەسەر ڕومەتیان لەناو ئاگری دۆزەخدا، بەوان ئەبێژرێ: بچێژن سزای سەختی دۆزەخ و سوتانی ئەو.

﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴾ بەڕاستی ئێمە هەموو شتێکمان دروست کردووە بە ئەندازەیەکی دیاریکراو و ڕێك و پێك بە گوێرەی توانا و زانستی خۆمان و، بەڕوونکردنەوەی بەسەرهاتیان و کات و جێگەیان. هەموو شتێ لەم گەردوونەدا بە گوێرەی ویستی ئێمەیە، هیچ شتێکمان بەبێسوود درووست نەکردووە، هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیدا دائەنێین.

﴿ وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ ﴾ وە کاروفرمانی ئێمە بۆ پەیداکردنی هەمو شتێ پێویستی بە هیچ شتێ نییە بە جگەی یەك شت و دوو پیت نەبێ، ئەوەیش فەموودەی ئێمەیە بە هەرشتێ بمانەوێ پێی ئەڵێین (کن فیکون) تۆ ببە و دوایی ئەو شتە ئەبێ کوتوپڕ بە گورجی و کەمترین کات، بە وێنەی ئاماژە و فڕەدانی چاو بە گورجی یا کەمتر.

﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ ﴾ وە بە ڕاستی وێنەی ئێوەی تاوانبار لە گەلانی ڕابردوودا لەناومان بردن و بنەبڕمان کردن، بێگومان ئێوەیش لەناو ئەبەین، دوایی ئایا کەسێ هەیە ئامۆژگاری وەربگری و تەمێ خواربێ و، پەشیمان ببێتەوە باوەڕبهێنێ بەر لەوەی تووشی بەدبەختی و سزای گران ببێ و، کاتێ پەشیمان بونەوە بەسەر بچێ.

﴿ وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ ﴾ هەموو شتێك ئادەمیزاد کردوویانە لە چاك و لە خراپ نووسراوە و دانراوە، تۆمارکراوە لەسەریان بە تەواوی لە نامەی کرداریان و فریشتەکان ئەیاننوسن و لای ئەوان ئەپارێزرێ، هەتا کاتی ڕۆژی دوایی.

﴿ وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُسْتَطَرٌ ﴾ وە هەموو کردەوەیەکی بچووك و گەورە لـە کردەوەکانی ئادەمیزاددا تۆمارکراوە لـە لەوحەل مەحفوزدا، پرسیاریان لێئـەکرێ، کەواتـە بـا ئێمـە خۆمـان پرسیار لـە خۆمان بکەین بۆ کارەکانمان.

﴿ إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍ ﴾ بە ڕاستی ئەو کەسانەی لـە خودا ترساون و بێفەرمانی خودایان نەکردووە و بڕوایان بە ڕۆژی دوایی بوە لـە نـاو چـەندین بەهەشت و، لەلای چـەندین ڕووبـاری ئـاوی شیرینداندان لـە جێگەیـەکدا ڕاسـت و پەسـەندە، گفتوگۆی بێسوودی تێدا ناکرێ، لەلای ڕێز و چاکەی پاشایەکی زۆر بە توانا و هەموو شتێ لـە ژێر چاودێر ئەودایە.

# ﴿ سورەتی ئەڕەحمان ﴾

لە مەکە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لەزانایان لایان وایە لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە، هەندێ تریان لایان وایە، هەندێ لەو سوورەتە لە مەکە هاتووەتە خوارەوە، هەندی تری لە مەدینە. ژمارەی ئایەتەکانی (٧٨) ئایەتن.



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴿٣﴾
عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ﴿٤﴾ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ﴿٥﴾ وَٱلنَّجۡمُ
وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ﴿٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ
﴿٧﴾ أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ
وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴿١٠﴾
فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ
وَٱلرَّيۡحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

خودای مەزن لەم سورەتەدا باسی چاکەی زۆری خۆی بەسەر بەندەکانی خۆیا ئەکا، پێشەکی بە بەخشندەیی زۆری خۆی دەست پێ ئەکات لەسەرەتای ئەم سورەتەدا، چونکە بە ڕاستی ئەو ووشەیە هێمایە بۆ چاکەکردن و گەورەیی خودای مەزن و ئەفەرموێ:

﴿ الرَّحْمَنُ عَلَّمَ الْقُرْآنَ ﴾ خودای خاوەنی بەخشندەیی زۆر قورئانی فێری موحەمەد کردووە، بەهۆی ئەوەوە فێری هەموو بەندەکانی خۆی کردووە، ئەو قورئانەی ناردووە بۆ ئەوەی بەندەکانی خۆی بە ناوەرۆکی ئەو قورئانە فێری سودی هەردوو جیهان بن.

قورئانی پیرۆز وێنەی هەموو گەردوونە، بگرە بالاترە لە چەند ڕوویەکەوە: قورئان فەرموودەی خودایە، گەردوون و هەموو بوونەوەران بە وشەی (کن) پەیدابوون، قورئان و

هەموو بوونەوەران بە هۆی هەست و ئەقڵەوە بەڵگەن لەسەر توانای خودا، وێنەی قورئان جگەی خودا کەسی تر ناتوانێ داینێ، بوونەوەرانیش جگەی خودا کەسی تر ناتوانێ دروستیان بکات. گەردوون یانێ ئاسمانەکان بەچاو ئەبینرێ، قورئان بە گوێ ئەبیسرێ. بە ڕاستی خودای مەزن دوو نامەی هەیە: یەکەمیان قورئانە ئەخوێنرێتەوە و ئەبیسرێ، دووهەمیان گەردوونە ئەبینرێ و هەستی پێ ئەکرێ، قورئان چاکەی گەورەی خودایە، بەخشیویەتی بە بوونەوەران و، یاسای بێوێنەیە بۆ سوودی هەردوو جیهان، ئادەمیزاد وجنۆکە فێری ڕێگەی ڕاستیان ئەکا، بەختیاری هەردوو جیهان فێرئەبن، هەر بۆیەش خودای مەزن چاکەی خۆی ڕوون ئەکاتەوە بە قورئان و بە ئاسمان و بە خۆر و مانگ و زەوی و باران، بە درەخت و با و باران و چوارپێ و بەهەشت و دۆزەخ.

لێرەدا باسی ئازایی و لە خۆبردنی موسڵمانان ئەکەین کاتێ قورئان بە نهێنی ئەهاتە خوارەوە و بە نهێنی ئەخوێنرایەوە، لە ترسی ئەوەی بێباوەڕان نەیبینن و ئازاریان نەدەن. هاوڕێکانی پێغەمەر وتیان: ئەگەر قوڕەیشی‌یەکان ئەو قورئانە ببین و بە ئاشکرایی و بخوێنرێ لەوانەیە سودی ببێ. دوایی عەبدوڵای کوڕی مەسعود ووتی: من بە ئاشکرایی قورئان ئەخوێنم، پێیان ووت: تۆ بێ‌کەسیت و ئەترسن لێت بدەن، با پیاوێکی هۆزدار ئەو کارە بکات و، خزمانی بەرگری لێ‌بکەن و، عەبدوڵای کوڕی مەسعود و ڕۆیشت و لەلای جێگەی دانیشتنی ئیبراهیم و لەلای خانەی خودا بە دەنگی بەرز ئەم سورەتەی (ئەڕەحمانی) بەسەر قوڕەیشی‌یەکاندا خوێندەوە، قوڕەیشی‌یەکان هەریەکەیان لە جێگەی خۆیانەوە بیستیان ووتیان کوڕی (ئوموعەبد) چ شتێ ئەڵێ؟ ووتیان: گومانی وایە موحەمەد ئەو قورئانەی بۆ نێرراوە، پەلاماریان دا و دەستیان کرد بە لێدانی و ڕوومەتیان بریندار کرد.

گێڕراوەتەوە (قەیسی کوڕی عاسیمی مینقەری) هاتە خزمەت پێغەمەر ﴿ﷺ﴾، ووتی: لەوەی بۆت هاتووەتە خوارەوە بۆت بۆم بخوێنەرەوە، پێغەمەر سورەتی ئەڕەحمانی بەسەردا خوێندەوە. قەیس ووتی: سوێندم بە خودا، ئەم قورئانە لەسەرەوە ڕەوانەی کراوە، سود بەخشە، باوەڕی هێنا.

﴿ خَلَقَ الْإِنسَانَ عَلَّمَهُ الْبَيَانَ ﴾ خودای خاوەن بەخشندەیی، ڕەگەزی ئادەمیزادی درووستکردووە و، فێری ڕوونکردنەوەی هەموو شتێکی کردوون لە دەروونیاندایە، بە گفتوگۆ و نووسین و ئاماژە و شتی تر، یەکتری تێ‌بگەیەنن بە هەمو جۆرێ مەبەستیان بێ، چاك و خراپ ڕوون ئەکەنەوە بۆ یەکتری. بەڵام گفتوگۆ گەورەترین شتێکە بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو شتێ بەهۆی زمانەوە. زمان ڕام کراوە بۆ ئادەمیزاد و لە هەموو ئەندامەکانی تری زۆرتر ئەجووڵێ و ماندوو نابێ وەك ئەندامەکانی تری ئادەمیزاد. بێباوەڕی و باوەڕهێنان، هەموو ڕەوشت و زانیاری و هونەر، هەموو ئایینێ، بەهۆی زمانەوە ڕوون ئەبنەوە.

﴿ الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ ﴾ خۆر و مانگ دێن و ئەڕۆن، بەجۆرێکی دیاری‌کراو بۆیان، بە دەستورێکی نەگۆڕاو، بە جۆرێ ژیـانی بوونـەوەران مسۆگەر ئەکـەن لـە ڕووی زەوی‌دا، بـە جۆرێکی پێویست وەرز و مەبەست دیاری ئەکەن، لـە ڕۆژ و مـانگ و سـاڵ و کـاتی مامەڵـە و کاتی پەرستن.

﴿ وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ ﴾ وە ئەو ڕووەکانە بە ڕووی زەوی‌دا ئەکێشین و لاقیان نی‌یـە وەك کولەکە و، شوتی و ترۆزی و ئەو درەختانەی بەسەر لاقی خۆیان بـەرەوژوور ئـەڕۆن وەك خورما و قەیسی و هەڵوژە و درەختی تر، بی‌گوێرەی سروشتی خۆیان بەو جۆرەی خودا بیـەوێ فەرمانبەرداری خودان، بە وێنەی سوژدەبردنی ئادەمیزاد و فەرمانبەرداریان بۆ خودای مەزن.

﴿ وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا وَوَضَـعَ الْمِـيزَانَ ﴾ وە خـودای خـاوەن بەخشـندە ئاسمانـەکان و هـەموو ئەستێرەکانی درووست کردوون و، بەرزی کردوونەتەوە بە گوێرەی جێگـەیان و بـە گوێـرەی پلەوپایـەی خۆیـان چونکـە جێگـە فریشتەکان و هاتنـە خـوارەوە فەرمانـــەکانی خـــودان و، دادپەروەری داناوە و فەرمانی داوە بە دادپەروەریی. مەبەست لـە میزان هەموو شتێکە چۆنی‌یەتی و ئەندازەی هەموو شتێکی پێ‌بناسرێ، وەك تەن و کیلۆ و مەتر و تەرازو، بە وێنـەی سـروش و ئەقڵ و دادپەروەری و ستەمیان دیاریکردووە. ئەو دادپەروەری‌یەی دانا بۆ ئەوەی:

﴿ أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ ﴾ لـەبەر ئـەوەی ئێـوە لـە سـنووری دادپـەروەری و یاسـای خـودا دەرنەچن، لـەو سنوورەیش دەرنەچن کە بۆتان دیاری‌کراوە لـە کێشـانە و پێوانـەدا و لـە کـاتی کڕین و فرۆشتن و مامەڵـە کردندا.

﴿ وَأَقِيمُوا الْوَزْنَ بِالْقِسْطِ وَلَا تُخْسِـرُوا الْمِـيزَانَ ﴾ وە ئێـوە کێشـانەکانتان بـەرپا بکـەن بـە جۆرێکی دادپەروەری و، دەست درێژی مەکەنە سەر یەکتری و، لـە کێشانەدا کـەم مـەدەن بـە ئادەمیزاد و، ترازوبازی مەکەن زۆر بۆ خۆتان مەبەرن و کـەم بـدەن بـە جگـەی خۆتـان، هـەر کۆمەڵگایە پشت بە دادپەروەری ببەستن بە بەختیاری و ئاسوودەیی ئەژین.

ئەو ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا، هەر بەو جۆرەی خودای مەزن ئاسمانەکان و زەوی بـە جۆرێکی دادپەروەرانە ڕای‌وەستاندوون و، ئاڵۆز نابن لـە یەکتری، ئێـوەی ئـادەمیزادیش کـار و کردەوەکانتان ڕێك و پێك بێت و پیلان و فێڵ بۆ یەکتری مەسازێنن.

﴿ وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ فِيهَا فَاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذَاتُ الْأَكْمَامِ ﴾ و خودای خـاوەن بەخشـندەی زەوی ئامادەکردووە و ڕامی کردووە بۆ سودی بوونەوەران لـە ئـادەمیزاد و جنۆکـە و ئـاژاڵ و باڵندە، بۆی کردوون بە ڕاخەر هەتا بە بێ ئازاری‌یەوە بەسەریەوە بژین، لەناو زەوی‌دا هەیە لـە میوەی جۆراوجۆر لـە خواردن و خواردنــەوە، لـە خورمـای خـاوەن قوزاخـە و لـەت ئـەبێ و بەرهەمەکەی دێتە دەرێ لـە کاتی خۆیا.

﴿ وَالْحَبُّ ذُو الْعَصْفِ وَالرَّيْحَانُ ﴾ وە لـە ناو زەودا هەیە دانەوێڵەیە خاوەنی ئاڵفی بێ‌زمانانە لـە کا و لـە گەڵای درەخت و، لـەویشا هەیە ڕەیحانە بۆبۆن و جوانی و خواردن. هـەموو یـەکێ لـەو شتانە چاکە و پیتی زەوین خودای خاوەن بەخشـندەی کردوونـی بـەهۆی ژیـان و خۆشـی ئادەمیزاد و، چاکەی خودای مەزنن.

﴿ فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴾ دوایی ئێوەی ئادەمیزاد و جنۆکەبە چ چاکەیـە لـە چاکانـەی پەروەردگاری ئێوە بە ئێوەی بەخشیوە باوەڕ نایەرن و بەدرۆی ئەخەنەوە و سوپاسی ناکەن.

بۆ زانین: خودای مەزن لەم سورەتەدا (٣١) جار ئەو ئایەتەی دووپات کردووەتەوە، هەشت جاریان لـە دوای ئەو ئایەتانەوە هاتوون، باسی ئەو بوونەوەرانە ئەکەن کـە زۆر سەرسوڕهێنەرن هەر لـە کاتی درووستکردنیانەوە، هـەتا کۆتـایی پێهاتنیـان، حـەوت جاریـان لـە دوای چـەند ئایەتێکەوە هاتوون، باسی ئاگر و سەختی ئازاری دۆزەخ ئەکەن، هەشتی تریان هاتووە لـە دوای ئەو ئایتانەوە باسـی دوو بەهەشـت ئەکـەن و باسـی ئـەو کەسـانە ئەکـەن کـە خـودای مـەزن ئەیبەخشێ بەوان ئەو دوو بەهەشتە. هەشت جاری تریان هاتوون لـە دوای باسی دوو بەهەشـت ئەکا لـە جگەی ئەو دوو بـە هەشـتانەی پێشـووکە ئـەدرێن بـەو کەسـانە پلەوپایـەیان کـەمترە لەوانەی پێشوو کە پێیان ئەبێژرێ ﴿ أصحاب اليمين ﴾، هەموو یەکێ لەو (٣١) ئایەتانە ڕووی پێئەکرێ بۆلای ئادەمیزاد و جنۆکە، هەریەکەیان بۆ مەبەستێکی تایبەتی‌یە جگەی ئەوی تریـان، بۆیە ئەو دووپات کردنەوەیە سوودی زیاترە بۆ تەمێکردنی ئادەمیزاد و جنۆکە.

خلق

ٱلْإِنسَٰنَ مِن صَلْصَٰلٍ كَٱلْفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلْجَآنَّ
مِن مَّارِجٍ مِّن نَّارٍ ﴿١٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾
رَبُّ ٱلْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ ٱلْمَغْرِبَيْنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾
مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ
رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ
﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ
وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٢٨﴾ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ كُلَّ يَوْمٍ هُوَ فِى شَأْنٍ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾

لەمەوبەر خودای مەزن بە کورتی باسی چاکەکانی خۆی فەرموو، وەك درووستکردنی ئادەمیزاد و خۆر و مانگ و هۆی گەشەکردنی کشت وکاڵ و درەخت، لەمەودوا بە دریژەی باسیان ئەکا یەك لە دوای یەك و، ئەفەرموێ:

﴿ خلق الإنسان من صلصال کالفخار ﴾ وە ئیمەی خاوەن بەخشندە ئادەمی باپیرە گەورەی هەموو ئادەمیزادمان درووستکردو لە گلیکی وشك، کاتێ دەستی لیبدرایە، دەنگیکی لێ‌پەیدائەبوو بە وینەی خاکیك سوور کرابیتەوە.

﴿ وخلق الجان من مارج من نار ﴾ وە ئیمە باپیرە گەورەی هەموو جنۆکەکانمان درووستکردووە لە گریکی بێدووکەڵ لە ئاگر، ئەو ئاگرە زەرد بووبێ یا سور یا شین مەبەستەکە ناگۆرێ.

بۆ ئاگاداری: زانایان لەبارەی توانای خودا و، درووستکراوەکانی ووتوویانە: دەرکەوتووە جانەوەرێ هەیە بە هەوای ژەهراوی ئەژی، جۆرێ تریان هەیە لە ناو چالی نەوت و کەرەسەی سوتەمەنیدا ئەژی، هەیانە بە جگەی ناوی ئاو ناژی، هەیانە بە جگەی ناوی ئاگر ناژی.

﴿ فبأي آلاء ربکما تکذبان ﴾ دوایی بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردەکەری خۆتان باوەر نایەرن و بەدرۆیان ئەخەنەوە، ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە لە گڵ و لە ئاگر درووستکراون، بوون بە خاوەنی گیان.

﴿ رب المشرقین ورب المغربین فبأي آلاء ربکما تکذبان ﴾ خودای پەروەردگاری دوو هەلهاتنی خۆرە: یەکەمیان بۆ هاوین و ئەوی تریان بۆ زستان، بیگومان لە نیوان هەلهاتن و ئاوابوونی خۆردا، چەند جیگەیەکی تر هەن بۆ هەلهاتن و ئاوابوونیان، پەروەردگاری هەلهاتنی دوو جیگەیە، یەکیکیان بۆ خۆر و ئەوی تریان بۆ مانگ، پەروەردگاری ئاوابوونە دوو جیگەیە، یەکیکیان بۆ خۆر و ئەوی تریان بۆ مانگ، دوایی ئیوە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بەدرۆیان ئەخەنەوە، بە چاکەی هەلهاتنی خۆر و مانگ و ئاوابوونیان باور نایەرن کە هەموو گیانداران پیویستیان بە هەلهاتن و ئاوابوونیان هەیە و، بێ ئەوان ژیانی سەرزەوی راناوەستێ؟

﴿ مرج البحرین یلتقیان بینهما برزخ لا یبغیان فبأي آلاء ربکما تکذبان ﴾ خودا دوو دەریای بەرەڵا کردووە ئەگەن بە یەکتری، لە نیوان ئەو دوو دەریایەدا پەردەیە لە توانای خودا هەیە، هیچ یەکیکیان دەستدریژی ناکاتە سەر ئەوی تریان، سروشتیان ناگۆرێ، وەك خۆیان ئەمیننەوە، لە شیرینی و تالی و سویریدا، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە باوەر بە چ چاکەیە لە چاکەکانی خودا نایەرن.

﴿ یخرج منهما اللؤلؤ والمرجان فبأي آلاء ربکما تکذبان ﴾ دینە دەرەوە لەو دوو دەریایەدا لۆلۆ و مرواری، ئە وفەرموودەیەی خودا پیمان ئەناسینێ کە لۆلۆ و مرواری لە ئاوی شیرین و

تاڵ دینە دەرەوە هەرچەندە بە زۆری لە دەریای تاڵ دینە دەرێ، ئەگەر ببیــژرێ: مەلەوانــەکان هەموو کاتێ لە ناو دەریای تالدا ئەیان هیننە دەرێ، لە وولامدا ئەبیژرێ: ئە کەسانەی کــە بــە چۆلایی زەویدا ئەگەرین و، زۆر شتیان لا پەنهانە، ئیتر چــۆن لــە توانــادا هەیــە هــەموو قولایــی دەریایان بۆ روون ببیتەوە و، لەوانەیە لە هەردوو دەریاکاندا بینە دەرێ، فەرموودەی خودایــش جیگەی بروایە، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە باوەر بە چ چاکەیە لە چاکەکانی خودا نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە.

﴿ وله الجوار المنشآت في البحر كالأعلام فبأي آلاء ربكما تكذبــان ﴾ وە بــۆ خــودا هەیــە لەناو دەریادا چەند کەشتی بەرزکراونەتەوە بــە وینــەی کیوەکــان و، درووســتی کــردوون بــۆ سوودی ئیوە و، ریگەی دوورتان بۆ نزیك ئەخاتەوە و، بازرگانییان بەســـەرەوە ئەکــەن، دوایــی ئیوە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی خودا باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە.

﴿ كل من عليها فان ويبقى وجه ربك ذو الجلال والإكرام فبــأي آلــاء ربكمــا تكذبــان ﴾ وە هەموو کەسیك و هەموو شتیك بەسەر زەوییەوەیە لــەو شــتانەی باســکران لــە نــاو ئــەچن و، پەروەردگاری تۆ بە تەنها ئەمینیتەوە، خودایەکی ئەوتۆیە خاوەنی گەورەیی و ریزگرتنە لە بــەندە نیاز پاکەکانی خۆی، خودا خۆی بۆخۆی پەیدابووە و لە ناو ناچێ، هــەر ئەوەیشــە ســەرچاوەی هەموو شتێ، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن؟

﴿ يسأله من في السماوات والأرض كل يوم هو في شأن فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ هــەموو کەسێ لە گیاندارانی نــاوی ئاسمانــەکان و زەوی لــە خــودا داوای مانــەوەی خۆیــان و هــەموو پیویستییەکانیان ئەکەن، هەر خودایە یارمەتی مانەوەیان ئەدات، ئەگەر کەمتر لــە چاونوقاندنــێ وازیان لێبهینێ، هیچ شتێ نامینێ و باسیان ناکرێ، هەر کاتێ بروا، چەند کارێ پــەیدا ئــەکا و، ئەو کاتە ئەگۆرێ و بوونەوەرانی تازە درووست ئەکات، بە گویرەی ویست و ئــارەزۆی خــۆی زیندوو ئەکات و ئەمرینێ، ئەبەخشێ بە هەندێ کەس دارایی و ئەگەریتەوە لە هەندێ تر، پلەو پایە ئەدا بە هەندێ کەس و سەرخوار ئەکا کەسێ بیەوێ، رزگار ئەکا هەندێ کــەس و ئــازاری هەندێ تر ئەدا. کەواتە کاروباری ئەم جیهانە و ژیــانی بوونــەوەران ئــەگۆرین و تــازە ئەبنــەوە. دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایــەرن و بەدرۆیان ئەخەنەوە؟

سَنَفْرُغُ لَكُمْ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ

أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ
إِلَّا بِسُلْطَٰنٍ ﴿٣٣﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا
شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَٱلدِّهَانِ
﴿٣٧﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُسْـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ
إِنسٌ وَلَا جَآنٌّ ﴿٣٩﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾
يُعْرَفُ ٱلْمُجْرِمُونَ بِسِيمَٰهُمْ فَيُؤْخَذُ بِٱلنَّوَٰصِى وَٱلْأَقْدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَىِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِى يُكَذِّبُ بِهَا ٱلْمُجْرِمُونَ
﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ حَمِيمٍ ءَانٍ ﴿٤٤﴾ فَبِأَىِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٤٥﴾

﴿ سنفرغ لكم أيها الثقلان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ ئەی دوو تاقمی ئادەمیزاد و جنۆکە سەرشانی خۆتانتان قورس کردووە بە گوناه و بێفەرمانی ئیمەتان کردووە، ئیمە خۆمان تەرخان ئەکەین بۆ پرسیار و پاداشتی ئیوە لە رۆژی دواییدا، ئەم ئایەتە هەڕەشەیە بۆ ئادەمیزاد و جنۆکە ئەگینا بەبێ گومان هیچ کارێ لە رۆژی دوواییدا ریگە لە کردنی هیچ کاریکی خودا ناگرێ، هەتا خودا خۆی بۆ تەرخان بکا. دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بەدرۆیان ئەخەنەوە: بە توانای خودا لەسەر زیندووکردنەوەتان و پاداشت بە شتێ تر باوەر نایەرن؟ پرسیار و پاداشت گەورەترین چاکەی خودایە، ئەگەر وانەبێ ئەبێ ستەم لی‌کراو لە هەردوو جیهاندا خراپتربێ لە ستەمکار.

﴿ يا معشر الجن والإنس إن استطعتم أن تنفذوا من أقطار السماوات والأرض فانفذوا ﴾ ئەی تاقمی جنۆکە و ئادەمیزاد: ئەگەر ئیوە ئەتوانن کە دەربچن لە گۆشە و کەناری ئاسمانەکان و زەوی و، لە ژیر توانای ئیمە دەرچن، دوایی ئیوە دەرچن ئەگەر ئەتوانن.

﴿ لا تنفذون إلا بسلطان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ ئیوە ناتوانن دەرچن و رزگارتان ببێ مەگەر بەهۆی دەستەلاتیکی گەورەوە. بیگومان ئیوە ئەو دەستەلاتەتان نیـە، چونکە بۆ هەر جیگەیە برۆن دەستەلاتی ئیمە بەرەنگارتان دەبێ، بە جگەی گەرانەوەتان بەرەو ئیمە و بە پەشیمان بوونەوەتان رزگارتان نابێ. ئەوەیش تاکە هیزە ئیوە رزگار بکا، ناتوانن لە دەست مردن رابکەن.

بە جۆرێ تر مانای ئەو ئایەتە کراوە: ئەگەر ئێوە ئەتوانن دەرچن لە گۆشە و کەناری ئاسمان و زەوی بۆ ئەوەی ئەو شتانەی لەواندان بیانزانن، دوایی ئێوە دەرچن بۆ زانینیان. بەڵام ئێوە ناتوانن دەرچن مەگەر بەهۆی هێز و تواناوە، کە خودا بتانداتێ لە فێربوونی زانست و زانیاری. دوایی ئێوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بەدرۆیان ئەخەنەوە؟ بە توانای ئەو بەسەرتانا؟ یا بە ترساندن و شتێ تر؟

﴿ یرسل علیکما شواظ من نار ونحاس فلا تنتصران فبأي آلـاء ربکمـا تکذبـان ﴾ لەرۆژی دووایدا ئەریژرێ بەسەرتانا کلپەی سەوزی بێ دووکەڵ لە ئاگری دۆزەخ و، ئەریژرێ بەسەرتانا مسی تواوەی گەرم، دوایی ئێوە رزگارتان نابێ لە سزای ئازاردار، دوایی ئێوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بەدرۆیان ئەخەنەوە؟ بە سزادانی کەسێ یاخی بووبێ لە خودا یا بە شتێ تر باوەر نایەرن؟

﴿ فإذا انشقت السماء فکانت وردة کالدهان فبأي آلاء ربکما تکذبان ﴾ دوایی کاتێ ئاسمان پارچە پارچە ئەبێ بە هەموو ئەستیرەکانەوە ئەتوینەوە بە وینەی توانەوەی رۆن بەسەر ئاگرەوە و، رەنگی هەموو توانەوەیە وەك رەنگی گوڵی سووری لێهات، مەبەست لەو رستەیە ئاماژەیە بۆ کاولبوونی گەردوون لە رۆژی دووایدا، دوایی ئێوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بەدرۆیان ئەخەنەوە؟ بە راستی فەرموودەی خودا یا بە شتێ تر باوەر نایەرن؟

﴿ فیومئذ لا یسأل عن ذنبه إنس ولا جان فبأي آلـاء ربکمـا تکذبـان ﴾ دوایی ئەو رۆژەی ئاسمانەکان ئەتوینەوەن پرسیار لە گوناهی ئادەمیزاد و جنۆکە ناکرێ، چونکە گوناهەکانیان نووسراوە و ئەزانرین، دوایی ئێوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن، بە جیگەی وەستانتان بۆ پرسیار، یا بە جیگەی چاوەروانکردنتان باوەر نایەرن؟ با ئەوەیش بزانرێ لە هەندێ کاتا پرسیار ئەکرێ لە بارەی گوناهەکانیانەوە، لیرە پرسیار ناکرێ و لەوێ چاوەروان ئەکەن؟

﴿ یعرف المجرمون بسیماهم فیؤخذ بالنواصي والأقدام فبأي آلاء ربکما تکذبان ﴾ تاوانباران بە نیشانەی خۆیانەوە ئەناسرین، دوایی لە لایەن فریشتەکانەوە ئەگیرین و بە مووی سەریان و بە قاچیان رایان ئەکیشن، فرەیان ئەدەن بۆناو ئاگری دۆزەخ. دوایی ئێوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە.

﴿ هذه جهنم التي یکذب بها المجرمون یطوفـون بینـها وبیـن حمیـم آن فبـأي آلـاء ربکمـا تکذبان ﴾ فریشتەکانی سەرپەرشتیکەری دۆزەخ ئەڵین: ئەمەیە ئەو دۆزەخەی ئەوتۆ تاوانباران بروایان پیی نەبوو، بە درۆیان ئەخستەوە، تاوانباران ئەرۆن بەنیو دۆزەخدا و بە نیو ئاوی زۆر گەرمدا و، لەو ئاوە گەرمە ئەخۆنەوە، دوایی ئێوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن.

وَلِمَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفْنَانٍ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيْنَانِ
تَجْرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٍ
زَوْجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشٍۭ
بَطَآئِنُهَا مِنْ إِسْتَبْرَقٍ ۚ وَجَنَى ٱلْجَنَّتَيْنِ دَانٍ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا
تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ
وَلَا جَآنٌّ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلْيَاقُوتُ
وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلْ جَزَآءُ
ٱلْإِحْسَٰنِ إِلَّا ٱلْإِحْسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٦١﴾ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٦٣﴾ مُدْهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا
عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾
فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخْلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾
فِيهِنَّ خَيْرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ
مَّقْصُورَٰتٌ فِى ٱلْخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾
لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ
﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفْرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِىٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ
ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسْمُ رَبِّكَ ذِى ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٧٨﴾

﴿ ولمن خاف مقام ربه جنتان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ وە بۆ کەسێ هەیە ترسابێ لەوەستان خۆی لەبەردەم خودا بۆ پرسیارکردن و، وازی هێنابێ لە بێفەرمانی پەروەردگاری خۆی و شەرمی لەو کردبێ دوو بەهەشت، یان هەردوو تاقمی ئادەمیزاد و جنۆکە کە بۆ هەردوویان هەیە هەردوو بەهەشت، مەگەر هەر خودای مەزن بزانێ بە خۆشی ئەو دوو بەهەشتانە، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە. بۆ چۆنیەتی خۆشی ئەو بەهەشتانە خودا ئەفەرموێ:

﴿ ذواتا أفنان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ ئەو دوو بەهەشتانە خاوەنی چەندین درەختی لق ڕاست و درێژ و گەڵا جوان و میوەدار و سیبەری خۆشی چروپرن. خواردن و خواردنەوەی خۆشی زۆریان تیدایە، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن.

﴿ فيهما عينان تجريان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ لەناو ئەو دوو بەهەشتانەدا هەن دوو سەرچاوەی ئاو لە لای سەرەوەیان و لە خوارەوەیان ئەرۆن بەناو درەختەکانیانا. دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە.

﴿ فيهما من كل فاكهة زوجان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ لە ناو ئەو دوو بەهەشتانەدا هەیە لە هەموو میوەیە، دووجۆر: هەیانە لە جیهاندا بینراون، هەیانە ئیوە نەتانبینیون، هەر یەکە لەو میوانەیش دووجۆریان لەویدا هەن: وەك خورمای ووشك و فەریکە. میوژ و ترێ. هەتا دێ لقی درەختەکانیان بە بێ ماندووبوون دەست پییان دەگات، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ متكئين على فرش بطائنها من إستبرق وجنى الجنتين دان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ ئەو کەسانەی لە خودا ترساون دانیشتوون لە سەر چەندین ڕاخەر ژێرەوەیان ئەوریشمی قایمە و، میوەی ئەو دوو بەهەشتە زۆر نزیکن، بەهەشتیەکان بە پیوە و بە دانیشتن و بە ڕاکشانەوە بە ئاسانی دەستیان بەوان ئەگا. دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ فيهن قاصرات الطرف لم يطمثهن إنس قبلهم ولا جان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ لە ناو ئەو بەهەشتانە و لەسەر ئەو ڕاخراوانەدا، چەندین کچ هەن، چاویان بریوەتە میردەکانی خۆیان و بۆ کەسێ تر ناروانن لە پیش میردەکانیانەوە کەسی تر نەچووەتە لایان، نە ئادەمیزاد و نە جنۆکە نزیکیان نەکەوتوونەتەوە، چۆن بە کچی درووستکراون هەر بەو جۆرە ماونەتەوە، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ كأنهن الياقوت والمرجان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ ئەو کچانـەی بەوینـەی یـاقوتن لـە بێگەردی و پاکیدا، بە وینەی مروارین لە سپیەتیدا، دوایی ئیـوەی ئـادەمیزاد و جنۆکـە بـە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ هل جزاء الإحسان إلا الإحسان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ پاداشتی چاکەکردنی بـەندەی خودا کە باوەری هیناوە و کردەوەی چاکی کردووە لـە جیـهاندا هیـچ شـتێ تـر نییـە مەگـەر چاکەکردنی خودا لەگەلیا بە خواردەمەنی و رابواردنی بەهەشـت لـە رۆژی دووایـدا، دوایـی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایـەرن و بـە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ ومن دونهما جنتان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ وە لە جگەی ئەو دوو بەهەشتانەی پیشوو کە ئەدران بەو کەسانەی کـە لـە خـودا ئەترسـان دوو بەهەشـتی تـر هـەن ئـەدرین بەوانـەی پلەوپایەیان لەوانەی پیشوو کەمترە، ئەو ئایەتە ئاماژەیە بۆئەوەی کە لە بەهەشتا چەند جیگـەی خۆش جیاوازی هەیە لە خۆشیدا، ئەدرین بە باوەرداران بە گویرەی بەرزی ونزمی پلەوپایـەیان، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایـەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ مدهامتان فبـأي آلـاء ربكمـا تكذبـان ﴾ ئەو دوو بەهەشـتانە ئـەوەندە گـوڵ و گولـزار بلاوبوونەتەوە لە ناویاندا رەنگیان زۆر سەوزە و لـە چرووپریدا بە رەش ئەبینرین. دوایـی ئیـوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیـان ئەخەنەوە؟

﴿ فيهما عينان نضاختان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ لەناو ئەو دوو بەهەشـتانەدا هـەن: دوو کانیاوی ئاو زۆر بە خور و تیژی ئاو فرە ئەدەن بەرەوژوور و ئەرۆن، جیاوازن لەو دوو کانیانـە ئـەرۆن بـەناو بەهەشـتا، دوایـی ئیـوەی ئـادەمیزاد و جنۆکـە بـە چ چاکـەیـە لـە چاکـەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ فيهما فاكهة ونخل ورمان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ لەناو ئەو دوو بەهەشتانەدا میـوەی زۆر خۆش هەن بە گشتی و، خورما و هەنار بە تایبەتی، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بـە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ فيهن خيرات حسان فبأي آلاء ربكما تكذبان ﴾ لەناو ئەو دوو بەهەشتانەدا هەیە چەندین ژنی چاك و پاك و شیرین رەوشـت و بالابـەرز و شـۆخ و شـەنگ، دوایـی ئیـوەی ئـادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ حور مقصورات فـي الخيـام فبـأي آلـاء ربكمـا تكذبـان ﴾ ئـەو ژنانـەی لـە بەهەشـتان چاوگەورە و لەش سپین، پاریزراون و پەنهاندراون لەناو چادرەکاندا و دەرنـاچن، ناگـەرین و،

وینەیان لە جیهاندا نەبینراون، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکـە بـە چ چاکەیـە لـە چاکـەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ لم یطمثهن إنس قبلهم ولا جـان فبـأي آلـاء ربکمـا تکذبـان ﴾ ئـەو حۆری‌یانـە بـەر لـە میردەکانیان کەسی تر نەچووەتە لایان و شووی تریان نەبووە، نە ئادەمیزاد و نە جنۆکە نزیکیان نەکەوتوونەتەوە، هەرچۆنی درووستکراون بە کچی ماونەتەوە، دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکە بە چ چاکەیە لە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ متکئین علی رفرف خضر وعبقري حسان فبأي آلاء ربکمـا تکذبـان ﴾ ئـەو بەهەشـتی‌یانە دانیشتوون، لەسەر راخەری سەوز پالیان داوە بە پشتی‌یەکانیانەوە، دانیشتوون لـەسەر راخـەری جوان و رازینراون بە نەخشی زۆر نایاب. عەرەبەکان لایـان وایـە (عەبقـەری) نـاوی شـاریکی جنۆکەکانە، هەر شتێ نایاب و بێ وینەبێ ئەلین: عەبقەری‌یە. دوایی ئیوەی ئادەمیزاد و جنۆکـە بە چ چاکەیە لـە چاکەکانی پەروەردگاری خۆتان باوەر نایەرن و بە درۆیان ئەخەنەوە؟

﴿ تبارك اسم ربك ذي الجلال والإکرام ﴾ بالآ و پیرۆزە ناوی پـەروەردگاری تـۆ، خـاوەنی گەورەیی‌و ریزگرتنە لە بەندە نیاز پاك و چاکەکانی خۆی.

# ﴿ سورەتی ئەلواقیعە ﴾

لە مەکە هاتوەتە خوارەوە، هەندێ لە زانایان جگە لە ئایەتی (٨١-٨٢) هەندێ تریان لایان وایە جگە لە ئایەتی (٨٤) لە مەدینە هاتوونەتە خوارەوە، هەندێ تریان ئەڵێن: جگە لە ئایەتی (٨٣-٨٤) هاتوونەتە خوارەوە کاتێ پێغەمەر ئەڕۆیشت بۆ مەکە، هەر ئەو زانایانە ئەڵێن، جگەی ئایەتی (٥٠-٥١) هاتوونەتە خوارێ کاتێ پێغەمەر ئەڕۆیشت بۆ مەدینە. ژمارەی ئایەتەکانی (٩٦) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ
﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ﴿٥﴾
فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ﴿٦﴾ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ﴿٧﴾ فَأَصۡحَٰبُ
ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ
ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾
فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ
﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾
يَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكۡوَابٖ وَأَبَارِيقَ وَكَأۡسٖ مِّن مَّعِينٖ
﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنۡهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَٰكِهَةٖ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ
﴿٢٠﴾ وَلَحۡمِ طَيۡرٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٞ ﴿٢٢﴾ كَأَمۡثَٰلِ ٱللُّؤۡلُوِٕ
ٱلۡمَكۡنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا
تَأۡثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلٗا سَلَٰمٗا سَلَٰمٗا ﴿٢٦﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان**

﴿ إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ڕۆژی دوایی پەیدا ئەبێ، ئەو کاتە هیچ کەسێ ناتوانێ خودا و بوونی ڕۆژی دوایی بەدرۆبخاتەوە و

باوەڕیان پێ نەهێنن لەبەر ئەوەی توانای خودا و پەیدابوونی ڕۆژی دوایی و سزای ئەو ڕۆژە بە چاوی خۆیان ئەبینن، ئەو ڕۆژەی دوایی کە تاوانباران سەرخوار و نزم ئەکات، لە خودا ترسان بەرز ئەکاتەوە، وە تاوانباران ئەنێرن بۆلای دۆزەخ، لە خودا ترسان و ئەو کەسانەی خۆیانیان لە بێفەرمانی خودا پاراستووە بۆلای بەهەشت.

﴿ إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسًّا فَكَانَتْ هَبَاء مُّنبَثًّا ﴾ تۆ بیری کاتێ بکەرەوە، کە ئەو کاتە ڕۆژێکی زۆر ترسناکە، کاتێکە نەمان و کۆتایی هاتنی جیهانە و هاتنی ڕۆژی دووایییە، ئەو کاتە زەوی زۆر بە توندی ئەجوولێ و، خـۆی و ئـەو شتانەی بەسەریەوەن لـە کێو و کۆشك ئەڕووخێن و پارچە پارچە ئەبن و بە وێنەی تۆزیان لێدێ ئەچن بە ئاسمانی ئـەو کاتـەدا، وەك ئاردی ووردیان لێ دێ.

﴿ وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَاثَةً ﴾ وە ئێوەی ئادەمیزاد لە ڕۆژی قیامەتدا کۆ ئەکرێنەوە و، ئەبن بەسێ تاقم.

١- ﴿ فَأَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَيْمَنَةِ ﴾ دوایی ئەو کەسانەن خاوەنی ئـەوەن نامـەی کردارەیان ئەدرێ بە دەستی ڕاستیانەوە، خاوەنی نامەی دەستی ڕاست کامانەن و شێوەیان چۆنـە و پلەوپایەیان بە چ جۆرێکە، ئەو کەسانە لە بەهەشتان و، خۆش ڕائەبوێرن، بەڵام ئـەو کەسـانە پلەوپایەیان کەمترە لە پلەوپایەی تاقمی سێیەم.

٢- ﴿ وَأَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ مَا أَصْحَابُ الْمَشْأَمَةِ ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆن نامـەی کرداریـان ئەدرێ بە دەستی چەپیانەوە، ئەو کەسانەی خاوەنی نامەی دەسـتی چـەپن کامانـەن و شـێوەیان چۆنە؟ ئەوانەن ئەڵێن: خۆزگایە نامە نەدرایە بە دەستی چەپمانەوە.

٣- ﴿ وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆن لە پێشەوەبوون بـۆلای باوەڕهێنـان و چاکەکردن، لە پێشەوەن بۆلای جێگەی بەرزی خۆیان لە بەهەشتا.

﴿ أُوْلَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴾ وە ئەو کەسانەی لەپێشەوەبوون ئەو کەسـانە نزیـك خراونەتەوە لە بەخشندەیی خوداوە و پلەوپایەی گەورەیان ئەدرێتێ لە ناو ئەو بەهەشتانە چاکە و خواردەمەنییان بەردەوامە و کۆتایی پێ نایەت.

﴿ ثُلَّةٌ مِّنَ الْأَوَّلِينَ وَقَلِيلٌ مِّنَ الْآخِرِينَ ﴾ تاقمێکی زۆر لە بـاوەڕدارانی پێغەمـەرە پێشـووەکان هەر لە ئادەمەوە هەتا باوەڕدارانی سەردەمی موحەمەد و، تاقمێکی کەم لە پەیڕەوانی موحەمەد، کە هەردوولایان ئـەو کەسـانەی ئـەوتۆن لـە پلەوپایـەدا لـە پێشـەوەن. کەمیـەتی نەتـەوەی پێغەمەری خودا دژی فەرموودەی پێغەمەر نییە: ئۆمەتی من زۆرترە لە هەموو ئۆمەتـەکانی تـر، لەوانەیە ئۆمەتە پێش کەوتووەکان زۆرتربن لە ئۆمەتە پێش کەوتووەکانی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾. بـەڵام بە شێوەیەکی گشتی ئۆمەتی پێغەمەر زۆرترن.

بۆ زانین: زانایان بیر و بۆچوونیان جیاوازە لە مەبەست لە پێشـووەکان و دوایـیەکانی تـر: هەندێکیان ئەڵێن: پێشووەکان بریتین لەو کەسانەی لە پێشەوە باوەڕیان هێنـاوە و، لـە پێشـەوە بوون لە ئۆمەتی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ هەندێ تریان ئەڵێن: پێشووەکان و دواییەکانیش بریتـین لـە پەیڕەوانی موحەمەد ﴿ﷺ﴾.

﴿ عَلَى سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ.مُّتَّكِئِينَ عَلَيْهَا مُتَقَابِلِينَ ﴾ باوەڕدارە پێشووەکان و دوایەکان دانیشتوون لەسەر کورسی ڕێزدار و چنراون بە زێڕ و بێچەکانیان دوڕ و یاقووتە، پاڵیان داوەتەوە لەسەر ئەو کورسییانە بەرانبەر بە یەکتری.

﴿ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ. بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴾ منالآنی تازە پێگەیشتوو ئەگەڕێن بەسەر ئەو بەهەشتییانەدا و خزمەتیان ئەکەن، ئەو بەهەشتییانە بەردەوامن و نامرن و پیر نابن، هەر ئەو منالآنەیش نامرن و پیر نابن ئەگەڕێن بەسەریاندا بە پەرداخێ بێ دەسك و بێ کۆیچکە و بە سوراحی گوێچکە دار و دەسك دار و بە پیاڵەی پڕ لەسەرچاوەی ئاوی شیرین و مەیی و هەنگوین و شیر.

﴿ لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴾ ئەو بەهەشتییانە بە خواردنەوەی ئەو مەییە تووشی سەرئێشە نابن بە جۆری مەی جیهان، بە خواردنەوەیشی سەرخۆش نابن.

﴿ وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ. وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴾ وە ئەو منالآنەیش کە پێشکەشی ئەو بەهەشتییانە ئەکەن لە هەر میوەیە لەوەی خۆیان بە چاکی بزانن و، لە گۆشتی هەر باڵندەیە خۆیان ئارەزۆی بکەن.

﴿ وَحُورٌ عِينٌ كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وە بۆ ئەو بەهەشتییانە هەیە چەندین کچی ڕوومەت سپی و چاو قەوی و جوان بە وێنەی لۆلۆێ بێگەرد و پارێزراو بێ دەستی لێوە نەدرابێ و تۆزی لێ نەنیشتبێ، خودای مەزن ئەو شتانەیان بۆ ئەکات لەبەر پاداشت دانەوەی شتێ ئەیکەن.

﴿ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا إِلَّا قِيلًا سَلَامًا سَلَامًا ﴾ بەهەشتییەکان لە ناو بەهەشتا گفتوگۆی پڕوپوچی بێ سوود نابیسن، وە شتێ نابیسن سەربکێشێ بۆلای گوناه، ئەو شتەی بیبیسن جگە لەوەی ببێژرێ بەوان لە لایەن فریشتەکانەوە و، لە لایەن یەکترییەوە ئاشتی و خۆشی بۆ ئێوە بێ و، بە یەکتری ئەڵێنەوە.

ئەو هەموو چاکە و جێگە خۆشانە خوای مەزن بەخشیویەتی بەو کەسانە پێش کەوتوون لەبۆ باوەڕهێنان و ڕێزگیراوی لای خوان و پلەوپایەی بەرزیان ئەداتێ زۆرتر لە باوەڕدارانی تر. بەڵام باوەڕدارانی جگەی ئەوان لەو کەسانەی نامەی کرداریان داونەتێ بە دەستی ڕاستیانەوە، خودا بەشەکانیان ڕوون ئەکاتەوە و بەو جۆرە ئەفەرموێ:

وَأَصْحَـٰبُ ٱلْيَمِينِ مَآ أَصْحَـٰبُ
ٱلْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِى سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ
﴿٣٠﴾ وَمَآءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَـٰكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا

مَّمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُنَّ
أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ
ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ ٱلْءَاخِرِينَ ﴿٤٠﴾

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی شتیکی کرد ئامادەی کردبوو بۆ باوەرداره پیشینەکان لە ریزگرتنیان و لەو چاکانەی پیی بەخشیون، باسی کۆمەلێ تر لە باوەرداران پلە و ریزیان لەوانەی پیشوو کەمترە کە ناوی ناون بە (أصحاب الیمین) یانێ ئەو کەسانەی نامەی کرداریان دراوە بە دەستی راستیانەوە و ئەفەرموێ:

﴿ وأصحاب الیمین ما أصحاب الیمین ﴾ و یارانی خاوەن نامەی دەستی راست کامانەن و پلەوپایەیان چۆنە لە بەهەشتا و بە چ جۆریکە، پلەو پایەیان لە بەهەشتا:

﴿ في سدر مخضود وطلح منضود وظل ممدود ﴾ لە ناو درەختی مۆردی بێ درکا لە زۆری بەرەکەی لقەکانی چەماونەتەوە، لە ناو درەختی موزی وادان بەرەکەی نیشتووەتە سەر یەك و، لە ناو سیبەریکی بەردەوامی وادان خۆر لای نابا.

﴿ وماء مسکوب وفاکهة کثیرة لا مقطوعة ولا ممنوعة وفرش مرفوعة ﴾ وە بەلای ئاویکا ئەروا و کۆتایی پێ نایەت، لای چەندین میوەی زۆرن لە گەورەیی و بچووکی و رەنگیان جیاوازن، کۆتایی پێ نایە هیچ کاتێ و هەموو کاتێ هەن و هیچ کەسێ نییە ریگە بگرێ لە خواردنیان، بە پیچەوانەی درەختی جیهان کاتی وا هەیە بەر ناگرن و بەرەکەیشی بۆ خاوەنەکانیانە و، لە لای چەندین ژنی وان بەرزکراونەتەوە لەسەر کورسی، وك خودای ئەفەرموی:

﴿ إنا أنشأناهن إنشاء فجعلناهن أبکارا عربا أترابا ﴾ بەراستی ئیمە ئەو ژنانەمان درووست کردووە بە جۆرە درووست کردنێ زۆر خۆشەویستن لای میردەکانیان، دوایی ئیمە ئەو ژنانەمان درووست کردوون بە کچ، خۆشەویستی میردەکانیان بن، هەموویان لە یەك تەمەندان. هەندێ لە زانایان ئەلین: لە تەمەنی (٣٣) سالیدان.

﴿ لأصحاب الیمین ثلة من الأولین وثلة من الآخرین ﴾ ئەو ژنانە بەو شیوەیە ئەدرین درووستمان کردوون بۆ ئەو کەسانەی نامەی کرداریان ئەدرێ بە دەستی راستیانەوە. تاقمێ لەوانە نامەیان ئەدریتێ بە دەستیان لەو باوەردارانانەن باوەریان بە پیغەمەرە پیشووەکان هیناوە، تاقمێ تریان لەو کەسانەن لە دوای ئەوانەی پیشەوە هاتوون، بە وینەی باوەردارانی ئۆمەتی موحەمەد ﴿ﷺ﴾. بیگومان ئەمانەیش کەمترن لەو کەسانەی نامەی کرداریان ئەدرێ بە دەستی چەپیانەوە.

وَأَصۡحَٰبُ ٱلشِّمَالِ مَآ أَصۡحَٰبُ
ٱلشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِي سَمُومٖ وَحَمِيمٖ ﴿٤٢﴾ وَظِلّٖ مِّن يَحۡمُومٖ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٖ
وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَبۡلَ ذَٰلِكَ مُتۡرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُواْ يُصِرُّونَ
عَلَى ٱلۡحِنثِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُواْ يَقُولُونَ أَئِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا
وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلۡ إِنَّ
ٱلۡأَوَّلِينَ وَٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجۡمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَٰتِ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٥٠﴾
ثُمَّ إِنَّكُمۡ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلۡمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَأٓكِلُونَ مِن شَجَرٖ مِّن زَقُّومٖ ﴿٥٢﴾
فَمَالِـُٔونَ مِنۡهَا ٱلۡبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ
شُرۡبَ ٱلۡهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمۡ يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو شتەی کرد ئامادەی کردبوو بۆ باوەرداره پیشووەکان کە لەوەوبەر لە پیشا باوەریان هینابوو، دوایش باسی ئەو باوەردارانەی کرد کە نامەی کرداریان ئەدرێ بە دەستی راستیانەوە، دوایی باسی ئەو کەسانە ئەکا نامەی کرداریان ئەدرێ بە دەستی چەپیانەوە و ئەفەرموێ:

﴿ وأصحاب الشمال ما أصحاب الشمال ﴾ وە یاوەرانی دەستە چەپ، ئەو کەسانەن نامەی کردار ئەدرێ بە دەستی چەپیان چۆنن و بەسەر هاتیان و دوا رۆژیان بە چ جۆرێ ئەبێ.

﴿ في سموم وحميم وظل من يحموم لا بارد ولا كريم ﴾ لە ناو بایەکی زۆر گەرمی وادان ئەروا بە بۆشاییی گەورە و بچووکی لەشیانا و، لە ناو ئاویکی زۆر گەرمی وادان ئەوپەری گەرمی گرتووە و، لە ناو سیبەری دوکەلیکی زۆر رەشدان، بە جۆریکە ئەو دووکەلە نە ساردی ئەهینێ و نە گەرمی لا ئەبا و هیچ جۆرە چاکەیەکی تیدا رەچاو ناکرێ.

﴿ إنهم كانوا قبل ذلك مترفين وكانوا يصرون على الحنث العظيم ﴾ لەبەر ئەوەی بە راستی ئەو کەسانە بەر لە ئیستا لە جیهاندا رایان ئەبوارد بە خۆشی و بێ فەرمانی خودایان ئەکرد و ستەمیان لە هەژاران ئەکرد و، بەردەوامبوون لەسەر کردنی گوناهە گەورەکان، بە تایبەتی هاوبەشییان بۆ خودا دا ئەنا.

﴿ وكانوا يقولون أئذا متنا وكنا ترابا وعظاما أئنا لمبعوثون ﴾ وە ئەو کەسانە لەمەوبەر ئەیان ووت: ئایا کاتێ ئیمە مردین و، بووین بە خۆڵ و ئیسك: ئایا ئیمە بە راستی زیندوو ئەکریینەوە، شتێ وا چۆن ئەبێ؟

﴿ أو آباؤنا الأولون ﴾ ئایا باوك و باپیرەکانی پیشووشمان زیندوو ئەکرینەوە؛ ئەو گفتوگۆیانەیان بە گالتەوە ئەکرد، لە بیریان نەمابوو کە یەکەم جار خودا ئەوانی لە خاك درووست کردووە و، دواتر بە دلۆپێ ئاو. کەواتە زۆر ئاسانە جارێ تر زیندوویان بکاتەوە، وەك ئەفەرموێ:

﴿ قل إن الأولين والآخرين لمجموعون إلى ميقات يوم معلوم ﴾ تۆ بلێ: بە راستی باو باپیرە پیشووەکانی ئیوە و هەموو کەسانی تری رابردوو، ئەو کەسانەیش لەمەودوا پەیدا ئەبن، بە راستی هەموویان بە ئیوەیشەوە زیندوو ئەبنەوە و کۆ ئەکرینەوە بۆلای کاتیکی دیاریکراو کە رۆژی دوایە.

﴿ ثم إنكم أيها الضالون المكذبون لآكلون من شجر من زقوم ﴾ لە پاشا بە راستی ئیوە، ئەی کەسانێ لاتان داوە لە ریی راست، باوەرتان بە یەکیتی خوا و رۆژی دووایی نەبووە، بە راستی ئیوە بخۆن لەبەری درەختێ رواوە لە قوولایی دۆزەخدا، بەرەکەی زۆر ناشیرین و بۆنیکی خراپ و تامیکی تالی هەیە.

﴿ فمالؤون منها البطون فشاربون عليه من الحميم فشاربون شرب الهيم ﴾ دوایی ئیوە گەدەی خۆتان پر بکەن لە خواردنی بەری ئەو درەختەی زەقوم، دواتر بخۆنەوە بەسەریا لە ئاوی زۆر گەرمی دۆزەخ، دوایی ئیوە بخۆنەوە لەو ئاو گەرمە بە وینەی خواردنەوەی هوشترێ تووشی نەخۆشی تینویەتی بووە.

﴿ هذا نزلهم يوم الدين ﴾ ئەو سزایانەی کە باسکران بۆ ئەو کەسانەیە کە نامەی کرداریان ئەدریتە دەستی چەپیان، بەرکولیکە ئامادەکراوە لە پیشەوە و شتیکە میوانداری ئەوانی پێ ئەکرێ لە خواردن و بەرگ و خواردنەوە، ﴿منزل﴾ بە شتێ ئەبیژرێ ئامادەکرابێ بۆ میوان، ئەوانە بۆیان ئامادەیە لە رۆژی پاداشتا.

نَحۡنُ خَلَقۡنَٰكُمۡ فَلَوۡلَا
تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تُمۡنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمۡ تَخۡلُقُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ
ٱلۡخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحۡنُ قَدَّرۡنَا بَيۡنَكُمُ ٱلۡمَوۡتَ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ﴿٦٠﴾
عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمۡثَٰلَكُمۡ وَنُنشِئَكُمۡ فِي مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدۡ
عَلِمۡتُمُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُولَىٰ فَلَوۡلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيۡتُم مَّا تَحۡرُثُونَ
﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمۡ تَزۡرَعُونَهُۥٓ أَمۡ نَحۡنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوۡ نَشَآءُ لَجَعَلۡنَٰهُ

حُطَٰمًا فَظَلۡتُمۡ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغۡرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلۡ نَحۡنُ مَحۡرُومُونَ
﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلۡمَآءَ ٱلَّذِي تَشۡرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمۡ أَنزَلۡتُمُوهُ مِنَ ٱلۡمُزۡنِ
أَمۡ نَحۡنُ ٱلۡمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوۡ نَشَآءُ جَعَلۡنَٰهُ أُجَاجٗا فَلَوۡلَا تَشۡكُرُونَ
﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيۡتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمۡ أَنشَأۡتُمۡ شَجَرَتَهَآ أَمۡ
نَحۡنُ ٱلۡمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحۡنُ جَعَلۡنَٰهَا تَذۡكِرَةٗ وَمَتَٰعٗا لِّلۡمُقۡوِينَ
﴿٧٣﴾ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٤﴾

﴿ نحن خلقناكم فلولا تصدقون ﴾ ئیمە ئیوەمان لە نەبوونەوە درووست کردووە، دوایی بۆ ئیوە باوەر نایەرن بە زیندووبوونەوە، هەرکەسێ بتوانێ یەکەم جار شتێ بکات ئەتوانێ جارێ دوای نەمانی درووستی بکاتەوە.

﴿ أفرأيتم ما تمنون أأنتم تخلقونه أم نحن الخالقون ﴾ ئایا دوایی ئیوە هەواڵ بدەن بە من بەو شتەی ئیوە ئەیریژنە ناو مندالدانی ژنەوە، ئایا ئیوە ئەو شتە درووست ئەکەن و ئەیکەن بەو ئادەمیزادە ریك و پیکە بەو هەموو سروشتەوە کە هەیەتی، ئایا ئیمە ئەو شتە درووست ئەکەین و ئەو دلۆپە ئاوە ئەکەین بەو مرۆڤە ژیرە، بیگومان ئیوە کە ئەو ئاوەتان فرە دایە ناو مندالدان، پەیوەندیتان کۆتایی پێ دێ و، بە هیچ جۆرێ ئاگاتان لیی نییە، کەواتە چ کەسیکە ئەو ئاوە ئەکات بە خوین و، دوایی بە گۆشت و ئیسك، دوایی گیان ئەکا بە بەریا، بیگومان ئەو کەسە هەر خودایە، ئەگەر ئەلین: ئەو کارانە هەموویان سرووشت ئەیکەن ئیمە ئەلین: چ کەسێ سرووشتی درووست کردووە؟. ئەگەر ئیوە ئەلین خۆی خۆی درووست کردووە. ئیمە ئەلین: چ کەسێ گیان و هەستی پێ بەخشیوە؟ ئەگەر ئیوە ئەلین: خۆی گیانی بە خۆی بەخشیوە. ئیمە ئەلین: شتێ کەروو کویر بێ توانای نییە هیچ شتێ ببەخشێ. ئەگەر ئیوە بلین: بە بێ ئەوەی نیازی بکا گیانی بۆ پەیدابووە. کەواتە ئەو گفتوگۆیەی ئیوەیش بە بێنیازی خۆتان پەیدا ئەبێ. کەواتە ئەو زیندەوەرانە کەسیکی زانا و بە توانا و ئاگادار لە هەموو شتیك و لە هەموو گۆرانکاریەکان درووستی کردووە، ئەو کەسەیش هەر خودایە. هەموو شتێ لە جیگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

﴿ نحن قدرنا بينكم الموت وما نحن بمسبوقين على أن نبدل أمثالكم وننشئكم في ما لا تعلمون ﴾ ئی مە کاتی مردنمان دیاری کردووە لە نیوان ئیوەدا، هەتانە بە منالی ئەمرن، هەتانە بە لاوی یا بە پیری ئەمرن، کاتەکانتان دوور بن یان نزیك بن، بە بێ جیاوازی پلەی بەرز و

نزمی نیوانتان هیچ کەسێ ریگە لە ئیمە ناگرێ لەسەر ئەوەی ئیمە ئیوە لەناو ببەین، کتوپڕ لە جیگەی ئیوەدا کۆمەڵێ تر بە وینەی دیمەن و ڕەوشتی ئیوە درووست بکەین و، لە جیگەی ئیوەدا دایان بنیین و، ریگەیشمان لێ ناگیرێ ئیوە لە ناو ببەین و ئیوە درووست بکەینەوە بە شیوەیە ئیوە نەزانن چۆنەو، لە هەموو ڕوویەکەوە لە ئیوە جیاوازبن.

﴿ ولقد علمتم النشأة الأولى فلولا تذكرون ﴾ وە بە راستی ئیوە ئەزانن بە درووستکردنی یەکەم جارتان لە نەبوونەوە ئیوەی هیناوەتە بوونەوە، دلۆپێ ئاوی بیز لیکراوە بوون، ئایا ئیمە ناتوانین پارچەکانتان کۆ بکەینەوە و، بتانکەینەوە بە وینەی پیشووتان، دوایی بۆ ئیوە ئامۆژگاری وەرناگرن؟

﴿ أفرأيتم ما تحرثون أأنتم تزرعونه أم نحن الزارعون ﴾ ئایا ئیوە دوایی هەواڵ ئەدەن بە من بە شتێ ئیوە ئەی‌کیلن و ئەیچینن و ئاوی ئەدەن و ئەیدورنەوە؟ ئایا ئیمە سەوزی ئەکەین و، ئەبێ بە دانەویلە، یا ئیوە سەوزی ئەکەین و ئەی‌ڕوینین و گەشەی پێ ئەکەین؟ بیگومان ئیوە ئەیچیچنن و ئاوی ئەدەن. بەڵام درووستکردنی تۆوەکەیی و ئاوو زەوی و خۆر و هەوا کەی هۆی سەرەکین بۆ گەشە پێ‌کردنی، لە توانای ئیوەدا نین و ئاگاتان لییان نی‌یە.

﴿ لو نشاء لجعلناه حطاما فظللتم تفكهون ﴾ ئەگەر ئیمە ئارەزۆ بکەین، ئەو شتەی ئیوە ئەیچینن ئەیکەن بە پووشیکی ووشکی بێ دانەویلە، دانە دانە بەسەر زەوی‌دا بڵاو ئەبنەوە، دوایی ئیوە گفت و گۆ ئەکەن لە بارەی سەوزبوونی ئەوەی چیناوتانە و، پەشیمان ئەبنەوە لەسەر ووشکبوونی و سەرتان سوور ئەمینێ لەو شتەی تووشی بووە.

﴿ إنا لمغرمون بل نحن محرومون ﴾ ئیوە ئەو کاتە ئەڵین: بە راستی ئیمە لە ناوچووین و زەرەر مەندبووین، چونکە ئیمە لە کیسمان چوو ئەو دەنەویلەیە و، ماندووبوونەکەمان لەو ریگەیەدا و قەرزاربووین و، ئیمە بێ‌بەش بووین لەو بەرهەمەی چاوەڕوانمان ئەکرد.

﴿ أفرأيتم الماء الذي تشربون أأنتم أنزلتموه من المزن أم نحن المنزلون ﴾ ئایا دوایی ئیوە هەواڵ ئەدەن بە من بە ئاوەی ئەوتۆ ئیوە ئەیخۆنەوە و تینویەتی خۆتانی پێ ئەشکینن و ئەبیتە هۆی ژیانتان و، ئەگەر ئەو ئاوە نەبیت ئیوە پایەدار نابن. ئایا ئیوە ئەو ئاوە ئەنیرنە خوارەوە لە هەور، یا ئیمە ئەینیرینە خوارەوە. بیگومان ئیمە ئەینیرینە خوارەوە.

﴿ لو نشاء جعلناه أجاجا فلولا تشكرون ﴾ ئەگەر ئیمە ئارەزۆ بکەین بە راستی ئیمە ئە ئاوە ئەکەین بە خوێ‌یەکی زۆر تاڵ، دوایی ئیوە بۆ سوپاسی چاکەی ئیمە ناکەن ئەو ئاوەمان بە جۆرێ ناردووەتە خوارەوە ئیوە سوودی لێ وەربگرنو تووشی ئازار نەبن؟

﴿ أفرأيتم النار التي تورون أأنتم أنشأتم شجرتها أم نحن المنشؤون ﴾ ئایا دوایی ئیوە هەواڵ ئەدەن بە من لەبارەی ئەو ئاگرەی ئەوتۆ ئیوە ئاشکرای ئەکەن و، دەری ئەهینن لە درەخت و شتی تر، ئایا ئیوە درەختی ئەو ئاگرەی ئەوتۆتان درووست کردووە ئەو ئاگرەی لێ دیتە دەرێ یا ئیمە درووستمان کردووە؟ بیگومان ئیمە درووستمان کردووە.

﴿ نحن جعلناها تذكرة ومتاعا للمقوين ﴾ ئێمە ئەو ئاگرەی جیهانمان درووست کردووەبە ئامۆژگاری کردن، هەتا بەو بۆنەوە بیری ئاگری دۆزەخ بکەنەوە. کەسێ بتوانێ لە درەختی سەوز ئاگر بهێنێتە دەرەوە، ئەتوانێ گیانداران زیندوو بکاتەوە دوای مردنیان و، ئەو ئاگرەیشمان کردوو بە سوود بۆ دانیشتووان و کاروان، بە تایبەتی کاروانی لە جێگەی چۆڵدا خۆیانی پێ گەرم ئەکەنەوە و ڕێگەی خۆیان ڕووناک ئەکەنەوە.

بۆ زانین: ئەو ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دوو درەخت هەن: ناویان (عەفار و، مەرخە) سەوز و تەرن لقی یەکێکیان ئەدەن لەوی تریان، ئاگریان لێ پەیدا ئەبێ، هەروەها زۆر شتی تر هەن ئاگریان لێ پەیدا ئەبێ، وەك: نەوت و کارەبا و خۆر و خەلووزی بەردی و، بە لێکدانی بەرد و ئاسن لە یەکتری، ئیبنو عەباس ئەفەرموێ: هەموو درەختێ ئاگری تێدایە.

﴿ فسبح باسم ربك العظيم ﴾ دوایی تۆ پەروەردگاری خۆت پاك بکەرەوە لە هەموو شتێ شایانی گەورەیی ئەو نەبێ و، پەنا بەرن بۆلای ناوی پیرۆزی ئەو موسڵمانان لە ڕکوعی نوێژدا ئەو ئایەتە ئەخوێنن و، لە سوژدەیشدا. ئەڵێن: (سبحان ربي الأعلى) کە سەرەتای سورەتی (ئەلئەعلا) ئاماژەی بۆ ئەکا.

فَلَآ أُقْسِمُ
بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾
إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ فِى كِتَٰبٍ مَّكْنُونٍ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا
ٱلْمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلْحَدِيثِ
أَنتُم مُّدْهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوْلَآ
إِذَا بَلَغَتِ ٱلْحُلْقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحْنُ أَقْرَبُ
إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَٰكِن لَّا تُبْصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوْلَآ إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ
﴿٨٦﴾ تَرْجِعُونَهَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ
﴿٨٨﴾ فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّتُ نَعِيمٍ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنْ أَصْحَٰبِ
ٱلْيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلْيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ
ٱلْمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٩٣﴾ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ
﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٩٦﴾

﴿ فلا أقسم بمواقع النجوم ﴾ دوایی بە راستی من سویند ئەخۆم بە شوینی ئەستیرەکان لە کاتی هەلهاتن و رۆیشتن و ئاوابوونیان و بلاوبوونەوەیان لە رۆژی دواییدا. ئیبنو عەباس ئەفەرموێ مە بەست لە نجوم، نجومەکانی قورئانن، لەبەر ئەوەی بەش بەش هاتوونەتە خوارەوە بۆ سەر پیغەمەر ﴿ﷺ﴾.

بۆ زانین: زۆربەی زۆری زانایان ئەلین: ووشەی ﴿لا﴾ زیادە و بۆ پتەوکردنی سویندەکەیە، هەندیکی تر لە زانایان لایان وایە: ئەو ووشەیە زیاد نی‌یە. ماناکەی بەم جۆرەیە: (من سویند ناخۆم بە جیگەی ئەستیرەکان) چونکە ئەوەی من سویندی بۆ بخۆم ئاشکرایە پیویستی بە سویند خواردن نی‌یە.بەلام ئەوەی راست بێ مانای یەکەمیانە. لەبەر ئەوەی لە ئایەتی دووایی‌دا ئەفەرموێ: (بە راستی سویندیکی گەورەیە).

﴿ وإنه لقسم لو تعلمون عظيم ﴾ بە راستی ئەو سویندە زۆر گەورەیە ئەگەر ئیوە بزانن، چونکە ئەو ئەستیرانە سوودیان زۆرە بۆ بوونەوەران، مانەوەی سورانیان بەو جۆرەی دانراوە هۆی بەردەوامی ژیان و رابواردنی گیاندارانە. بە تایبەتی ریگەیان پێ ئەدۆزریتەوە.

﴿ إنه لقرآن كريم في كتاب مكنون ﴾ بە راستی ئەو نامەیە نیردراوە بۆ موحەمەد قورئانیکی زۆر گەورە و بەریز و خاوەن سوودە، ژیانی هەردوو جیهان مسۆگەر ئەکات، دانراوە و پاریزراوە لە ناو نامەیەکی پیرۆزدا کە بریتی‌یە لە لەوحەل مەحفوز، ئاگاداری ئەو نامەیە نین مەگەر ئەو فریشتانە پاککراونەتەوە لە هەموو خراپەیە.

﴿ لا يمسه إلا المطهرون تنزيل من رب العالمين ﴾ هیچ کەسێ ئاگای لەو نامەیە نی‌یە و دەستی هیچ کەسێ لەو نامەیە نادا، مەگەر کەسانێ پاککراونەتەوە لە هەموو خراپەیە، هیچ جۆرە شتێ نابێ بە کۆسپ لە ریگەیانا بۆ ئەوەی هەموو کارێ بە راستی بکەن، ئەو کەسانەیش بریتین لە فریشتەکان. ئەو قورئانە رەوانە کراوەتە خوارەوە بۆ سەرموحەمەد لە لایەن پەروەردەکەری هەموو بوونەوەرانەوەیە.

زانایان لە بارەی قورئانی پیرۆز بیر و بۆچوونیان جیاوازە: ئایا دەست لیدانی قورئان و خویندنەوە و هەلگرتنی بۆ چ کەسێ درووستە و بۆ چ کەسێ درووست نی‌یە و بە چ جۆرێ. لای زۆربەی زانایان، وەك عەتا، تاوس، قاسم، مالیك...شافیعی، لایان وایە بە دەست لیدانی قورئان بە لەشپیسی و بێ دەستنویژ و ژنی حەیزدارو دوای منالبوون درووست نی‌یە لەگەل خویندنی و هەلگرتنی. بەلام بێ دەست نویژ درووستە قورئان لەبەر بخوینریت. نووسینەوە و خویندنی قورئان بۆ لەش پیس درووست نی‌یە، لە ناو کەل و پەلدا پیویستە هەلگرتنی قورئان بۆ لەش پیس و بێ دەست نویژ. لای حەنبەلی‌یەکان بێ دەست نویژ و لەش پیسەکانیش بۆیان هەیە دەست بدەن لە قورئان و هەلگرتنی. لای حەنەفی: بێ دەست نویژ و ژنی حەیزدار بۆیان نی‌یە دەست بدەن لە قورئان بەبێ بەرگ و بۆیان نی‌یە بینووسنەوە، بەلام لای ئەبو یوسوف درووستە نووسینی قورئان لەسەر کاغەز بە مەرجێ دەستی لی نەدرێ. لای موحەمەدی شەیبانی بە هیچ جۆرێ درووست نی‌یەدەست لیدانی قورئان. بۆ باشتر روون بوونەوە تەماشای نامەکانی تری یاسا بکە.

ئیمە ئەگەرییینەوە بۆ سەر باسی گەورەیی قورئان. بێگومـان قورئـان یاسـایەکە پێویسـتی بـە بەڵگە نیٍیە. رزگاری ئادەمیزادە و شـارەزایی‌کەرییانە بـۆلای زانسـت و زانـین و دۆزینـەوەی ریگەی راست، ریگە پیشاندەرە بۆلای هەموو پلەی ریز و ئاشتی، بەرەلاکـەری ئـادەمیزادە لـە پیونی ستەمکاری و کۆیلایەتی، وولامی هـەموو پیویسـتی‌یەکانی ئـادەمیزاد ئەداتـەوە لـەبارەی ژیانیانەوە، ئایین ئەبەستیتەوە بە کردەوەوە. لە هەردوو جیهاندا بۆ ژیانیکی پاك و دادپەروەری و بێ‌گـیروگرفت. ئەوانـەیش نـەك بـە تەنـها لای زانایـانی ئیسـلام، بگـرە لای زانایـانی جگـەی ئیسلامیش. لەو بارەیەوە هەموو موسلمانان پیك هاتوون بـەبێ جیـاوازی لـەسـەر ئـەوەی هیـچ دەستووریکی وەك قورئان دانەنراوە و دایـش نـانرێ، چاکـەی هـەموو بوونـەوەرانی تیـدا بـێ، ناگونجێ خودای مەزن یاسایە دابنـێ زیـانی هیـچ کەسـی تیدابێ، ئەگـەر بدریتـە پـاڵ قورئـان دەستوورێ ریك نەکەوێ لەگەڵ سەرچاوەی پاکی قورئان، ئـەو دەسـتوورە نـەزانین و دەسـت هەلبەستی دوژمنانی ئیسلامە. ئایینی ئیسلام لە راستی و لە بوونیدا بەو جۆرەیە لە خـۆی و لـە نامەکەی‌دا، هەرشتێ ئادەمیزاد بە سروشتی پاکی خۆی داوای بکا لەو نامەیەدا هەیە بە بێ کەم و کوری، لە نارەوایی و چاو چنۆکی و ستەم و دەست دریژی دوورە. بەو راستی‌یانە زانایـان و شاعیران و هونەمەندانی رۆژئاوا بریاری خۆیانیان دەربریوە و بلاویان کردووەتەوە، ئەو زانایانـە زۆربەی زۆریان ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان بە گەورە داناوە و نرخاندوویانە، بە جۆریکـی چـاك و بە بێ پەردە بەسەر پیغەمەر و ئایینی ئیسلامدا هەلیان داوە، ئەو زانایانە مەبەستی‌یان بەرگری یـە لەتاوانج گرتنە ئایینی ئیسلام و روون کردنەوەی ماف و دادپـەروەری بـووە. ئەگـەر دریـژەی نەکیشایە زۆر بیر و بۆچوون و گفتوگـۆی ئـەو زانایانـەمان بـاس ئـەکرد. بـەلام کـە نـەتوانین هەمووی باس بکەین واز لە هـەموو شـتێ نایـەرین. لـە نـاو ئـەو زانایانـەدا ئـەم زانـا بەرزانـە هەلئەبژیرین.

١ – زانای بە ناوبانگ (جوتە) شاعیری ئەلمانیا کە قورئـانی خویندووەتـەوە، بـە باشـی لـە مەبەستی قورئان گەیشتووە، قورئانی بە گەورە داناوە. بە جۆرێ بۆ نرخاندنی قورئان، لە شەوی (لیلة القدر)دا کە شەوی هاتنە خوارەوەی قورئانە کۆر و کۆبوونەوەی بۆ سازاندووە، خۆشی و شادی ساختە هیناوە، بە دریژی میژووی پیغەمەری خویندووەتەوە، نەشیدی تایبـەتی بـۆ نرخـی پیغەمەر داناوە، شانۆگەری موحەمـەدی نووسـیوەتەوە، لـەو شـانۆگەری‌یەدا ئـەلێ: هـەرکاتێ ئیسلام بریتی بێ بۆ خۆبەدەستەوەدان بۆ خودا، نەك بۆ ئارەزۆی مەبەستی تایبەتی، ئیمە هەر بـۆ ئەو ئیسلامە ئەژین و هەر لەسەر ئیسلامیش ئەمرین.

٢ – (لامرتین) شاعیری گەورەی فەرەنسا ئەلێ: بە راستی هەموو ژیـانی موحەمـەد بەلگـەن لەسەر ئەوەی فیلباز نەبووە، لەسەر پوچایەتی نەژیاوە. بە راستی رابەری مرۆڤە بـۆلای ئـەقڵ و ژیری، دانەری ئایینیەکە گومان و درۆی تیدا نیٍیە.

٣- (تولستوی) فەیلەسوفی مرۆڤایەتی روسیا ئەلێ: بێگومان موحەممەد خزمەتی بەریوەبەری کۆمەڵایەتی کردووە بە چەندین خزمەتی کۆمەڵایەتی، بەسە بۆ شانازی کردن بە موحەممەد بە سەدان ملیۆن کەسی شارەزای رووناکی و ئاسایش و ئاشتی درووست کردووە، بە مرۆڤایەتی بەخشیوە ژیانی سەربەستی، ئەوەیش کاریکی زۆر گەورەیە، هیچ ئادەمیزادێ ناتوانێ بەو کارە هەلسێ، مەگەر کەسیك هیزیکی پێ درابیت و یارمەتی درابێ لە ئاسمانەوە.

٤- (برنادشۆ) هونەرمەندی ئینگلیزی ئەلێ: پیویستە ناوی موحەممەد بنرێ بە رزگارکەری مرۆڤایەتی و ئەلێ: بە راستی مـن بـروام وایـە ئەگـەر موحەمـەد گـەورەیی و رابەرایـەتی ئـەم بوونەوەرانەی ئەم سەردەمە بگریتە دەست، سەر ئەکەوێ لە نەهیشتنی هەموو گیروگرفتیك، بە جۆرێ ئاشتی و بـەختیاری رابکیشـێ بـۆلای بوونـەوەران. بـە راسـتی موحەمـەد تـەواوترین و گەورەترینی ئادەمیزادی رابردوو و ئادەمیزادی ئەم سەردەمەیە، بیر ناکریتەوە وینـەی موحەمـەد لەمەوپاش پەیدا ببێ. ئەو گفتوگۆیەی (برنادشۆ) مانای وایە: پەیامی موحەممەد پیویستی بە هیـچ پەیامێ تر نییە لە پەیامەکانی پیغەمەرانی پیشـوو، بـە عیسـا و ئیبراهیمـەوە، ئـەو گفتوگۆیـەی (برنادشۆ) کە ئەلێ: (بیر لە بوونی وینەی موحەممەد ناکریتەوە بۆ لەمەوپاش: مانـای وایـە هیـچ کەسێ توانای ئەوەی نییە لە دوای موحەممەد ﴿ﷺ﴾ شتیکی تازە بۆ مرۆڤایەتی بهینێ و سوودی زۆرترینی لەوەی موحەممەد هیناویەتی تیدابێ، مانایشی وایە بە راستی پەیامی موحەمـەد و ئـایینی موحەممەد پیویستی بە هیچ پەیامێ نییە کە بکرێ بە یاسا.

هەموومان ئەزانین (برنادشۆ) لە پیشەوەی پیشەوایانی بیرکەرەوەی ئەوروپییەکانە لە خـولی بیستەم کە خولی (زەرەو) تـاقی کردنـەوەی بۆشـاییەکانی سـەرەوەی ئـەم سـەرزەمینەن، ئـەو شایستەیییەی برنادشـۆ هـەر لـە خۆیـەوە نـەبووە، بـەلکو بەرهـەمی بیرکردنـەوەی قـوڵ و لیکدانەوەی دووری خۆیەتی. ئەو شایستەییەی برنادشۆ مانـاو مەبەسـتی فـەرموودەی قورئانـە ﴿ و ما ارسلناك الا رحمة للعالمين ﴾ روون کردنەوەی مانای ﴿و لكن رسول الله و خاتم النبيـين﴾ لە هەموو کات و لە هەموو جیگەیە.

بەڵگەی روونیشە لەسەر راستی موسلمانان لەبارەی بیر و باوەری خۆیانەوە کـە موحەمـەد ﴿ﷺ﴾ تەواوترینی ئادەمیزادی رابردو و ئادەمیزادی ئەم سەردەمەیە.

دوای ئەو هەموو بیروبۆچوونانەی زانایانی ئەوروپا، زۆر جیگەی سەرسورمانە کە لاوانی ئەم سەردەمە کە باوەریان بە ئایینی پیشووی باو باپیرانیان نیی، ئەبێ بەڵگـەیان چ شـتێ بـێ بـیر و بۆچوونیان لەبارەی (برنادشۆوە) و زانایانی تری ئەوروپا چۆن بێ؟ ئایا ئەوان زاناترن لەوان؟ کە زۆرتر بە تەنگی مرۆڤایەتییەوە دین، با هەلقە لەگویی دوژمنانی ئیسلام بن؟

﴿ أفبهذا الحديث أنتم مدهنون ﴾ ئایا دوایی ئیوەی دوو روو، باوەرتان بەو قورئانە نییە، بە درۆی ئەخەنەوە کاتێ ئەخوینرێ بەسەرتانا، بە روالـەت باوەری پێ ئەهینن و، بێباوەریتان لـە دەروونی خۆتاندا پەنهان داوە، ئیوە سستی ئەکەن و باوەری پێ نایەرن.

﴿ وتجعلون رزقكم أنكم تكذبون ﴾ وە ئیوە بێباوەری و بە درۆخستنەوەی قورئان دائەنین بە جیگەی باوەر و سوپاس لەسەر چاکەی خودا بۆ ئیوە، ئەو بەشەی خۆتانە لە قورئان باوەری پێ ناکەن.

﴿ فلولا إذا بلغت الحلقوم وأنتم حينئذ تنظرون ﴾ دوایی کاتێ گیانی یەکێ لە ئیوە گەیشتە قورگی و لە سەرەمەرگدا بوو، ئیوەی دوو روو لە لای دانیشتبوون لەو کاتەدا ئیوە تەماشای ئەکەن و، ئاواتە خوازن بژی و نەمرێ چاك ببیتەوە، ئایا ئیوە ئەتوانن کاریکی بۆ فەرهەم بهینن و رزگاری بۆ بگیرنەوە، دیارە ئیوە ناتوانن ئەو کارە بکەن.

﴿ ونحن أقرب إليه منكم ولكن لا تبصرون ﴾ و ئیمە نزیکترین لە ئیوە بەو کەسەی لەسەرەمەرگدایە، بەڵام ئیو دووروون نایزانن، یانێ خودا ئەزانێ بەو شتەی تووشی ئەو کەسە بووە لەسەرەمەرگدایە، ئەزانێ بە بێ توانایی ئیوە و، بە خەفەتی ئیو بۆ نەمانی. بەڵام ئیوە نازانن زانین و توانی خودا لە هەموو جیگەیە ئامادەیە.

﴿ فلولا إن كنتم غير مدينين ترجعونها إن كنتم صادقين ﴾ دوایی ئەگەر ئیوە لە رۆژی دوواییدا پاداشتتان نادریتەوە، خۆتان سەربەستن و، پرسیاری هیچ شتێ لە ئیو ناکرێ، ئەگەر ئەو کارە بەو جۆرەیەبە گومانی خۆتان، بۆ ئیوە مردن لە خۆتان دوور ناخەنەوە، گیانتان بگیرنەوە، ئەگەر ئیوە راست ئەکەن سەربەستن و هیچ کەسێ دەستەڵاتی بەسەرتانا نییە.

﴿ فأما إن كان من المقربين فروح وريحان وجنة نعيم ﴾ دوایی ئەو کەسانەی زیندوو ئەکرینەوە لە رۆژی دوواییدا لەو کەسانەبوون، نزیك کرابوونەوە لە خودا بەهۆی پەرستنەوە، ریزیان لێ گیراوە، پاداشتەکەیان خۆشی و ئاسایش و، خواردەمەنی پاك و، بەهەشتی خاوەن رابواردن و جیگەی نایاب لە بەهەشتا.

﴿ وأما إن كان من أصحاب اليمين فسلام لك من أصحاب اليمين ﴾ و ئەگەر ئەو مردووانە لە یاوەرانی دەستەی راستبن و لەو کەسانە بوون نامەی کرداریان درابوو بە دەستی راستییانەوە، دوایی تۆی باوەردار لەو کەسانەی نامەی کرداریان دراوە بە دەستەوە و، پاداشتەکەت شاسایش و نەترسانە لە سزای خودای خاوەن میهرەبانی.

﴿ وأما إن كان من المكذبين الضالين فنزل من حميم وتصلية جحيم ﴾ وە ئەو کەسەی لە سەرەمەرگدایە لەو کەسانە بێباوەریان نەهیناوە و، زیندوو بوونەوەیان بە درۆ ئەخستەوە و، لە ریگەی راست لایاندابوو، پاداشتەکەی خواردنەوەیە لە ئاویکی زۆر گەرم، دانیشتبیت لە ناو ئاگردا، چەشتنی سزای سەختە.

﴿ إن هذا لهو حق اليقين ﴾ ئەو شتانەی باسکران بۆ ئەو کەسانەی لەسەرەمەرگدان راستە و لەو شتانەیە گومانی تیدا نییە.

﴿ فسبح باسم ربك العظيم ﴾ دوایی پەروەردگاری گەورەی خۆت پاك بکەرەوە لە شتێ شایستەی ئە نەبێ لە هاوبەش دانان و بە درۆخستنەوەی ئایەتەکانی قورئان و بێسوپاسی چاکەکانی و، بە دەستووری خودا نویژەکانت جێبەجی بکە.

**بە یاریدەی خوا تەواو بوو**

تەفسیری زمناکۆیی

# ﴿ سورەتی ئەلحەدید ﴾

لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: لە مەكە هاتووەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەكانی (٢٩) ئایەتن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُۥ مُلۡكُ
ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢﴾
هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾
هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ
عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ
ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ
بَصِيرٞ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ
﴿٥﴾ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۚ وَهُوَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ
ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾

﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾ هەموو شتێ لە ناو ئاسمانەكان و زەوی‌دان بە گیانداران و بێ‌گیانەوە پاك و خاوێنی‌یان دەربڕیوە بۆ خودا و، دووریان خستووەتەوە لە كاری ناشایستە و خودا زۆر گەورە و بە توانایە. زۆر زانایە هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

ئەو ئایەتە بۆمان دەرئەخا، هەموو بوونەوەران پاكی و پوختەیی بۆ خودا دەرئەبڕن، بوونەوەرانیش دوو بەشن: هەیانە ئاقڵن و سوژدە و پاكی بۆ خودا دەرئەبڕن بە كردار و بە گفتوگۆ. هەیانە خاوەنی ئەقڵ نین، سوژدە و پاكی بۆ خودا دەر ئەبڕن بەو زمانە تایبەتی‌یەی كە خودا پێی بەخشیون و خۆی ئەیزانێ.

خودای مەزن لەم سورەتەدا و لە سوورەتی ئەلحەشردا و لە سوورەتی سەفدا بە كرداری ڕابردوو ئەفەرموێ ﴿ سبح ﴾، لە سوورەتی ئەلجومعەدا و لە سوورەتی تەغابووندا بە كرداری

داهاتوو ئەفەرموێ ﴿ یسبح ﴾ بۆ ئەوەی بزانرێ، خودای مەزن لە هەموو کاتێکا بەبێ جیاوازی خاوەنی پەرستن و رێز و پاکییە.

﴿ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ هەر بۆ خودایە پاشایەتی و خاوەنییەتی ئاسمانەکان و زەوی، هەر خودا ئەیانبا بەڕێوە، زیندوویان ئەکاتەوە لە جیهاندا و، دوایی ئەیان مرێنێ و، دواتر زیندوویان ئەکاتەوە، لە پاشەڕۆژدا بۆ پرسیار و پاداشت و، توانای بەسەر هەموو شتێکا هەیە.

﴿ هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴾ خودایەکی ئەوتۆیە هەر ئەو بووە یەکەم جار هیچ کەسێ بەر لەو نەبووە و، هەموو بوونەوەران ئەو هێناونییەتە بوونەوە، دوایش هەر خودا پایەدار و بوونەوەران هەموو لە ناو ئەچن و هەر ئەو بە بەردەوامی ئەمێنێتەوە و، هەر خودایە بوونەکەی ئاشکرایە بەهۆی بەڵگەی زۆرەوە ئاشکراترە لە هەموو شتێ و، هەر خودایە نابینرێ و ئەو هەموو شتێ ئەبینێ و کەس نازانێ چۆنە و، خودا بە هەموو شتێ ئەزانێ، چونکە ئەو درووستی کردوون.

﴿ هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە ئاسمانەکان و زەوی درووست کردووە لە شەش ڕۆژدا، نەك لە شەش ڕۆژی وەك ئێستا، چونکە ئەوکاتە نە ڕۆژ و نە شەو و نە خۆر هەبووە. بەڵام بە شەش نۆبە بە شەش گۆڕان ئاسمانەکان و زەوی هێناوەتە بوونەوە. هەتا وەك ئێستای لێ هات شایستەی ئەوەبن ژیانی گیانداران بەسەر ببرێ.

بۆ نموونە: زەوی یەکەم جار لەگەڵ جگەی خۆی دووکەڵ بوون، لەپاشانا خۆر درووست کراوە، زەوی پارچەیە بووە لە خۆر، خودا لە خۆری جوێ کردووەتەوە، لە زەوی‌دا ئاو و ووشکانی درووست کرد و بوو بە شایستەی ژیان لەسەری، خواردەمەنی و هۆی ژیان و گوزەرانی لەسەر زەوی و لە ناو زەوی‌دا درووست کردووە دواجار ئادەمیزادی تێدا درووست کرد.

﴿ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ ﴾ لە پاشانا خودا دەستەڵات و توانای خۆی پەیدا کرد بەسەر هەموو بوونەوەراندا، بەگوێرەی زانیاری و توانای خۆی هەڵی سووڕاندن و، هەموو شتێکی لە جێگای شیاوی خۆیا دانا، ووشەی (العرش) هێمایە لە توانای بێوێنەی خودا بەسەر هەموو بوونەوەراندا.

﴿ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا ﴾ خودا ئەزانێ بە شتێ ئەچێتە ناو زەوی و لە ئێمە پەنهانە، وەك دانەوێڵە و ئاو و نەوت و جانەوەرە و زێڕ و زیو، هەموو ئەو شتانەی ئەچنە ناوی و، ئەزانێ بە شتێ دێتە دەر لە زەوی لە گیا و دانەوێڵە و نەوت و شتی تر و، بەوانەیش دەرئەهێنرێن لە زەوی، وەك ئاسن و زێڕ و زیو و ئەڵماس و ئاو و شتی تریش.

﴿وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا﴾ وە خودا ئەزانێ بە شتێ دێتە خوارەوە لە ئاسمانەکان، وەك فریشتەکان و باران و بەفر و بزیسکە و ڕووناکی و هەموو هۆیەکانی ژیان و، ئەزانێ بە شتێ بەرز ئەبێتەوە بۆلای ئاسمان، لە کردەوە و کاری ئادەمیزاد و هەڵم و دووکەڵ و شتی تریش.

﴿ وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ وە خودا لەگەڵ ئێوەیە لە هەر جێگەیە بن، لە هەموو کات و لە هەموو جێگەیە، هیچ چاوێ خودا نابینێ و ئەو هەموو شتێ ئەبینێ، خودا ئەبینێ هەموو شتێ ئێوە بیکەن، پاداشتتان ئەداتەوە بە گوێرەی خۆیان و، خودا ئەزانێ بە شتێ ئێوە بیکەن لە کاری هەردوو جیهانتان.

﴿ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَى اللَّهِ تُرْجَعُ الْأُمُورُ ﴾ هەر بۆ خودایە پادشایەتی و خاوەنی‌یەتی ئاسمانەکان و زەوی، دەستەڵاتی بێ‌مەرجی هەیە بەسەریاندا و، بۆلای خودایە هەموو کارێ ئەگەرێتەوە، فەرمان و فەرموودەی خۆی بۆ ڕوون کردوونەتەوە.

﴿ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ وَهُوَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴾ خودا کاتی شەو ئەباتە ناو کاتی ڕۆژ و کاتی شەو زۆر ئەبێ و، کاتی ڕۆژ ئەباتە ناو کاتی شەو و کاتی ڕۆژ زۆر ئەبێ، خودا ئەزانێ بە شتێ لە ناو دڵی ئادەمیزاددایە.

بۆ زانین: بۆ ئەوەی چاکتر لە مانای ئەو ئایەتە بگەین: هەندێ جێگە لە ڕووی زەوی لە تاریکی‌دان و هەندێ جێگەی تری لە ڕووناکیدان، وەك ئەبینرێ کاتی شەو لە عێراقدا ڕۆژی ئەمریکایە و، بە پێچەوانەیشەوە، بە فەرمانی خودا زەوی ئەسووڕێتەوە بە دەوری خۆردا، شەو و ڕۆژ پەیدا ئەبێ و وەرزەکان پەیدا ئەبن و، بە جۆرێ وا ئەبێ شەو درێژ ئەبێ و، وایش ئەبێ ڕۆژ درێژ ئەبێ، وایش ئەبن یەکسان ئەبن، لە کاتی هاتنە خوارەوەی تیشکی خۆر ڕاستەوخۆ بۆ سەر زەوی بە بێ خواری.

ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُوا۟ مِمَّا جَعَلَكُم
مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَأَنفَقُوا۟ لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿٧﴾
وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ۙ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ وَقَدْ
أَخَذَ مِيثَـٰقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبْدِهِۦٓ
ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ لِّيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمْ
لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ
ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا يَسْتَوِى مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ ٱلْفَتْحِ
وَقَـٰتَلَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُوا۟ مِنۢ بَعْدُ وَقَـٰتَلُوا۟ ۚ
وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا
ٱلَّذِى يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَـٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١١﴾

﴿ آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ ﴾ ئێوەی ئادەمیزاد باوەڕ بە خودا و بە نێردراوی خودا بهێنن، هەندێ لەو شتەی خودائێوەی کردووە بە جێگەداری خۆی. لەو شتەدا ببەخشن لە ڕێگەی ئایینی خودا. بە ڕاستی ئەو سامان و دارایییەی ئێوە هەتانە لە ڕاستیدا خاوەنەکەی خودایە و، ئێوەی کردووە بە وەکیلی خۆی و، ئەبێ ئێوە بە گوێرەی فەرمانی خودا دەست کاریyan بکەن و، لە کاری ڕەوادا بەکاری بهێنن.

﴿ فَالَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَأَنفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ ﴾ دوایی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بە خودا بە نێردراوی خودا لە ئێوە و، هەندێ لە دارایی خۆیانیان بەخشیوە لە ڕێگەی ئایینی خودا، بۆ ئەو کەسانە هەیە پاداشتێکی زۆر گەورە.

﴿ وَمَا لَكُمْ لَا تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ لِتُؤْمِنُوا بِرَبِّكُمْ ﴾ وە ئێوە چ بیانوویەکتان هەیە باوەڕ نەیەرن بە خودا و، نێراوی خودا داوا لە ئێوە ئەکا بۆ ئەوەی ئێوە باوەڕ بهێنن بە پەروەردگاری خۆتان؟

﴿ وَقَدْ أَخَذَ مِيثَاقَكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾ وە بە ڕاستی خودا پەیمانی لە ئێوە وەرگتووە کە فەرمانەکانی خودا بەجێ بهێنن بەهۆی ئەقڵەوە کە خودا بەخشیویەتی بە ئێوە، بەهۆی ئەو بەڵگانەوە دەری خستووە ئێوە بێفەرمانی خودا نەکەن، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بەو بەڵگانە هەیە و، ئەقڵ شارەزایی ئێوەی کردووە باوەڕ بە خودا بهێنن.

﴿ هُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ عَلَى عَبْدِهِ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَإِنَّ اللَّهَ بِكُمْ لَرَؤُوفٌ رَّحِيمٌ ﴾ خودا کەسێکی ئەوتۆیە ئەنێرێتە خوارەوە بۆ سەر بەندەی خۆی کە موحەمەدە چەندین ئایەتی ئاشکرای قورئان لەبەر ئەوەی ئێوە دەربکا لە تاریکییەکانی بێباوەڕی بۆلای ڕووناکی باوەڕهێنان و شارەزاییتان بۆلای چاکەی هەردوو جیهان و، بە ڕاستی خودا زۆر بەزەییە، میهرەبانە بۆ بەندەکانی خۆی.

﴿ وَمَا لَكُمْ أَلَّا تُنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ﴾ وە ئێوە چ بیانوویەکتان هەیەکە ئێوە دارایی خۆتان نەبەخشن لە ڕێگەی ڕەزامەندی خودا و، بۆ بەرزکردنەوەی فەرموودەی خودا و، پەرەپێدانی ئایینی خودا و، هەر بۆ خودایە پاشماوەی دارایی ئاسمانەکان و زەوی کە ئادەمیزاد بە جێیان هێشتووە، هیچ شتێ لە دارایی و سامان بۆ هیچ کەسێ نامێنێتەوە لە جگەی خودا.

﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ﴾ کەسێ لە ئێوە دارایی خۆی بەخشی بێ و گیانی خۆی دانابێ بەر لە گرتنی شاری مەکەو، جەنگی کردبێ لەگەڵ بێباوەڕان بۆ بەرز ئایینی ئیسلام یەکسان نین لەگەڵ ئەو کەسانەی دارایی خۆیانیان بەخشیبێ و جەنگیان کردبێ دوای گرتنی مەککە.

چونکە ئەوانەی پێشوو لاواز بوون و ژمارەیان زۆر کەم بووە، هەژار بوون و کەسیان نەبووە بیانپارێزێ و بەتەمای دەست کەوت نەبوون.

﴿ أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ﴾ ئەو کەسانەی پێشوو لە لای خودا پلەیان زۆر گەورەترە لە کەسانێکی ئـەوتۆ دارایـی خۆیانیـان بەخشـیوە و، جـەنگیان کـردووە لەگەڵ بێباوەڕان بۆ پەرەپێدانی ئایینی خودا دوای گرتنی شاری مەککە.

﴿ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَى وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴾ وە خودا بەڵێنی داوە بە هەموو کەسێك لەوانەی لە پێش داگیرکردنی مەککە باوەڕیان هێناوە و جـەنگیان کـردووە. بەوانـەیش دوایـی باوەڕیان هێناوە و جەنگیان کردووە بە شیرینترین پاداشت و خۆشی بەهەشت و، خودا بـە شـتێ ئەزانێ ئێوە ئەیکەن. بە گوێرەی کرداری خۆتان پاداشت وەرئەگرن.

﴿ مَن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ وَلَهُ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴾ چ کەسـێکی ئەوتۆیـە ببەخشێ و دەروونی خۆی و دارایی خۆی ببەخشێ لە ڕێگەی ڕەزامەندی خودا و، بە ئومێـدی ئەوەی خودا پاداشتی بداتەوە، دوایی خودا بە دوو چەنانە و زۆرتریش پاداشـتی بداتـەوە و، بـۆ ئەو کەسە هەیە پاداشتێکی گەورە و بە نرختر لە ڕۆژی دوایی‌دا.

يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾

﴿ يَوْمَ تَرَى الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ يَسْعَى نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِم ﴾ تـۆ بـیری ڕۆژێ بکەرەوە پیاوانی باوەڕدار و ژنانی باوەڕدار ئەبینن ڕووناکی باوەڕهێنان و پەرستنیان لە پێشیانەوە و، لە دوایانەوە و، لە هەمو لایەکیانەوە ئەڕوا، هەتا ڕێگەی خۆیان بدۆزنەوە کاتێ ئەچن بۆلای بەهەشت، بێگومان لە جیهاندا کاریان کـردووە بـۆ ئـەو ڕووناکی‌یـە، بـە نیـازی پاکـەوە. لـە پاشەڕۆژدا دەستی‌یان کەوتووە، بە جۆرێ ئادەمیزاد لـە جیـهاندا بـە ڕوونـاکی چـرای ڕێگـەی خۆیان ئەدۆزنەوە.

﴿ بُشْرَاكُمُ الْيَوْمَ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴾ فریشتەکان بەوباوەڕدارانە ئەڵێن: ئەو شتەی ئەوتۆ موژدەی پێ ئەدرێ بە ئێوە چەندین بەهەشتە ئەڕوا بە ژێر درەختەکانیدا و، بەم لاو لای کۆشکەکانی چەندین ڕووبار لە ئاوی شیرین، ئێوە بەردەوامن لە ناو ئەو بەهەشتانەدا، ئەو موژدانە بەوان ڕزگاربوون و سەرکەوتنێکی زۆر گەورەیە.

﴿ يَوْمَ يَقُولُ الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ لِلَّذِينَ آمَنُوا انظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ ﴾ تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوە پیاوە دوو ڕووەکان و ژنە دوو ڕووەکان ئەڵێن بە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە، ئێوە ڕوو بکەن بۆلای ئێمە، بۆ ئەوەی ئێمە بەو ڕووناکییەی ئێوە بەشی خۆمان وەرگرین و خۆمان ڕزگار بکەین لەو تاریکییەی دەوری ئێمەی داوە.

﴿ قِيلَ ارْجِعُوا وَرَاءَكُمْ فَالْتَمِسُوا نُورًا ﴾ لە لایەن باوەڕدارانەوە بەو دووڕووانە ئەبێژرێ: ئێوە بگەڕێنەوە بۆلای ئەو جێگەیەی کە نامەی کردارتان درایە، دوایی ئێوە لەو جێگەیە داوای ڕووناکی بکەن.

﴿ فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُ بَابٌ بَاطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظَاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ الْعَذَابُ ﴾ دوایی دانراوە لە نێوان باوەڕداران و بێباوەڕاندا دیوارێ، ئەو دیوارەدەرگایەکی هەیە، ناوەوەی ئەو دەرگایەی لای باوەڕدارانەوەیە خۆشی و بەهەشتی تێدایە بۆیان و، دەرەوەی دیوارەکە لای بێباوەڕان ئاگر و سزای دۆزەخە.یانێ لە نێوان بەهەشت و لە نێوان دۆزەخدا دیوارێك هەیە، دوو لای هەیە، لایەکیان دیار نییە کە لە لای باوەڕدارانەوەیە، ئەولاکەی ئەبینرێ بۆ دووڕووان و تاوانبارانە و ئەبینرێ.

﴿ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا بَلَىٰ ﴾ دووڕووەکان بانگی باوەڕداران ئەکەن، ئایا ئێمە لە جیهاندا لەگەڵ ئێوە نەبووین و نوێژ و ڕۆژوومان بەجێ نەئەهێنا و ئەو شتەی ئێوە ئەتان کرد ئێمەش ئەمان کرد، بۆ ئێوە ئەچنە بەهەشت و ئێمەش ئەچینە ناو دۆزەخ. باوەڕدارانیش ئەڵێن: ئێوە لەگەڵ ئێمە بوون و نوێژ و ڕۆژتان ئەکرد.

﴿ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ الْأَمَانِيُّ ﴾ وە بەڵام بێباوەڕی و بێ فەرمانی خودا و ئارەزۆی دەروونتان ئێوەی لە ناو برد و، چاوەڕوانی ئەوەتان ئەکرد خراپە و نەمان تووشی باوەڕداران بێ و، لە گوماندا بوون پێغەمەر ڕاست ئەکا و زیندووبوونەوە ئەبێ و، ئاواتی پڕ و پوچ فریوی ئێوەی دابوون، بە تەمای ڕسوایی باوەڕداران بوون.

﴿ حَتَّىٰ جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ وَغَرَّكُم بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴾ هەتا هات بۆلای ئێوە فەرماندانی خودا بە مردنی ئێوە و بە خزمەت پرسیاری خودا گەیشتن و شەیتان فریوی ئێوەی دا بەوەی میهرەبانە و سزای ئێوە نادا.

﴿ فَالْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مَأْوَاكُمُ النَّارُ هِيَ مَوْلَاكُمْ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴾ دوایی ئەمڕۆ بریتی و بەرتیل لە ئێوە و کەسانێکی وەك ئێوە وەرناگیرێ کە باوەڕتان نەهێناوە ولە ئاگر بێنە دەرێ، جێگەی ئێوە ئاگری دۆزەخە، ئاگری دۆزەخ شایستەی ئێوەیە، ئاگر خراپ جێگەی گەڕانەوەی ئێوەیە.

کاتێ باوەڕداران هاتنە مەدینە تووشی خۆشی و ڕابواردن بوون و، کەمتەرخەمی‌یان ئەکرد لە هەندێ کاری پێشووی خۆیاندا، خودای مەزن سەرزەنشتی کردن بەم ئایەتەی دوایی: هەندێ لە زانایان ئەڵێن لە بارەی کەسانێکەوە هاتوونەتە خوارەوە کە بە شاکرا باوەڕدار بوون، لە ژێر وە بێ‌باوەڕ بوون. خودای مەزن فەرمووی:

أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ۚ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَ ۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٩﴾

﴿ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ ﴾ ئایا بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە و دڵیان کراوەتەوە بە ئایینی ڕاست کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوان کە دڵیان بترسێ لە یاد و لە ئامۆژگاری خودا و، خۆیان دوور بخەنەوە لە بێ فەرمانی خودا بە بێ سستی و تەمبەڵی:

﴿ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ وە بە وێنەی کەسانێکی ئەوتۆ نەبن لەمەوبەر نامەیان پێ بەخشرابوو لە جووەکان و گاورەکان، دوایی کاتێ نێوان ئەوان و پێغەمەرەکانیان درێژەی کێشا بەسەریاندا، دووایی دڵیان ڕەق بوو، ووشك هەڵگەڕا و چاکەیان وەرنەئەگرت و بەرەولای بێ‌باوەڕی گەڕانەوە و، زۆرتر لەوان لە ئایینی خودا لایان دا و لە فەرموودەی خودا دەرچوون. کەواتە ئێوەی موسڵمان وەك ئەوان مەبن و بە درێژایی کات لە ئایین وەرمەگەڕێن.

﴿ اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾ بەڕاستی ئێوە بزانن کە خودا زەوی زیندوو ئەکاتەوە، لەدوای مردنی و ووشکبوونی بە سەوزایی، بەهۆی بارانەوە، هەر بەو جۆرەیش ئێوە دوای مردنتان زیندووتان ئەکاتەوە بۆ پرسیار و وەرگتنی پاداشت و تۆڵە.

﴿ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ بە ڕاستی ئێمە چەندین بەڵگەی ئاشکرامان بۆ ئێوە ڕوون کردووەتەوە لەسەر توانای ئێمە، بۆ ئەوەی ئێوە بیر بکەنەوە و، باوەڕ بە توانای ئێمە بهێنن و بێفەرمانی خودا نەکەن. بە ڕاستی ئێوە بەرپرسیارن لە ڕۆژی دووایی‌دا بە شتێ دوای پێغەمەر ئێوە پەیدای ئەکەن و، پەیوەندی‌یان بە ئایینەوە نی‌یە، چوونکە ڕاستی بۆ ئێوە ڕوونە.

﴿ إِنَّ الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ وَأَقْرَضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴾ بە ڕاستی ئەو پیاوانە و ئەو ژنانەی ئەوتۆ دارایی خۆیان بەکار ئەهێنن لە یارمەتی دانی هەژاراندا و ئازاری‌یان لێ دوور ئەخەنەوە و، ئەو کەسانەی ئەوتۆ بە خۆشی دەروونی خۆیان و لەبەر ڕەزامەندی خودا چاکە ئەکەن لەگەڵ هەژاران بە ئومێدی ئەوەی خودا پاداشتیان بداتەوە، پاداشتی ئەوەی ئەیبەخشن بۆیان دوو چەندانە و زۆرتر بۆیان دووپات ئەکرێتەوە و، بۆ ئەوان پاداشتێکی زۆر بە نرخ و گەورەیە، ڕووناکی باوەڕیان ڕێگەی چوونیان بۆلای بەهەشت ڕووناک ئەکاتەوە، شتی زۆرتریشیان پێ ئەبەخشێ.

﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ أُولَئِكَ هُمُ الصِّدِّيقُونَ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بە خودا و بە نێردراوەکانی خودا، ئەو کەسانە ئەوانەن دۆست و خۆشەویستی خودان و ڕاست گۆن، بەردەوامن لەسەر باوەڕ بە گفتوگۆ و بە کردار، ڕاستی ڕەوشتی‌یانە و، ڕزگاریان ئەبێ لە گیرورگفتی جیهان و لە ئازاری دوارۆژ و، ئەخرێنە ناو بەهەشت.

﴿ وَالشُّهَدَاءُ عِنْدَ رَبِّهِمْ لَهُمْ أَجْرُهُمْ وَنُورُهُمْ ﴾ وە ئەو کەسانەی کوژراون لە ڕێگەی بەرزی ئایین و، بەردەوامبوونی ئایین، بۆیان هەیە پاداشتی خۆیان و ڕووناکی خۆیان: پاداشتەکەیان ئەوەیە کە خودا ئاماژەی بۆ ئەکا و ئەفەرموێ ﴿ إن الله أشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأن لهم الجنة ﴾ ڕووناکی‌یەکەیشیان ئەوەیە کە خودا ئاماژەی پێ کردووە و ئەفەرموێ: ﴿ يسعى نورهم بين أيديهم ﴾.

﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴾ وە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە و، ئایەتەکانی نامەی ئێمە بە درۆ ئەخاتەوە و باوەڕیان پێ نایەرن، ئەو کەسانە دانیشتوو و هاوڕێ و یاری دۆزەخن.

ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَـٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَـٰمًا ۖ وَفِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَـٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴿٢٠﴾

سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ
وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ
ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢١﴾ مَآ أَصَابَ
مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ
مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٢٢﴾ لِّكَيۡلَا
تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ
لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ
ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٤﴾

﴿ اعْلَمُوا أَنَّمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِي الْأَمْوَالِ وَالْأَوْلَادِ ﴾ ئێوە بزانن بە ڕاستی زیندەگانی و ژیانی جیهان بریتی‌یە لە یاری کردن و بێ ئاگایی و جوانی و خۆ بە گەورە دانان و خۆ هەڵکێشان بە زۆرکردنی‌دارایی و مناڵ و، بێ‌هۆشی‌یە لە پاشەڕۆژ و، لە بیرتان چووەتەوە هەمووتان لە ئادەمن و، ئادەمیش لە خاکە و، دارایی و منداڵیش خودا ئەیبەخشێ بە ئێوە.

﴿ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ الْكُفَّارَ نَبَاتُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَامًا ﴾ ئەو ژیانانە و خۆهەڵکێشان بە دارایی زۆر و منالی زۆرەوە، بە وێنەی بارانێکە بڕژێ بەسەر زەوی‌یەکی تینوو بەسەر ئەو دانەوێڵەو تۆوەی لە ناو زەوی‌دایە، ئەو بارانە ئەو دانەوێڵە و تۆوەی ناو زەوی سەوز بکات، بە جۆرێ گەشە بکات، ئەوشتەی بارانەکە سەوزی ئەکات، چێنەرەبێ‌باوەڕەکەی تووشی سەرسوڕمان ئەکات، بەلایانەوە سەیر ئەبێ چۆن بەو جۆرە پەرەی سەندووە و لاقەکانی بەرزبوونەتەوە، لە پاشانا ئەو گیا سەوزە ووشك ئەبێ، لە پاشا زەرد ئەبێ، لە پاشان ئەشکێ بە یەکا و وورد ئەبێ، وەك کای لێ دێ و با ئەیبا بە ئاسماندا، ئەودارایی و منال و پلەوپایەیە و سامانی جیهانە هەرچەندە یەکەم جار گەشەبکات. بەڵام دواجار ئەنجامەکەی نەمانە، بە وێنەی ئەوشتەی باران سەوزی ئەکات.

﴿ وَفِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٌ ﴾ وە ئەو کەسەی لە جیهاندایە ئەگەر ئەو دارایی و منالانەی بۆ ڕابواردن و شانازی بەکار بهێنێ لە ڕۆژی دووایی‌دا لە ناو سزایەکی زۆر سەخت دایە و، ئەگەر لە خواپەرستی و کاری چاکدا بەکاریان بهێنێ لە ڕۆژی دووایی‌دا لە ناو لێخۆشبوونی خودا و ڕەزامەندی خودایە.

﴿ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُور ﴾ وە ژیان و زیندەگـانی ئـەم جیهانـە هیـچ شـتێ نیـیە مەگەر خۆشێکە ئادەمیزاد فریو ئەدات لـە پاشە ڕۆژ. هەر چەندە پلـە و پایـە و دارایـی و منـاڵ فریوی ئادەمیزاد تووشی بێ فەرمانی خودا ئەکەن بەلاّم ئەگەر بەکاربهێنێ بۆ خزمـەتی خـۆی و خێزانی بۆ فێربوونی زانست و زانیـاری و دەسـت گـیری هـەژاران بـێ ئـەو پـەڕی پەرسـتن و ڕەزامەندی خودان.

﴿ سَابِقُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاء وَالْأَرْضِ ﴾ ئێوەی ئادەمیزادپەلـە بکەن بۆلای کردنی کارە چاکەکان بە جۆرێ بن ئێوە ڕابکێشێ بۆلای لێخۆشـبوون لـە لایـەن پەروەردگاری خۆتانەوە و، بۆلای بەهەشتێ پانایی‌یەکەی بـە وێنـەی پانـایی ئاسمـان و زەویـە، پانای بەهەشت بەو ئەندازەیە بێ، درێژی‌یەکەی مەگەر هەر خـودا بیزانـێ، زانسـت و زانیـاری تازە بۆیان دەرکەوتووە دوری ئەم گەردوونە بێ سنوورە و، توانای خودا بێ ئەندازەیە.

﴿ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيـم ﴾ ئەو بەهەشتە ئامادەکراوە بۆ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێناوە بە خودا و بە پێغەمبەرەکانی خـودا و، ئەو ئامادەکردن و بەڵێن پێدانـە گـەورەیی و چاکـەی خودایـە، ئەیبەخشـێ بـە هەرکەسـێ ئارەزۆی بکا، شایستەی ئەو بەخشینە بێ، خودا خاوەنی بەخشش و چاکەی زۆر گەورەیـە، بـۆ باوەڕداران لـە هەردوو جیهاندا. بێگومان پەرستنی خودا هۆی ڕێزگرتنە.

﴿ مَا أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِّن قَبْـلِ أَن نَّبْرَأَهَـا إِنَّ ذَلِـكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴾ تووشی ئێو نابێ لـە زەوی‌دا هیچ ڕووداوێ لـە چاك و لـە خراپ، لـە هـەرزانی و لـە گرانی، لـە خۆشی و ناخۆشی، لـە کەمبوونەوەی دانەوێڵە و کەم ئاوی و، تووشی ئێوەیـش نابێ هیچ شتێ لـە نەخۆشی و هەژاری و تەندرووستی و، لـە مردنی مناڵتان و دۆستانتان، مەگەر ئەوانە هەموویان تۆمارکراون لـە نامەی خودا و لـــە زانسـتی خـودادا، بـەر لـەوەی ئێمـە ئـەو ڕووداوە و زەوی و ئێوەیش درووست بکەین. بە ڕاستی ئەو تۆمارکردنە و دانانی ئەو شتانە لـەو نامە ئاشکرایەدایە لـەسەر خودا ئاسانە و گران نی‌یە، ڕووداو هەموویان: لـە بوومەلـەرزە و لافاو، جەنگ پەیدابوون و هەژاری، دەست درێژی هەموویان بە دەست خودان.

﴿ لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُـلَّ مُخْتَـالٍ فَخُـور ﴾ بـە ڕاستی من تۆمارم کردووە لـەبەر ئەوەی ئێوە خەفەت نەخۆن لـەسەر شتێ لـە کیسێ ئێوە چـووە و، کەیف خۆش نەبن و لـە خۆتان بایی بن بە شتێ خودا بەخشیویەتی بە ئێوە و، خــودا هـەموو کەسێ خۆی بە گەورە بگرێ، خۆخەڵکێشی خۆشی ناوێ، خۆی لـە دانیشـتووان بـە گـەورەتر بزانێ.

﴿ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبُخْلِ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الْغَنِيُّ الْحَمِيدُ ﴾ ئەو کەسـانە خۆیان بە گەورە دائەنێن و خۆیـان هەڵئەکێشـن و شـانازی بـە سـامانەوە ئەکـەن: کەسـانێکی ئەوتۆن، ڕژدن و چاوچنۆکن، سامانی خۆیان بە کارنایەرن لـە سوودی گشتی‌دا کۆی ئەکەینەوە و، خۆیان ئەکەن بە پاسەوانی و، فەرمان ئەدەن بە ئادەمیزادی تر بە چـاوچنۆکی و بـە ڕژدی و

بەکارنەهێنانی دارایی خۆیان لە سوودی دانیشتواندا و ئەیان ترسێنن و ئەڵێن: تووشی هەژاری ئەبن و، هەرکەسێ پشت بکاتە فەرمانی خودا و ڕووی لێ وەرگێڕێ، دوای خودا پێویستی بە هیچ کەسێ نی‌یە، هەر خودایە خۆی لە خۆیا سوپاس بکرێ، پێویستی بە باوەڕهێنانی هیچ کەسێ نی‌یە، باوەڕهێنان سوودی بۆ خۆیانە.

لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ
وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ
بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ
بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ
وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ
وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَىٰ آثَارِهِم
بِرُسُلِنَا وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ
وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً
ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا
رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ
وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٢٧﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ
وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَّحْمَتِهِ وَيَجْعَل لَّكُمْ
نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعْلَمَ
أَهْلُ الْكِتَابِ أَلَّا يَقْدِرُونَ عَلَىٰ شَيْءٍ مِّن فَضْلِ اللَّهِ وَأَنَّ
الْفَضْلَ بِيَدِ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾

﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە پێغەمەرەکانی خۆمانمان ڕەوانەکرد بۆلای ئادەمیزاد بە چەندین دەستوور و بەڵگەی ئاشکرا و پەك خەر، ڕەوانەمان کرد لەگەڵ ئەو پێغەمەرانەدا نامەیە سوودی هەردوو جیهانی تێدایە، ڕەوانەمان کرد بۆلایان ترازوویە داد پەروەری بێ بەراورد بکەن لە نێوان دانیشتواندا و، ڕەوشتی خۆیان بە گوێرەی یاسای ئەو نامەیە دیاری بکەن، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد هەڵسن بە

دادوەری و، بانگی دانیشتووان بکەن بۆلای پەیڕەوی کردنی ئەو پێغەمەرانـە و جێبەجێ کردنی دەستووری ئایین بە بێ ستەم.

ووشەی (المیزان) بریتی‌یە لـە هەموو شتێ ڕاستی پـێ بناسرێ، ئیتر سروش و فەرموودەی خودابێ، یا ئەقڵ و هەست، یا هەر شتێ سنووری دادپەروەری بپارێزێ، ئەوانـە هـەموویان پێـی ئەوترێ (المیزان) یانێ ترازوو.

ئـادەمیزاد ئـەکرێ بـە دوو بەشـەوە: بەشێکیان پێشـەوایی ئـایین و زانسـت و زانیـاری و ڕۆشنبیری ئادەمیزادیان پێ سپێردراوە، بـۆ پـەرەپێدانی دادپـەروەری و بـەرگری لـە ستەم بـە ئامۆژگاری کردنیان.

بەشەکەی تریان بە هێزی چەك ئادەمیزاد ڕابکێشن بۆلای دادپەروەری و چەسـپاندنی یاسا، ئەم بەشـەیان پێـی ئـەوترێ (دەوڵـەت)، سوپاکەی پێویسـتی‌یان بـە چەك هەیـە کـە یاسـا و دادپەروەری لـە ناو نیشتمان و دەور و بەری‌دا بپارێزن. بەشی یەکەمیان لـە ئایەتی پێشوودا باسی کرا و، بەشی دووەمیان خودای گەورە لـەم ئایەتەی دوایی‌دا باسی ئەفـەرموێ، هـەتا ئـادەمیزاد چەکی لێ درووست بکەن و ئەفەرموێ:

﴿ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ ﴾ وە ئێمە لـە ئاسمانەوە ناردووەتە خوارەوە ئاسن بۆ سوودی ئادەمیزاد بەر لـە درووستکردنی هەموو گیانداران لـەسەر زەوی، خودای مەزن یەکەم جـار زەوی درووسـت کرد زۆر گەرم بوو، دوایی دەستی کرد بە سارد بوونەوە پەیتا پەیتا، ئاسن و کانگاکانی تری لـە زێڕ و زیو و شتی تری لـە زەوی‌دا درووست کرد، جارێ بە شێوەی شلـەمەنی و جـارێ تـر بـە شێوەی هەڵـم لـە زەوی‌یەوە بەرز ئەبنەوە، دوایی ئەبن بە بـاران و ئـەڕژێ بەسـەر ووشـکایی‌دا، ئەچنە ناو بۆشایی‌یەکانی زەوی ساڵ لـە دوای ساڵ، بەهۆی ساردبوونەوەی زەوی ئەو کانگایانە سارد ئەبنەوە نەختە نەختە، دوایی ئاسن و شتی تر پەیدا ئەبێ.

﴿ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ ﴾ لـە ناو ئاسندا هەیە هـێزێکی زۆر سـەخت هەیـە هـێزێکی زۆر سەخت لـە بۆ ئەو شتەی لـەو درووست ئەکرێ بۆ جـەنگ و بـۆ سـوودی ئـادەمیزاد، وەك شمشێر و چەقۆ و دەرزی و تۆپ و ڕێگەی چوونی قەتار و فڕۆکە و کەشتی و شـتی تـری زۆر، هەروەها بۆ سوودی ئادەمیزاد ماشین و ئامێری دەرهێنانی نەوت و زێڕ و زیـو و هێنـانی هـێزی کارەبا و چەندین شتی لێ درووست ئەکرێ و، لـە نـاو ئاسـندا هەیـە چـەندین سـوودی تـر بـۆ ئادەمیزاد، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەفەرموێ: خوای گەورە چوار شتی پیرۆز و بـە پیتـی لـە ئاسمانـەوە ناردووەتە خوارەوە: ئاسن و ئاگر و ئاو و خوێ.

﴿ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَن يَنصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴾ بۆ ئەوەی ئادەمیزاد هەڵسن بـە دادپەروەری و، بـۆ ئـەوەیش خـودا بزانـێ چ کەسـێ یارمـەتی ئـایینی خـودا ئـەدا و یارمـەتی نێرراوەکانی خودا ئەدا، بە بێ ئەوەی خودا و ڕۆژی دوایی‌یان ببینیـێ، بزانـێ چ کەسـێ ئاسـن بەکاردێنێ بوو سوودی ئادەمیزاد، هەرچەندە خودای مەزن زانایە بـە هـەموو شـتێ، بـەڵام بـۆ ئەوەی هەموو کەسێ بزانێ چ کەسێ یارمەتی خودا و پێغەمەرەکانی خودا و ئاسن بەکارئـەهێنێ بۆ سوودی ئادەمیزاد.

بۆ زانین: وەك باسمان کرد ئاسن سوودی زۆری هەیە. بە تایبەتی بۆ بەیەك گەیشتن لە ئاسمان و دەریا و زەویدا. بەلاّم زیانیشی زۆر بەهێزە بۆ لە ناوبردنی زیندەوەران، زۆر گەورەیە پێویستی بە یارمەتی هیچ کەسێ نییە.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا وَإِبْرَاهِيمَ وَجَعَلْنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا النُّبُوَّةَ وَالْكِتَابَ ﴾ وە بە ڕاستی ئێمە نوح و ئیبراهیممان ڕەوانە کرد بۆلای تاقمی خۆیان، ئازاری زۆریان توشبوو، نوح نۆسەد و پەنجا ساڵ ئامۆژگاری تاقمەکەی خۆی ئەکرد، دوایی ئیبراهیم ئامۆژگاری نەوەکانی نوحی ئەکرد و ئازاری زۆریاندا و هەوڵی ئەوەیاندا بیسووتێنندامان نا لە ناو منالەکانی نوح و ئیبراهیمدا پێغەمەرایەتی و بۆمان ڕەوانەکردن نامەی تایبەتی بۆ نەوەکانیان کە تەورات و ئینجیل و قورئانە.

﴿ فَمِنْهُم مُّهْتَدٍ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ دوایی هەندێ لە منالەکانیان شارەزایی و ڕێگەی ڕاستییان وەرگرت و، زۆر کەس لەوان لایاندا لە سنووری دیاریکراوی خودا. بە بێ جیاوازی وێنەی منالەکانی ئەوان، منالەکانی زانایانی ئەم سەردەمەش شوێنەوار و زانستەکانی باوکیان پێشێل کردووە، زۆربەیان بوون بە هەڵقە لە گوێی بێ دینەکان، مەگەر کەمێکیان پەیوەندی ئایین بکەن.

﴿ ثُمَّ قَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِم بِرُسُلِنَا ﴾ لە پاشانا ئێمە چەندین پێغەمەری خۆمانمان نارد دوای نوح و ئیبراهیم لەسەر شوێنەوار و بیر و بڕوای ئەوان، پێغەمەر لە دوای پێغەمەر، هەتا کۆتایی بە ناردنیان هات.بە هۆی ڕەوانەکردنی عیساوە، دوای عیسایش پێغەمەری ئیسلام ڕەوانەکرا و، کۆتایی بە ناردنی پێغەمەران هات و، دوای ئەو پێغەمەری تر نانێردرێ.

﴿ وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وَآتَيْنَاهُ الْإِنجِيلَ ﴾ وە ئێمە عیسای کوڕی مەریەممان هێنا بە دوای هەموو پێغەمەرەکاندا جگەی موحەمەد، نامەی ئینجیلمان پێ بەخشی کە شارەزایی و ڕووناکی هەردوو جیهانی تێدابوو، بە تایبەتی دوور بوو لەوەی کە عیسا کوڕی خوا بێ، یا سێهەمی سێ خودا بێ، یا خودا بێ بە تەنها.

﴿ وَجَعَلْنَا فِي قُلُوبِ الَّذِينَ اتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً ﴾ وە ئێمە دامان نابوو لە دڵی کەسانێکی ئەوتۆدا پەیڕەوی عیسا یان کردبوو، بەر لە گۆڕینی ئینجیل و خۆشەویستی و نەرمی، میهرەبانی لەگەڵ برایانی خۆی. نەك وەك گاوەرەکانی ئێستای دوای گۆڕانی ئینجیل کە هەزاران ئەچەوسێننەوە و بە نارەوا ئەیانکوژن و، جیاوازی ئەخەنە نێوان ڕەش و سپی.

﴿ وَرَهْبَانِيَّةً ابْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَاهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ابْتِغَاءَ رِضْوَانِ اللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ﴾ وە پەیڕەوانی عیسا دوای عیسا وازهێنان لە خۆشی جیهان و ژن نەهێنان و جگەی ئەوانیشیان بۆ خۆیان درووست کرد هەر لە خۆیانەوە، لە چۆڵەوانیدا ئەشکەوتیان بۆ خۆیان ئامادەکردبوو، بەو کێوانەوە ئەژیان و تێکەڵاوی ئادەمیزادیان نەئەکرد، ئێمە ئەو شتانەمان پێویست نەکردبوو لەسەریان و فەرمانمان پێ نەدابوون، بەلاّم خۆیان پەیدایان کردبوو، لەبەر ڕەزامەندی و نزیك بوونەوە بۆلای خودا، دوای پەیڕەوانی عیسا چاودێری ئەو ڕەوشتەیان نەکرد بە جۆرێ

شایستەی چاودێر بێ، هەرچەندە پێشووەکانیان پابەندی بوون بە نیازی پاکەوە، دوایی سەرۆکەکانیان بە کاریان هێنا بۆ پەیداکردنی پلەوپایە و سامان، لەو نیازە پاکەی پێشوو لایاندا.

﴿ فَآتَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴾ دوایی ئێمە بەخشیمان بە کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان هێنابوو بە درووستکردنی وازهێنان لەبەر ڕەزامەندی خودا و، لە فەرموودەی خودا دەرنەچووبوون و پاداشتی کردەوەی پاکی خۆیان و، زۆرتر لەوان لایاندا لە سنووری دیاری کراوی خودا، ئەوانەش بریتین لەو کەسانەیان، ڕەگەز پەرستی و کینە و جەنگ بەکارئەهێنن، ئەو یاسایانە لەسەریان پێویست کراوە، بەجێیان نەهێنابوو.

لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا (رهبانیه) کە بریتییە لە وازهێنانی خۆشی جیهان بە هەموو جۆرەکانی و چۆل پەرستی و خەڵوەتگرتن قەدەغەیە، لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆر فێڵباز هەن خۆیان خەریك ئەکەن بە خەڵوەتگرتن، کار ئەکەنە سەر کەسانی ساویلکە پارەوپوول زۆر پەیدا ئەکەن.

عەبددولای کوڕی عەباس ئەڵێ: پێغەمەر فەرمووی: ڕەهبانییەتی ئەم ئۆمەتەی من لە خۆماندووکردندایە لە ڕێی خودادا، بە کۆچ کردن و نوێژکردن و، ڕۆژ و گرتن و حەج و عەمرە کردن.

پێویستە بزانرێ هۆی پەیدابوونی ڕەهبەنە چ شتێ بووە؟. عەبدوولای کوڕی مەسعود ئەفەموێ: لە پشتی پێغەمەرەوە بووم بە سواری گوێ درێژێ، پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ فەرمووی: ئەی کوڕی ئومو عەبد: ئایا تۆ ئەزانی لە چ کاتێکەوە بەنو ئیسرائیلی ڕەهبەیان دەست پێ کردووە؟ منیش ووتم: خودا و پێغەمەر ئەیزانن، پێغەمەر فەرمووی: چەند پادشای تاوانبار دوای عیسا پەیدابوون، دەستیان کرد بە گوناه و ستەم کردنی زۆر لە باوەڕداران تووڕەبوون و، دەستیان کرد بە جەنگ کردن لەگەڵیان و، سێ جار باوەڕداران شکان، بەو بۆنەوە باوەڕداران کەمیان مانەوە، ووتیان: ئەگەر ئێمە دەرکەوین بۆ ئەو پادشا تاوانبارانە، هەموومان ئەکوژن، لە ناومان ئەدەن و، هیچ کەسێ نامێنێتەوە داوا لە دانیشتووان بکا بۆلای باوەڕهێنان بە خودا. کەواتە وەرن بڵاوببنەوە بە ڕووی زەویدا، هەتا خودا ئەو پێغەمەرە ڕەوانە ئەکا عیسا موژدەی پێداوە کە بریتییە لە موحەمەد ﴿ﷺ﴾، دوایی بڵاوبوونەوە بە کێواندا و، ڕەهبەیان پەیدا کرد، بوون بە دوو بەشەوە: تاقمێکیان پەیوەست بوون بە ئایینی پاکەوە، تاقمێ تریان بێ باوەڕبوون، دوایی پێغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ وَ رَهْبَانِيَةُ ابْتَدَعُوهَا ما كَتَبْنا عَلَيْهِمْ ﴾. بە کورتی ڕەبەنە بە فەرمانی خودا پێویست نەکراوە، گاورەکان فەراهەمیان هێناوە لە کاتی چەوسانەوەیاندا لە میسر، بۆ باشترین لەو فەرموودەی خودایە شارەزابین تەماشای نامەی (الجریده النفسیه فی تأریخ الکنیسه) دانراوی یەکێکە لە ڕوهبانەکانی بکەن، کە لە ساڵی (١٨٨٣) ی زایینیدا چاپ کراوە، چاپی یەکەمی لە چاپخانەی ئەمیریەیە، لە بۆلاقی میسر، کە پێشەوای بەرێزی تەنتاوی لە تەفسیری (الجواهر) دا لە جزمی (٢٣) لاپەڕەی (١٠٣-١٠٤) بڵاوی کردووەتەوە لە

بارەی پەیدا بوونی ڕەهبانیيەتەوە کە بە تازەیی پەیدابووە، لە سەرەتا و بنچینەی ئایینندا نەبووە. خاوەنی تەفسیری (الجواهر) ئەفەرموێ: زۆر سەیرە مەسیحیيەکان خۆیان نەیان زانیوە ڕەهبانیيەت درووست کراوی زاناکانیان بوە، هەتا ئەو ساڵە و، کاتی بڵاوکردنەوەی ئەو نامەیە.

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ ﴾ ئەی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕتان هێناوە: ئێوە لە خودا بترسن و خۆتان بپارێزن لە بێ فەرمانی خودا، بەو جۆرەی بە دەم وتووتانە کار بکەن و گفتوگۆی خۆتان بە درۆ مەخەنەوە و، ئێوە باوەڕ بە موحەمەد بهێنن و، بە پەیڕەو و ڕانوومایی ئەو بڕۆن بە ڕێوە.

﴿ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ ﴾ خودا ئەبەخشێ بە ئێوە دوو بەش لە پاداشتی خۆی: پاداشتێ لەسەر باوەڕهێنانتان، پاداشتێ لەسەر ئەوەی کارتان کردووە بە گوێرەی ئەوەی باوەڕهێنانتان داوای کردووە.

﴿ وَ يَجْعَلْ لَكُمْ نُوراً يَمشُونَ بِهِ ﴾ وە خودا دروست ئەکا بۆ ئێوە لە ڕۆژی دوایيدا ڕووناکیيە بە هۆی ڕووناکیيەوە بڕۆن بەڕێوە بۆلای بەهەشت و، هەرکەسێ ئەو ڕووناکیيەی نەبێ ڕزگاری نابێ لە تاریکی بێباوەڕی و، ئەکەوێتە ناو ئازارێکی گرانترەوە.

﴿ وَ يَغْفِرْ لَكُمْ وَاللهُ غَفُورُ رَحِيمْ ﴾ وە خودا خۆش ئەبێ لە گوناهە پێشووەکانتان و، خودا لێخۆشبوونی زۆرە بۆ کەسێ پەشیمان ببێتەوە، میهرەبان و خاوەن بەزەییيە بۆ کەسێ بمرێ لەسەر پەشیمان بوونەوە.

﴿ لِئلا يَعْلَمُ أَهْلَ الْكِتابِ ألاّ يَقْدِرُونَ عَلى شَيْئٍ مِنْ فَضْلِ اللهِ ﴾ لەبەر ئەوەی خاوەن نامە بێ باوەڕەکان بزانن کە توانایان بەسەر هیچ شتێکا نیيە کە پێی بگەن لە پاداشتی خوا لە ڕۆژی دوايیدا، لەو دوو پاداشتەی باسکرا، بزانن هەرکەسێ باوەڕ بە موحەمەد نەیەرێ هیچ بەشێکی بۆ نیيە لە لێخۆشبوونی خودای مەزن.

﴿ وَأَنَّ الفَضْلَ بِيَدِ اللهِ يُؤْتِهِ مَنْ يَشاءُ وَ اللهُ ذَوا الْفَضْلِ العَظِيمْ ﴾ وە لەبەر ئەوەی بزانن بە ڕاستی هەموو پاداشتێ بە دەستی خودایە ئەیبەخشێ بە هەرکەسێ ئارەزۆی بکا و، خودا خاوەنی پاداشتی زۆر گەورەیە. ئەیبەخشێ بەو کەسانە باوەڕ بە موحەمەد ئەهێنن.

بۆ زانین (ووشەی "لا") لە ڕستەی ﴿ لِئلا يَعْلَمُ أَهْلَ الْكِتابِ ﴾ زیادەیە، تێ هەڵکێشراوە بۆ پتەوکردنی مانای ئەو ڕستەیە. لە هەندێ ڕیوایەتا نووسراوە ﴿ يَعْلَمُ ﴾.

**بە یاریدەی خودا کۆتایی پێ هات ( ٢٧ )ی جیمادی یەکەم ساڵی ( ١٤٢١ )ی کۆچی**
**بەرانبەر بە ( ٢٠٠٠/٨/٢٧ ) زایینی**

# پێڕست

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| به جورەی | بەو جۆرەی | ٤ | ١٣ |
| ئایا | ئایا دوای | ٦ | ٢ |
| ئێو | ئێوه | ٦ | ٢٣ |
| قەرئانه | قورئانه | ١١ | ١٧ |
| لەوەی | بەرلەوەی | ١١ | ٢٢ |
| به | بەو | ١٩ | ١٨ |
| نەبەن | نەیەرن | ٢٩ | ٤ |
| چاکه | چاکەی | ٢٩ | ٨ |
| سزای یان | سزایان | ٢٩ | ٩ |
| کەسەی | ئەو کەسه | ٣٣ | ٢ |
| بەشتێ | بەشێ | ٣٤ | ٨ |
| بۆ | بەو | ٣٧ | ٤ |
| جگه | جگەی | ٢٩ | ٢ |
| نامه | نامەی | ٤٥ | ١٩ |
| ئەنێرێ | ئەینێررێ | ٤٦ | ١٤ |
| ئێو | ئێوه | ٤٧ | ١١ |
| جێگه | جێگەی | ٥٤ | ٥ |
| خودا بکه | خودایەکه | ٥٥ | ١٧ |
| بامکیان | بانگیان | ٦٠ | ١٠ |
| بارچەبین | پارچه پارچه بین | ٦٠ | ١٠ |
| ئیو | ئێوه | ٦٨ | ٣ |
| ئاشەوایی | ئاشتەوایی | ١٧ | ٢٤ |
| لابد | لای بدا | ٧٩ | ٢ |
| مندالآنی | منالدانی | ٨٠ | ١٨ |
| ئاسمان و | ئاسمانەوە | ٨٤ | ١٧ |
| براء | برآء | ٨٨ | ٦ |
| دوای | داوای | ٩٦ | ١٢ |
| ئەکەوێ | دەرئەکەوێ | ٩٩ | ١٩ |
| خودایکی | خودایەکه | ٩٩ | ٢٣ |
| ئەو کەسانه | ئەو کەسانەی | ١٠٠ | ٤ |
| زلیم دور | ولێم دور | ١٠٤ | ٢٣ |
| بو | لەو | ١٠٥ | ١٢ |
| ئەگە | ئەگەر | ١٠٧ | ١ |
| به | بەو | ١١٣ | ١٨ |
| ئارەزوی | ئارەزوی خۆی | ١١٦ | ١٤ |
| بەرستەکانی | پەرستەکانی تر | ١١٦ | ٢٢ |
| له | لەو | ١١٨ | ٥ |
| کەمتر | کەمتر نەبێ | ١٢٥ | ٢٤ |
| ئینحیلام | ئیحتیلام | ١٢٦ | ١٠ |
| فهده م | فیهداهم | ١٣٥ | ٨ |

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| لابوردن | لێ بوردن | ١٣٧ | ٦ |
| ئیوه | ئێوه | ١٣٩ | ١ |
| جگه | جێگه | ١٥٨ | ٢ |
| خۆشنور | خۆشنود | ١٦٢ | ٢٣ |
| هەولێکی | هەواڵێکی | ١٦٧ | ١٣ |
| باوەڕدان | له باوەڕداران | ١٦٨ | ٢٤ |
| العربی | لعربی | ١٦٩ | ٣٠ |
| عربن | علي عربی | ١٦٩ | ٣١ |
| ئۆمن سه لمه | ئۆمو سەلمە | ١٧٠ | ٢٤ |
| سارمی | سامی | ١٧٤ | ٢٣ |
| خەنك تره | تەنك تره | ١٧٥ | ٣٠ |
| خوراپەیه | خراپەیه | ١٨١ | ٢٤ |
| هاتن | هاتنه | ١٨٥ | ٢٤ |
| لەباره | لەبارەی | ١٨٨ | ١٣ |
| لەناوچه | لەناو | ١٨٩ | ١١ |
| لەماناکه ترمان | له موسڵمانان کەسی ترمان | ١٩٣ | ٤ |
| هەرو | هەورو | ١٩٣ | ٢٨ |
| سەبریتی | سەربرینی | ١٩٤ | ٢ |
| فهرد | ففرّوا | ١٩٥ | |
| وەمنه جنۆکەم | وەمن جنووکه | ١٦٩ | ١٠ |
| سەشوڕی | سەرشۆڕی | ١٩٦ | ١٣ |
| یومهم | من یومهم | ١٩٦ | ٣٠ |
| توسیان | توشیان | ١٩٦ | ٣٢ |
| ئاگداری | ئاگاداری | ٢٠٣ | ٢٥ |
| ئەشێوه | ئەو شێوه | ٢٠٦ | ١٠ |
| سوقبن | سوقیف | ٢٠٨ | ١٤ |
| ترازری | ترازوی | ٢١٦ | ١٧ |
| هوی | أهوی | ٢١٤ | ١٨ |
| لەمەمەر | لەمەوبەر | ٢١٥ | ١٨ |
| لەو ئایەته | ئەو ئایەته | ٢١٩ | ٢١ |
| هاتی | هاتنی | ٢١٧ | ١٤ |
| هەرەو | هەر | ٢٢٢ | ١٤ |
| بێ گوێرەی | به گوێرەی | ٢٢٩ | ٧ |
| ئەکەتبایه | ئەو کەسانه | ٢٣٢ | ٢ |
| پێچەکانبات | پێچەکەکانیان | ٢٤١ | ٢ |
| مەبیەنی | مەیه | ٢٤١ | ٩ |
| وەباوەڕانی | وەباوەڕدارانی | ٢٤٣ | ١٤ |
| ئەکەین | ئەکەن | ٢٤٦ | ١١ |
| فظلم | فظلتم | ٢٤٦ | ١٤ |
| ئه | ئەو | ٢٤٦ | ٢٥ |

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| پێویستە | دروستە | ٢٤٨ | ٢٧ |
| هەیە | نیە | ٢٤٨ | ٢٨ |
| کەری‌یانە | کەریانە | ٢٤٩ | ٢ |
| ئێو | ئێوەی | ٢٥١ | ٩ |
| ئێو | ئێوی | ٢٥١ | ١٠ |
| ئێو | ئێوە | ٢٥١ | ١٣ |
| ---- | ---- | ٢٦٤ | ٢ |

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| ئەسوریچتەوە | ئەسورێتەوە | ٢٥٤ | ١٣ |
| بەرز | بەرزی | ٢٥٥ | ٢٧ |
| ببەخشی و | ببەخشی | ٢٥٦ | ٩ |
| شاکرا | ئاشکرا | ٢٥٨ | ٣ |
| ئازاری‌یان | ئازاریان | ٢٥٩ | ٧ |
| زۆر | خوا زۆر | ٢٥٩ | ٧ |
| | | | |